


# کازیوەی سپیی شیعر

کۆبەرهەم

1980 تا 2009

بەرگی یەکەم

چاپی سێیەم

کەریم دەشتی

# کازێوەی سپیی شیعر

## کۆبەرهەم

بەرگی یەکەم

1980 تا 2009

چاپی سێیەم

شیعر

* ناوی کتێب :کازیوەی سپیی شیعر- کۆبەرهەم - شیعر -1980 2009
* ناوی شاعیر : کەریم دەشتی - -1955 - هەولێر
* ژمارەی سپاردن: 944 ساڵی 2012 هەولێر
* چاپی یەکەم - دەزگای ئاراس 2004 هەولێر
* چاپی دووەم - مەڵبەندی گشتی یەکیەتی نووسەرانی کورد 2012 هەولێر
* ئیمێل karimdashti59@yahoo.com
* ژمارەی مۆبایل 07504512785
* وێنە شاعیر : هێلکاری هونەرمەند محمد اسماعیل
* ئەو شیعرانەی نەخراونەتە ناو ئەم کۆبەرهەمە، پەیوەندی بە ئاستی شیعرەکانەوە هەیەو بەس.

## پێشەکی چاپی دووەم

یەکێ لە گرفتە دێرینەکانی ئەشقی شاعیر، ئەوەیە هەرگیز دەستی لە شیعرەکانی خۆی بەرنابێ، بۆیە هەمیشەو بەردەوام شیعرەکانی بۆ ئەو، وەکو کێڵگەیەکی لێدێ،بە درێژایی ئەزمونی خۆی کاری تیا بکات و پاکی کاتەوە،دوکەڵی ناو فەزاکانی برەوێنێتەوە،بۆیە منیش هەر لەیەکەم چاپی خاك و هەڵۆ وە تا وەکو ئێستەیشی لەگەڵدا بێ،هەمیشە وەکو کەسێ گەوهەرێکی لەبن دارو پەردوی ئەم کێڵگەیەدا ون کردبێ،بەناویا دەسوورێمەو کاری لەسەر دەکەم. ئەو چەند بەرگەی لە بەردەستانایە،ژیان و ئەزمونی شیعری منە، گریان و پێکەنینی منە، هەڵوێست و ئەوینیمنە، بۆ هەموو ئەوانەی کە لەمەودوا دەیانەوێ نیش لەمەڕ شیعرەکانی من بکەن، پێم باشە کە ئەم چەند بەرگە بکەن بە سەرچاوەی ڕاستەقینەی بەرهەمە شیعریەکانم، پشت بەو چەند بەرگە ببەستن، کە من لە ئێستادا بە سەرەتاو دواهەمین قۆناغی دیدگاو شیعرییەتی خۆمیان دەزانم.

کەریم دەشتی 2012

## پێشەکی چاپی سێیەم

شاعیر بەردەوام پێویستی بە ساودانەوەی هزرو نوێکردنەوەی ستایل و خوێندنەوەی خۆی هەیە، تا پەی بەوە ببات، کە ئەزموونی شیعر، ئەزموونی ڕسکان و شوناسی شاعیرە، ئەگینا لە ناو ئایدیای شیعردا پەرتەوازە دەبێ. خۆ ئەگەر شاعیر وا بزانێ ئەوەی لە ڕابردوودا نووسیویەتی، دەبێ وەك قۆناغێکی شیعریی پیرۆز بپارێزرێ، ئەوە بەو مانایە دێت، کە ڕێز لە هەڵڕژانی هزری خۆی ناگرێت، من باوەڕم بەمجۆرە بیرکردنەوەیە هەیە، چونکە ڕابردوو و ئێستا لە نووسینی شیعردا، ئاوێنەی ئایندەی منە، بۆیە بێ پەروا کار لە ناو هەمان ئەو پیرۆزییە دەکەم، وەك چۆن بەردەوام ئەم کارەم کردووە، شیعر توخمێکی سیحرامێزە، ئەگەر شاعیر ئاگای لە خۆی نەبێت ، هەمان ئەو سیحرە لە کارتەی دەدات.

کەریم دەشتی 2018

## شەوان شیعر هێلانەیە

بێ تۆ نەخشەی ئەم جیهانە
بێ ڕەنگە و هەم بێ دەریایە
بێ تۆ هەموو وەرزی ساڵان
پاییزێکی کشوماتە، بێ هەرایە
بێ تۆ ئازیز ژیان ڕەشە و ساڵ نەهاتە
بێ تۆ ژیان دورگەیەکی پڕ لە خەم و کارەساتە
2
هەموو شەوێ دەرگای چاوم
لە ئەستێرەی فرمێسکەکان ئەکەمەوە
هەموو شەوێ بەقەد ئاوی ڕووبارەکان
دڵی ڕەنجام بە پشکۆی شیعری غەریبێك ئەدەمەوە
شیعر گوڵە، شیعر ئاوە، شیعر پاکە
شیعر هێلانەی تەمەنی
ڕێبوارێکی سەرهەڵگری دوای خاکە
3
شەو درێژە من و خێڵی ڕووبارەکان
ئیتر ئەو ناوە جێ دێڵین
یا ژیان کۆتایی دێت و
یا چەپکێ خونچەی خۆر دێنین

4

پەردەی شەرمی پەنجەرەکەتم لێ لادە
لە درەختی چاوانی تۆ
ڕەنگ پەڕیوم هێلانەیەکی خۆم ئەوێ
گشت ئێواران، چەند دووربم بۆ لات بێمەوە
شەوان لە باوەشی نەرمی خەمبەری تۆ
بۆ دوا هەواری چاوانت کۆچ بکەم و قەت نێمەوە

## له لاپەڕەی عیشق و خەما

1

وتیان برین
چەند هەنگاوی تەمەن
بنێتە ناو چاوی ڕەشی مەرگ
بەڵام هەر عاشقی نیگای داو و دەرمان و تیمارە
وتیان هەور چەند سیمای تەڵخی بنوێنێ
بەڵام گیانە
زەوی تینوو هەر عاشقی دڵۆپە ئاوی بارانە

2

عاشق ئەڵێ ڕێگە بۆ دورگەی لێوی ئەو
بەقەد تەمەن دوور و درێژ بێ هەر ئەیبڕم
ئەدگاری چاو چەند بڵند بێ
ئەبێ بیکەم بەهەوارگە و ئێشکی غەریبی لێ بگرم
عاشق هەر چەند لەناو کڵپەی عەشقی خۆیا
بمرێت و هەم بتوێتەوە
سەد ئەوەندە و هەزارباره
تێهەڵئەچێ و ئەتوێتەوە

3

گیانه شیرین هەموو شەوێ

کە ئەستێرە چاوبازەکان

لە باوەشی ئاسمانێکی پان وبەرین ڕالەکشێن

گەڵای دار و درەختەکان

لە جیهانێکی بێ دەنگی، بەسەر یەکا دائەخشێن

با ئەنوێت و ڕووبار لە شەپۆڵ کپ ئەبێ و دائەکەوێ

بەڵام گیانە نازەنینم، دڵی هەڵچووم وەکو ئەوان

بێ مەرگی ناو باوەشی تۆ

قەت چاو لێك نانێ و ناخەوێ

بەپولەیە و بەسەر هەستی لێکدانەوەما ئەسوڕێ و

قەت ناسرەوێ

4

ئەی ئەو خەمەی لەگەڵ بووتما

ڕەگت لەناو دڵ و گیانی من ڕواوە

تۆ خوێنیت و لە شادەماری من ئەجمێی

تۆ گوڵیت و لەناو دڵی مندا ئەڕوێی

لە هەر کاتێ خەم لێم دوور بێ

من ئەو کاتە زامار ئەبم

لە هەر کاتێ خەم لێم ون بێ

من ئەو کاتە خەمبار ئەبم

خەم بەهارە و خەم هەتاوە

خەمە و لەناو دڵی منا

سەدان هەزار دەستگیرانە و لێشم ونە

خەمە و لەناو کێڵگەی بیر و تاسەی تینووم

ڕووبارێکی بەبێ بنە

## پشوودان

ئاگاداربە کۆترەکانی ئەم هەوارە
نووستوون بێداریان مەکەوە
هەر کۆترێ کۆچەری ڕێیەکی سەختە
هەر ڕێگایێ
بۆ کێڵگەیەکی پڕ چەقۆی بەفربەختە
نووستوون بێداریان مەکەوە
ئەم کۆترانە خەمی منن
خەمی چاوی یارەکەمن
ئەم کۆترانە خەمی ئێوە و شارەکەمن
لێیان گەڕێ تا بە ڕەوە سەر هەڵئەگرین
بۆ چاوی تیشکێ لە خۆری پێکەنینمان
سەدان دەریاچەی خەم ئەبڕین
یا ئەم خەمە لە گۆڕ ئەنێین
یاخود هەتا مردن ئەفڕین!

## بەرزیی

من لە ناخی چاوەکانتا
ڕەشماڵی گیانم هەڵداوە
هێشتا غەریبی چاووتم
ڕەگ و ڕیشەی برینم
تێکەڵ بەخاکی تۆ بووە
هێشتا من شەیدای گەیشتن
بەناونیشان و ناووتم
قەد و باڵای شاخەکانت
بەهێزترن لەوەی کەوا
دەنگی ناسازی ڕەشەبا بیهەژێنێ
پەلکە مێوە سەوزەکانت
گەورەترن لەوەی کەوا
پاییزی کاڵی ئەم سەدە
تفت و تاڵە بیوەرێنێ

## سۆراغ

بمناسەوە، بەدڵ، بەگیان، بەڕەنگ و بۆ
ئەم ئەستێرانە ئەبینی؟
ماچی من و گەردنی تۆن
ئەم ڕووبارانە ئەبینی؟
هەناسەی گۆرانی من و شەپۆلەکانیشی
دڵی هەڵپەڕکێی تۆن
ئەم چۆلەکانە ئەبینی؟
هەموو نامەی پەنجەی منن
بەدوای نیگات هەڵفڕاون
ئەم هەموو کانییە وشکانەی
بنار چیا بەدی ئەکەی؟
هەمووی ئاهی سەردی منن
لە پاش کۆچی کۆتایی تۆ سەربڕاون

## وەرزێکی گران

ئای ئەم گۆڕە بەرد و دارە
چەند هێمن و چۆڵ و هۆڵە
ئای چەند کۆرپەی سەربڕاوی وا بەکۆڵە
سەیرکەن چۆن
زریان چاوی برینی ڕەز ئەکاتەوە
سەیر کەن چۆن لێواری داس
دڵی گوڵە گەنمەکانی ئەم هەوارە ئەداتەوە
ئای چەند چۆڵە
کێیە بتوانێ غەریبی ئەم هەوارە
وەرزێ بۆ دوا بباتەوە

## دڵێکی سووتاو

جاران گیانە کە من هۆنراوەم ئەنووسی و
چاوانی تۆش ئەیخوێندەوە
جاران گیانە کە من شمشاڵی کۆچێکی
شەو بە کێوانم لێ ئەدا و
تۆش گوێی ئارامت ڕائەگرت
دووری ڕێگام لە یاد ئەکرد
خەمی هەموو ئەم جیهانەم
لە باوەشی تۆدا ئەمرد
ئێستاش خێڵی چاوانی تۆ
لەناو لەپی مێرگی دەستم
کۆچیان کرد و جێیان هێشتم
من ئێستاکە
هەر دەفتەری تەنهایی خۆم ئەخوێنمەوە
ئای چەند تەنیا و خەم هەڵگرم
ئاخر لەگەڵ کاروانی کۆچی تۆ نەبێ
گیانە بۆ کوێ سەر هەڵگرم؟

## خەرابات

تۆ تریفەی گوڵ و مانگی من بووی ئازیز
هۆنراوەم لەبەرتا ئەلاواوە و
چاوی وشەکانی ئەڕشت
تۆ چەمی خووڕە و ئارام بووی
من بەرکۆڵەی خەمەکانم تیا لێك ئەنا و
شەوانی ڕەشم تیا ئەکوشت
کوا ئەم ڕێگە و ئەم ڕێبوارە
کوانێ ئەو چین و ماچینە؟
هەمووی ئێستا گوندێکی گیان هەڵقڕچاوە
درەختێکی خاپوور و دڵ پڕ برینە

پەرژینە ئاخ

ئێ بەم شەوە تۆ چیت ئەوێ؟
نە من مەرگ و نە تۆ ژینی
ئەوەی هەمانە و نیمانە
من سەر تەڵی خەمەکان و
تۆش لەشێکی پڕ برینی
ئەوەی هەمانە و نیمانە
دوو چاوی عەشقی هەتاوە
دڵیش هەر وەکو گۆمی وان
پڕ گریانە
کەچی هەموو دەوروبەرمان
تاسە باران و زریانە

## پەڕیوە

شەوان کاتێ
لەگەڵ کزەی هەناسەما ئێشك ئەگرم
پەنجەرەی ژوور ئەکەمەوە
لەو کاتەدا من ئەمبینی
وەکو بەفری
لوتکەیەکی خۆر هەڵمژیو ئەتوایەوە
وەکو پشکۆی ئاگردانی هەژارەکان
هێندێ جار گەش هەڵئەگەڕا
هێندێ جاریش ئەکوژایەوە
من ئەمبینی وەك ماندووێکی خۆر نەدیو
هەموو لەشی پڕ برین بوو
لە ڕێگەی هیچ سەفەرێکا
دەرگەی لە ڕوو نەکرایەوە

## شاعیر

کێ هەیە وەکو شاعیرێ
بە دوای تەمەنی داڕژاو
شەوان چرای وشەی نامۆ داگیرسێنێ
ئەی کێ هەیە لەم جیهانە
وەکو شاعیر هەڵکڕووزێ
تا بزانێ بیرکردنەوە چەند گرانە؟

## لەگەڵ خۆمدا

بەخۆمم وت:
ئەی شێتی وێڵ، بەسیە ئیتر
هەوری خەمی هۆنراوەی سوور
لە گەردنت مەئاڵێنە
ئەوەی نووسیت بارانی سەر پاوانێك بوو
بۆ پاساری ڕەوسەی دڵت
درەختیلەی خەمی هێنا
بەسیە ئیتر خۆت مەخەرە
ژێر ئازاری هەموو داوێ
وتی ئاخر
چەند بیر لەو دارستانەی شاخ ئەکەمەوە
ئەگەر بێ و واز لە ڕەوشەنی ڕەگ بهێنێ
وەکو لەستێرە دائەڕژێ و
تۆوی مردنی خۆی ئەچێنێ

## وێرانیی

دارێ لە ڕەگی خۆی تۆرا
بۆ ناو کێوەکانی ئەودیو سنوورەوە
سەری هەڵگرت
دەزووی غوربەتی
لەم سەر زەمینەی ئاڵاندە دڵی و
گلۆرەی چەمی زگماکی ناخی خۆی هەڵکردەوە
دوێنێش کە بینیم
لەژێر بێزاری و ڕەشەبای زریان
بۆ خاکی دایکی بەچۆکی ئەدا و
ئەکڕووزایەوە
لەژێر شاباڵی بێ سروەی گریان

## شوێنەوار

بۆ وا کپە، وا شێواوە ئەم ڕێ و بانە؟
بۆ وا لە خەم داگیراوە
ئاوا ماندوو و سەرگەردانە
دوای تۆ هەموو شوێنێك ئاوا کۆڵەوارە
دوای تۆ چاوی مانگی زەرد و ئەستێرەکان
بێ خەرمانە و ڕێگاکانیش بێ ڕێبوارە
کێیە دوای تۆ چرای ئارامی هەڵبکات
کێیە لە پاش ئاوابوونی خۆری بازووت
ببێت بەگۆنای دیوارێك
نێلێ ڕەشەبا هەڵبکات؟
ونبوونی تۆ
چەند پڕ خەم و چەند دژوارە
ئای چەند کپە لە دوای چاوت
ئەم ڕێ و بانە، ئەم هەوارە

## چڵەپۆپە

جریوەت بێ، تەشی دەمت
خۆری لەشی ماندوو بوونم ئەکا بەداو
هەگبەی لەو گوندە دوورەی من
پڕ لە نامەی سەوز ئەکات
قژی کیژۆڵەی کەناران ئەکاتەوە
بۆ تۆقەی نەرمی خۆرەتاو
دڵت بکە بەنێچیری خورپەی گەرم
هەتا گەرووت گوڵە عەشقی کێوەکانی
لەسەر شین بێ
دەنگت مایەی گریانی شەوانی وشەم ئەهۆنتەوە
بە هەوێردەی سرکی لیسی سینەت بڵێ
گلێنەی چاوم چەك ئەکەم
چی تر ڕاوکەری تەماشای
ئاوێنەی حەزی ڕابردووی خۆی بدوێنێ
ئەگەر شەوان لە هۆنراوەم بپەڕتەوە
کاتێك بازنەکۆتی مەچەکت
لەنگەر لە گەردنم بگرن
ئیتر منیش چیرۆکی درێژی شەوانم
لە پرسەدا ئەتۆرێنم
شیرازەی نێو ئەشکەوتەبانی ئەو دڵە و
هەزاران خەمی بێ کەسیم ئەپچڕێنم
کەزیت ئەکەمە دیوەخان
شەوان هۆنراوەی تەنیایی
ئەو کوێستانەی تیا ئەخوێنم
کە ئاسۆش سوور سوور هەڵگەڕا

له گەردنی خۆم و دەنووکی هۆنراوەم دەئاڵێنم
نامەوێ دڵی شکاوت
ژەنگی غەریبی هەڵێنێ
تۆ نازانیت ئەی نازەنین شووشەی چاوت
ژانی چ هۆنراوەیەکی من ئەشکێنێ؟
ئەشق ئەوەندە گەورەیە
ژان و مەرگ و باران و خۆر ئەگرێتە خۆ
تۆش چاوگەی هەموو عەشقێکی
خوداش کاتێ کە تەنیایە
لە هەراسانی و ماتەمی ئەتوێتەوە
خۆی لە خەنەی ماچی فریشتەیێ ئەگرێ
گیان لە پەلی هەوەس ئەخات
شەدەو هەوری
ئاشقێکی هەژار ئەدزێ و لەسەر ئەکات
بەردەئەستێی چاوەڕوانی لێك ئەخشێنێ
کڵپە چەرخی هۆنراوەیەکی شاعیرێ پێئەکات و
ورد ورد خۆی دائەگیرسێنێ
بە کلکەشاخی تەمەن و سەرگەردانی هەڵئەگەڕێ
ژانی دونیا ئەسووتێنێ

## چرپەیەك

بۆ نون

ئەی مانگی دوور بریا هەر ئەو کیژۆڵە بای
نالی شیعری بۆ ئەنووسی
بێکەس لە شەوانی خەم و ژانی زەوی
بۆ تاکە ژەمێکی مەستی
ئەیکردی بە هاودەمی خۆی
ئەی کچی دوور بریا تۆش ئەو کچۆڵە بای
منی بەفر وەکو لوتکە ئەمپەرستی
بریا هەردوو باڵی خۆم بڕیبا
نەوەك بەدوای سەرابی چاوت فڕیبا

## ئەوانەی لە ناخەوەن

ئای ئەگەر بۆ تاکە جارێ کە بتوانم
چاوەڕوانیم وەکو دڵۆپێ خۆرەتاو داگیرسێنم
چەمی هەڵچووی ناو ئەو دڵە و
تاسەی تەمەن بنووسمەوە
ئای ئەگەر بۆ تاکە جارێ بمتوانیایە
خەمی سینەم
وەکو چەپکێ فەریکی ئاسۆی ئێواران بگرتایە
وردە وردە ڕاوی مامزی تەنهایی
ناو دوورگەی لەشی شەکەتی خۆم کردبایە
ئەوسا ئەمزانی
ڕوومەتی بیرەوەریم بۆ ئەسووتێ و
داری تەمەن چۆن پیر ئەبێ
بەڵام هەرچی چاوەڕوانی و خەم و عەشقە
وەك سێبەر و شنەبا وان
کەی دەستی کورتی شاعیرێ
لە پرچی کێوی هەوراز و
لوتکەی هەواریان گیر ئەبێ؟

## ساتەکانی ئەوین

دوێنێ تەمەنی درێژی ساڵەکانم
خۆری ئاوابوونیان ئەکوشت
لە بێشەڵانی باوەشما
وەکو چەپکێ داسی تێنوو
خوێنی چەتەی ماندووبوونی خۆیان ئەڕشت
ساتەکان ئەبوونە سەدە
حەسانەوەی ڕێگەی دووری خۆیان ئەمژت
ئەو دەمانەش بەدیار ڕوومەتی سووتاوی
گەرمە تیشکی هاوینانی ڕەنجبەریتا
تۆڕی هەموو بەندەرەکان ئەنێمەوە
ساڵم بۆ ناگیرێتەوە
کات وەکو بەفرێکی ماندوو
بۆنی برینی تۆ ئەکا
بەناو چاوما ڕائەبوورێ و ئەتوێتەوە.

# هەڵۆ

وەك ئاگرێ، منداڵە بێ چەترەكانی
ژێر هەوری تێوارە بەفرێ بیكەنەوە
چنگێ عەشق و خۆشەویستیت بۆ جێهێشتین
كەمەربەندی كێلە مێژووی خۆرەتاوت بۆ جێهێشتین
ئەگەر تاكە مەلێك بووایت
درەختەكان لە گۆنای گەڵا ئەتۆران
ئاڵای پاییزیان هەڵئەكرد
ئەگەر تەنها شەپۆلێك بوایت
ڕووبارەكان شەختەی ژانیان لەبەر ئەكرد
بەڵام چی بكەم خووڕە چەمێكی
سەرپشتی تەمەنی ئەم كوێستانانەی
مینای چاوی لوتكەكانت بێ بینایی
گوڵی سووری كارێزەیان ئەدرێ لە یەخەی تەنیایی
ڕۆژێ نووسیت ڕۆڵە هێمن كە گەورە بوویت
چرا لە شەوی هەژاران داگیرسێنە
پەنجەرەی دڵ لە ڕەشەبا نەكەیتەوە
مەنوو ڕۆڵە خەو كوختەی چاو كلیل ئەدات
لەنگەری بوون لە چاپی مەرگ و ژان ئەدات
مەنوو ڕۆڵەچونكە نووستن دڕندەیە
ئەگەر شەو خۆری بەدوا نێ
لوتكە تۆقەی ئەستێرەكان
لە پرچی سپی خۆی نەدا

## شەوسوار

تەمەن وەکو ئاوی جۆگە و ڕووبارەکان
ئەڕوات و ناگەڕێتەوە
وەرە هەتا چاومان تەرمی ڕوانینیان هەڵگرتووە
لەناو بۆتەی مانگە شەوانی سەرشێتا بتوێنینەوە
ئاگادار نیت من چۆن چاوم
وەك دوو هەڵۆی دڵ بریندار
بەشوێن دوورگەی لەشی تۆدا ئەخولێتەوە
ئەوەندەی تۆ دوور ئەبینی و
هەوری ئارامی شەوانم ئەبارێنی
ئەوەندە تۆ لەناو مێرگی غەریبیما
چرای کۆچی خۆت پێ ئەکەیت
بێدەنگی دائەگیرسێنی
ئەوەندە خەم لە دڵمایە
ئەوەندەی تۆ ڕووبارەکان لەدوێنی و
وردە حەز و چرای شەوی نازەکانت
وەك نەرمە بای ئێوارانی بنارەکان
ئەڕوا و لەگەڵ خۆیا ئەمبات
ئەوەندە من ئەسووتێم و
بسکی ڕەشت ئەمگرێت و
لە سێدارەی شەوم ئەدات
تۆ نازانیت چۆن ئەکوژرێم؟
دوێنێ کاتێ ئاسۆ بوخچەی ئێوارانی ئەکردەوە
تۆش دڵمت وەك تەڵە کرۆسکێ
لە دارستانی لەشمدا بەردایەوە
وەکو ڕەوە چۆلەکەیێ

ئاگری تاسە و فڕینت بەردایە ڕەزی تەمەنم
وردە ئێشی شوێنەوارت لەناو دڵی مندا باراند
دوا لاپەڕەی جێ هێشتنت هەڵدایەوە
ئەی تۆ ڕووبارت خۆش ناوێت
ئەی تۆ لەناو کێڵگەوەردی لەپی منا
چەندەها جار چاوەکانی خۆت ئەچاند و
خۆشەویستیت ئەدووریەوە؟
گیانە لەناو ڕەوگەی ڕەشی پرچی تۆدا
من ئەستێرەی پەنجەکانم ون کردووە
منیش وەکو پاسارێ لە هێلانەی لێوی تۆدا
هەزار بەچکە ماچی تینووم جێهێشتووە
ئەوێستاکە دووریت بۆتە چەند شەپۆلێ
لەناو مانگی کپ هەڵگەڕای دڵی منا
بێ دەریا ئەسووڕێتەوە
منیش بوومەتە ڕووبار و
بێ هەوار ڕێگە ئەبڕم و بێ کەنار سەر ئەنێمەوە
هەموو ئێوارە پاییزان
کە خوێن لە لەشم ئەتۆرێ
دڵیش لە سیمای تەنیایی
سەرم لەبیر، چاوانیشم لە بینایی
پێ ئەگرم و ئاسۆی یادم
لە ناو گەرمە عەشقی تۆدا ئەهۆنمەوە
خەم درندەی برسی و قاتی بەرلەدایە پێدەشتەکان
بێدەنگی چەم خەرەندێك بوو
کلی مەرگی ئەکردە چاو
منیش هەموو هەست و نەستم بوو بە فرمێسك

ڕژامە ناو کەلێنی ماچی تۆراو و
سایەقەی یادی بەجێماو
ئای کە ئازیز گەورەتریت لەوەی کەوا
پشکۆی سووری بیرەوەریت
وەك ئاگردانێکی جێماو
هەڵپوکێ و سەر بنێتەوە
گیانە هەموو ئێوارەیەك
کە دەستی یاد دێت و وەکو شەوسوارێ
سەرم لەگەڵ خۆیا ئەبات
دووریت ئەبێتە هۆنراوە و
بەچەمی شانی غوربەتا دێتە خوارێ

## ئاسۆ باران

1

شەو لە دەرگای دڵی خۆم دا
ڕووبارەکان هەور و خاکیان ڕائەماڵی
ڕەزەکان تەرمی بارانیان هەڵگرتبوو
شنەی کەژ و کێوەکانیش
شەو ڕەهێڵەی ئەستێرە بوون
بەسەر چۆڵی کیشوەری ناو لەشی منا
ئەهاتن و ئاوا ئەبوون
تۆش کڵافەی نامە و خەمی هەوارێ بووی
پۆستەی خوێنت لە دەماری نەخشەی منا
ئەوەستاند و تاڵان ئەکرد
تۆش کەپرێکی کوێستانی ناو دڵی من بووی
خەمی دونیا لەناو لەپی تۆدا ئەمرد

2

ئەمشەو چرای چاوەکانم گرتە دەست و
لە دەریاچەی لێکدانەوەی بێ سنوورم
شەپۆلی سیمای تۆراوی تۆم دۆزیەوە
بەفری چاوی تۆی لە کێوی دڵ ئەکرد و
بۆ دیدەنیت ئەتوایەوە
چیتر چاوت با فرمێسکی لێ نەنیشێ
جیهان لە سێدارەی کپی
شەوانی تەم و تاریکی ڕالەپسکا
بەڵام ئەویان پارچە ئاسۆیەکی سوور بوو
بەسەر مێرگی بیرەوەریت سەمای ئەکرد، ئەخولایەوە

3

شەو لە دەرگای دڵی خۆم دا

هەور عاشقی هەوراز و چەمەکانی بادینانە

ئاسمانی دووری ڕائەخست

بۆ نامەیێ شنەی ماندوو ئەنوشتاوە

کێ ئەزانێ من جیهانم لەناو دڵم حەشارداوە

4

تۆ چیت ئەوێ بەم شەوە تووش و نەهاتە؟

لەم گۆڕەپانە ئەگەڕێم هەوارێکە

هاوینان دڵم سێبەری تیا ڕاو ئەکرد

بۆ چەتری خاك و سەری من

خەونی سەوزی تیا چەپك ئەکرد

گەنجینەی تیا ئەدۆزیەوە

بۆ هەژارو لاتەکانی ئەم وڵاتە

+ ئێ چیت ئەوێ هەرچی مابوو

لەگەڵ هەورەکان ئاوابوو

## خاك

ئای ئەم خاکە چەند دڵگیرە
چۆن مرۆڤی فێرە عەشقی خۆر کردووە
ئای ئەم خاکە چەند تێکەڵی
چەمی سووری خوێنم بووە
بۆیە دڵم وا گەورەیە و
سەرانسەری ئەم جیهانەی هەڵگرتووە

## شیوەن

چاوەکانت دوو کۆتری خەمڕەوێن بوون
بەڵام خەمیشیان زۆر پێ بوو
پێم نەوتی
خۆشەویستی دەریایەکی گەلێ قووڵە
پێم نەوتی هەیە ئەستێرەیە و جوانە
بەڵام ئەڕژێ و لەبار ئەچێ
پێم نەوتی عاشق هەیە ئەسووتێت و
هەشە عەشقی لە یاد ئەچێ؟

## زوێربوون

لە دەرگات دا
نەتئەزانی منیش وەك تۆ بریندارم
بۆ یاخی بوویت؟
ڕاستە کاتێ مناڵی ڕووت یاخی ئەبێ
پێستەی دڵی خۆی جێ دێڵێ
جەژنی لە دایکبوونی خۆی
بە مۆمی نینۆك ئەکێڵێ
بەڵام خۆ منیش ناچارم
مۆمێك نییە لە ژووری سەرما
گوڵ بێت و دایگیرسێنم
منیش پەنجەرەیەك نییە بیکەمەوە
هەتا دونیای تیا ببینم

## خەونی بەهاران

1

عەشق:

چوار پەپوولە

بۆ مژینی شیلەی گوڵێ کەوتنە جووڵە

ئەوەندە دەمیان لە دەمی ئەو گوڵە نا

پاش ئەوەی هەر پەپوولەیێ

بە باڵکەوت و دەمی سڕی

گوڵیش بوو بە پەپوولەیێ

لە شەققەی باڵی دا فڕی

2

بەراوردێ:

لە تەك شاخێكی بچووكا

كانیێ چاوی هەڵێنا

كچێ هەروەك پەری خوایی

قژی زەردی داڵەهێنا

كچ ئەڵێ ئای ئەم كانییە

چەند بێگەرد و ڕوون و جوانە

ئاخۆ ئەبێ ئەم كانییە جوانتر بێ

یا ئەم كچە خانەدانە؟

3

دووری:

ئەی کچی دوور

هەر چەند ئەشزانم ئەستێرە

هەوارێکە وەکو دار و بەرد و زەوی

وەکو خاك و خۆڵی ئێرە

بەڵام دووری شەوگارێکی پڕ لە ژانە

بەڵام دووری ئاخ بۆ دووری

کە چاوگەی خەمی ژیانە

## حەزێك

گەلێ ئەستێرە ئێواران
حەز ئەکەن لە پەنجەرەی من
هەناسەی شەو بخۆنەوە
گەلێ چۆلەکەی ماندوو بوو
ئەیانەوێ خەمی دووری
لەنێو کانی هۆنراوەی من بشۆنەوە
چەمیش کاتێ کە بارانی لێ نابارێ
لەناو چاوم دائەکەوێ
گیانەکەم زۆر کچیش هەیە
گەر هۆنراوەم کەزی هەستیان دانەهێنێ
قەت قەت خەویان لێ ناکەوێ
بەڵام ئازیز ئەو دڵەی من پاساری ناو
دارستانی شاخ و داخە
لە جۆڵانەی غەریبیدا چۆن ئەسرەوێ؟
تۆش کە کچی دارستان و شاخ و داخی
گەر ئەستێرەی هەموو دونیام لێ ببارێ
من هەر نامە بۆ نیگای سپیت ئەنێرم
لە فەرهەنگی نەخشەی جوانی
من بەتەنها نەخشەی چاوت هەڵئەبژێرم

## شەونزا

سەدان وەرزە کچی خەمگین
من ئەمەوێ تێکەڵ بەدەریای هەستت بم
وەکو هاژەی ڕووبارەکان
هەڵکشێم و تێکەڵ بە چەمی مەستت بم
من ئەمەوێ هەموو شەوێ
بێم و لەبەر تابلۆی چاووت
دڵی ماندووم
وەك چۆلەکەی شەوی پڕ خەم دابکەوێ
خەمەکانم لە نێو کاسەی چاوانی تۆ
بتوێتەوە و گیان بسرەوێ
تۆش دووریت و دووریت گڕێکە گشت شەوێ
خەرمانەی ئارامی تەمەن ئەسووتێنێ
دووریت شەپۆلی دەریایە
شەوان چراوگەی هەناسەی بیرەوەریم
پێئەکات و ئەخنکێنێ
وەرە گیانە بێ هاودەم و بێ لانەمە
تەنها منم شەوان پشکۆی خەمەکانم
چۆلە چرای تاقانەمە

چاوەکانی بڕیبووە ئەو درەختانەی
تامی بارانیان کردبوو
قاچی لە زەمین دووری بوو و تاوی دەدا
بروسکی ژێر سمی ئەسپی
وەکو ئاوێنەی ئەبەدی
ڕووناهی بە ئاسمان دەدا
گیانی شەڵالی ئارەقە و لەززەت بوو بوو
زریانی لە خۆی لوول دەدا
چاوەکانی وەکو دوو پشکۆی
تووڕەی چاخە بەردینەکان
دڕیان بەدارستان دەدا
تاشەبەرد و کەڤری دەکردە مرۆڤ و
بە دۆڵی مێژووی وەردەکرد
سیستەمی ئەو سروشتانەی
لە بنەڕەتەوە تێك دەدا

## ڕێزمانی گرین

دەروونم تەڕ نەبوو، شەوم دانەمرکا
پۆلێ مەل تەزی بوون
هاتبوون پەنجەرەم لە وەرزێ دابگرن
کرۆسکی مەرجان و بادەمی بەفر بێ
بارانم بۆ ڕاوکەن
هاتبوون بیابانی بەرچاوم
لە کاژی غوربەتی ئاو لوولدەن
چاوە چوکەکانیان
ئەستێرە و گەوهەریان دەباراند
ئامرازی پەیوەندی
من و ئەو دونیایەم لێ قووت دەن
چاوگی ناو ڕستەی دڵی منیان بینی
لە بیریان کرد مەلن
دوو باڵیان لە پەڕی کەتانە
هەمیشە مەخمەڵی ئاسمانیان میوانە
هاوەڵی سروشتی خوێنی خۆیان تۆراند
لە کولبەی بۆن پەڕ و کتێبما هەڵکورمان
زەمزەمەی کێوێکیان لە دەنووکدا ئاڵاند
ئاگر و برین بوو
لاولاوەی چریکە و خەمێکیان
لە ژووری منا چاند
ڕێزمانی گرین بوو

له بیریان کرد مه‌لن له زمان نازانن
له مه‌رگی سێبه‌ندی ناو وشه تێناگه‌ن
من بوومه ئه‌وان و ئه‌وانیش بوون به من
تۆ وه‌ره ناو ژووری کاگڵی ئه‌مدیوه
چۆن بۆته کوانوی جریوه

## مەرگی چوارگۆشەیی

1

لەشی خۆمم هەڵگرتووە
پەنجەرەم لە وشەی گازی داخستووە
دەزانم کاتێ ئازارێ
لە بنچکی زامی سینەم هەڵدەتووتێ
هەر وشەیێ ببێتە هودهودی عیشقم
لەو ئاسمانەدا دەسووتێ
تەرمی خۆشەویستی تۆشم
لەناو خوێنم شاردۆتەوە
دەزانم کاتێ لەززەتی عاشقانی ئەو زەمینە
لە خانەقای مات و هێمنیدا دەمرێ
ئەم کەونەیان بۆ ئاسمانە و
مەلی ئەوینی ئەزەلی لێ باڵدەگرێ

2

هەڵسانەوەم لە کەوتنما
بۆ ناو قووڵایی ئەبەدی حەشار داوە
دابەزینم لە سەرکەوتنی نهێنیم
بۆ کۆشکی ڕۆح ڕام کردووە
گرژینەوەی سەر لێوە پڕ بارەکانم
لە ئەشکی چاوی خەمبارم پێچاوتەوە
ئەمڕۆی خۆمم
لە بەیانێکی دوورەوە لاڵ کردووە
نەبوونی خۆمم لە بوونی سبەینێدا گرێداوە
ئەو خۆڵەمێشەی دەروونی من دەبینی؟
لە داگیرسانی وەجدی مندا سووتاوە

## ئاستانەی نامۆ بوون

1

بارِیمە دووندە دوورەکان
تەختە تاوێر و زەمەندی کەنارەکانم شووشتەوە
جۆگەی هەورم گەورە بوو بوو
باران بەگوڕ دادەباری
دەمزانی زستانە شەوێ
فرمێسك و بارانی سەوز تێکەڵ بێ
مەست دەبم و ئارەزوومە
ڕێم قەتاوقەت تەواو نەبێ

2

درەختی پڕ لق وپۆپی هەستی خۆمم
دایە دەست قۆشەنی مەلی نێو دەروونم
جاری ئاواش بالۆرەیێ
بەسە بۆ شەو سەرهەڵدان و لەناو چوونم
لە ئاگری خۆمدا ڕەوێ نێڵەم بینی
زمانیان دەبردە ئاسمان
تۆ لە دەرگایێ وەستابووی
سەرما ڕوومەتی قاو دابووی

3

بێ ئەنوا بووی لەپێت تاولی چیایان بوو
جریوەی زمانی بێچووە مەلەکان شکابوو
لایەکت وەکو بەفری سپی
ڕێبەندانی شاخ هەڵدەچوو
لایەکەی ترت ئاگر بوو
گریانت لە هەوکێ مابوو

4

دونیا چۆڵ،وەك كووچەیەكی بنبەست وابوو

كە بانگم كردی نەتناسیم

ئەگینا ئاگری لەشت لە گیانی منیش بەردەدا

لە دیتنما هەردوو مەمكت

لەناو مێرگی سینەی تۆدا كەوتنە سەما

كەروێشكەكانی ناو سەرم سرك بوو بوون

زەینت لە پێستی ڕامیان گیر نەدەبوو

بتدیبایە چ برینێكم كەوتوونەتێ

ئەو دڵەت هەر لە منداڵی ڕا پیر دەبوو

لایەكەی تر لەسپەشێ بوو

لە دەشتایی پان و بەرینی عەشقدا تاوی دەدا

من ماندووبووم، بمزانیبا دڵم دەكردە هێلینێ

سێوی دڵم بۆ دەستی تۆ سپی دەكرد

شیعرم بۆ كووز كووز دەكردی

بتزانیبا ترێی چاوم هەڵدەوەرێ

كاژی بەژنم دەكۆماوە

تۆش وەك هیوای من دەمردی

كە بانگم كردی نەتناسیم

بتناسیبام

هەنگی خەمت زێتر شیلەی دڵتی دەمژی

ئەگەر منیش بمزانیبا

خۆم بە پەتی شیعرێ دەكوژی

## سەرکێش

ڕۆحی من ئەسپێکی سەرکێشە
کەس وەك خۆم نایناسێ
کەس وەك من جڵەوی ناکاتە گەردەنی
هەندێ جار دەیخەمە ناو لەپم
ڕێگەی توناوتوونی پێدەبڕم
هەندێ جار
وەك کۆتری کێویلەی قەڵایان
باڵیم بۆ دەکاتە فەرشیلەی ئێواران
لەژێر سینەی خۆمدا لیسێکی بۆ دەکەم
لە یاقووتی خوێن و لە ڕەهێڵە و باران
لە میانی من و ئەو ڕۆحەمدا
سنوور شوورەی ئاوە
ڕۆحی من فریشتە و هەرماسە
دۆزەخی کەوسەر و بەهەشتی ئاگرە
ڕۆحی من
ئاسمانی ژێر پێم و زەمینی بان سەرمە
هەندێ جار گەورەیە
سێبەری تەمەنم دادەگرێ
کە هەڵدەکشێتەوە دەبارێ
وەك مشتە مەرجانێ دەکەوتە ناو لەپم
دەبێ بە ڕەوێ پۆڕ
ئاسۆم لێ دەکەنە مرواری
بۆم دەبتە شاباڵی ڕاستەوانە و چەپم
هەندێ جار بچووکە

بریقەی ون دەبێ لەناو خاك و خۆڵا
بۆ تاکە زامێکی مێرووله
بەفری ڕۆح
دەبێتە ئاوێکی تەنك و هەڵدەچێ
بمکەنە کێلّگەی ئارد و ڕمیش
ئەو ڕۆحەم دەبێتە کەپکە شاخ و پۆڵا
تاوسی ئارامت
لە دەریاچەی زیوی سامالّدا ئاو بدە
ئەی ئەسپی غەریبم
گیانم شەڵالی لیم بووە
هەر تخوویێك ماوە چوار ناڵە تاوبدە

## زۆربا

1

پەرییەکانی ئەم ڕەوەزە شاخ و داخە
ئەوەندەی حەز لە شەڕابی چیا دەکەن
ئەوەندەی لە نکاڵ کانی
شمشێر لە جەستەی بێزاری و خەفەت دەدەن
لە ئەویندارى نازانن
ئێستاش لەو سەر ڕووبارانە
چاوەڕێی سن میناس دەکەن
بەسواری ئەسپی کەرەندی
لەسەر کۆلانان دەرکەوێ
یۆنان وەك کچێکی ئازیز
بخاتە سەر زینی نوقرە و
بۆ کلێساکان سەرکەوێ

2

خەونم بەچەمێکی پڕ و گەورە بینی
جۆگەلەکانی بڕژێنە گۆمە مەنگەکانی کرێت
بچمەوە سەر ئەو دێرانەی
فەریکی فرمێسکی زۆری
لێ وشك بوو و ڕژایەوە
کە بەیانی لە خەو هەڵسام
ئاوازێك بوو
لەناو ژێی ژێر پەنجەی منا توایەوە

3

لە خانووە گەچ و بۆرەکان
گڵۆت گڵۆت خوێن و کرتە
لە ئاوێنەی بچکۆڵانەی
بەرکی سوخمەی کچۆڵەکان
لەبەر پێی خاچی مەسیحا
بریقەی دەچێتە ئاسمان
تێکەڵ بە چەمی شار دەبێ
ئێستاکەش تك تك هەڵدەڕژێ
کچان نەزری پێ هەڵدەگرن
ژنان لە دەست و پێی دەدەن
پیاوان سوژدە بۆ شەفەقی بەر پێی دەبەن
لەگەڵ کۆنیاکی نۆش دەکەن
منیش لە تەنبووری دەنێم
ژێی ئاوازی پێ خۆش دەکەم

4

ئەمشەو بۆ گوندێ ڕێدەگرم
بە ناو ڕەوەز و درەختان تێ بپەڕێ
ئەمشەو زامێ لە هەوای خۆم سارێژ دەکەم
هەنگی ژانی تێ بگەڕێ
ئەمشەو نەوایێ دەچرم
گڕ لە تەمبورەکەم بەردا
ئەمشەو چەشنێ دەنرکێنم
سوڵتان ئارەقە بکات و
دەست لە خنەی یۆنان بەردا

5

پەندورێکی سەدا هەنگوین
شانەی لەشم هەڵتەکێنێ
ڕووبارێکی بێ سەر و شوێن هەڵمگرێ و
بمدا بەدەم زەریاکەوە
بارانێ توند تەرزە بێنێ و
سەری گەرمم بشواتەوە
من هەر زۆرباکەی جارانم
پرسە و شایی
بنگەوەری پڕلە ڕەژووی بێ نان و ئاو
کرێتی ناو دەمی گورگ
نامکاتەوە مرۆڤێکی تۆ ئاسایی
دەرگاکەتم لێ بکەوە زەری کاڵفام
قفڵیش بدەی من هەر زۆربام

## تەمە سپییەکانی ڕۆح

1

گوێ بگرە

من چەمی مەرجانی خوێنی خۆم بەردەدەم

باشووکەی خوێناوی جەخاری ئەو دڵەم

بەرهەڵای درەختی شین دەکەم

تێواران بۆ ئاسمان بڕوانە

قەتاری تەنووران دەبینی

ئەوساکە تۆش وەك من لاولاوەی بێزاری

لە دەوری ڕۆحی خۆت دەچێنی

2

شەویان لە خۆیان وەرپێچابوو

سینەیان پڕ لە قەڕنەفڵی برین بوو

کەوتبوونە ناو لەپی مەرگ و

شەوی درێژی پڕ زریان

خەونی خۆیان

لە ڕاستییەکی ئەزەلی شەتەك دابوو

هەبوون و نەبوونیان لە یەکتر دەئاڵاند

3

ڕەشبەڵەکی ئاگر و ئێسقانم دەبینی

چۆن تێکەڵی یەکتر دەبوون

مەرگ و ڕۆحی سپی فریشتەم دەبینی

سەر و کۆکڵی یەکتریان دەڕنیەوە

سەختە سەختە

وەك پاییز و زریان و تۆف

سووکە وەك ئاڵتوونی خوێن و
مەرجانی ناو چاوی مرۆڤ
4
شیعر نەبا من مرۆیەکی سەقەت بووم
شیعر نەبا جوزامی مێژوو دەیخواردم
لوتکە گڕی تێبەردەدام
قەلی غوربەت لەناو وەردی برینمدا
لە خاچی شەوی درێژی خۆیان دەدام
5
سوسنی دڵم پیر بووە
ئێستا لەوسەری پیرییەوە
بۆ ناو گەڕەکی منداڵیم دەبەنەوە
لە میانی ئاسمانی نێرگز و زەمینی ژاڵەدا
گوناهی من
گوناهی گوڵە کێویلکەی لوتکەی دوورە
گوناهی من گوناهی ڕووبار و ئاسۆی سوورە
6
تەمی ڕۆحی شلەژاوم
لەستێرەکانی لە جامی کاڵ گرتووە
لە ناو زیخی نائومێدیدا ون دەبێ
سەیرکە چۆن ئەو ڕۆحەی من دەتوێتەوە
دڵی غەریبم پیر دەبێ
7
کەپکە شاخی شیعری سەختم ناوەتە کۆڵ
ترپەی دڵم
بۆنی باران و پڕووشەی بەفری لێدێ

## هەرێمی وچان

هاتن و تەرمەکەی چیایی سەر شانیان
بەپشکۆی کۆڤانی جەرگەوە دەسووتاند
دڵی خۆیان نابووە سەردەست و
بۆ سینەی وەسەنی ئەو گریان
قەرار بوو هەموویان ئەڵماسی بێدەنگی
لە پەنای چیاکە جێبهێڵن
ئێسقانیان لە بۆنی خاکەوە نەرم بێ
قەرار بوو جەستەیان بۆ خاك بێ و ڕۆحیشیان
کۆتری گورمیلەی سەرکێڵی تەرم بێ
ئەو ناوەش جەنگەڵی تاریکی ئەجەل بوو
دوا گرێی نێوانی سەرەتا و ئەزەل بوو
بەکۆمەڵ سەریان نا
بە سینەی ئەو تەرمەی بە کڕی
ڕووخساری نابووە ناو کڵێسای مەرگەوە
پێکەوە چوونە ناو ئەبەدی و نەمری

## بڕیار

بزانم دوا مەلی خاڵ خاڵی
وشەی سوسکە دەنگ و کاکۆڵی
لە بن باڵ و دەفەی
کەڤراوی نێو سینەی من دایە
شەختەی ناو قوتبی لەو دەروونەم دەشکاند
پەراسووم شەق دەکرد
ئاگرم لە گوڵی توتنێ بەردەدا
تولازیم نەدەکردە بووزا
بۆ پەرستگای پیری
دڵۆپێ خوێنی خۆم
لە بناری شاخی بێدەنگی لێدەنا
تا هەتا بەرماڵی هۆنراوەم دەق دەکرد
خۆم لەسەر تاخچکەی هەورازێ دادەنا
دەچوومە خانەقا و کونجی گۆشەگیری

## کەپری خۆڵەمێش

دۆڵێکی زۆر تووشە
بەفرێکی ئەستوورە
سنووری ئەوینم لە باڵای برینددا کێشراوە
برینیش کە سەرما لێی دەدا
تا مووخی خوا دەڕوا
شمشێری ڕوخساری تۆش
کاتێ بەگیانما هەڵدەکا
ئەو دۆڵە لە خوێنی کۆڤانم قەد دەکا
ئەو باڵەی وەك باڵی ئیکارۆس
بۆ دڵی خۆم کرد و هێنا بووم لەو دوورە
لە تیشکی ناو لەپت بوو بە ئاو
ئەو خەمەی من ڕستم
وا بۆتە ماهووتی ئەو بەفرە ئەستوورە

## ئۆلیس

کە شەو هات لێم پرسی بۆ هاتی؟
کێ تۆی دا بەناو ئەم
هەوارە دڕکەزی و بەیارە
کام دێوی مەرگەسات ڕاوی نای
بۆ گۆڕە غەریبەی هامۆنی خۆی بردی؟
کام نبتون
ئاودیوی خەرەندی بێ بنی خۆی کردی
کە شەو هات لێم پرسی
تەرمت دی بێ سەر بێ
چەمت دی
لە دەمی زەویدا وشك بێ و مردبێ؟
یا کەللەت دی کەوا مێرووولە
هێلانەی تەمەنی لە قەپێلکی چاویا
بۆ خۆی و بێچووولەی کردبێ؟

## دژواریی

بۆ كوێ دەچیت ئەم زەمینە زۆر گەورەیە
كاسە سەری تۆش بچووك و زەنگیانەیە؟
بۆ كوێ دەچیت ئەم زەمینە زۆر بچووكە
ئارەزووی تۆش زۆر گەورەیە؟
جێی عیشقی تۆی نابێتەوە
تۆ دەبێ یا ڕەگ و باڵا و قەد و سەرت
خوێن بۆ ئەم كەونە بەرینە بازرقەدا و
دەرگای برینت كەیتەوە
یا ئەم زەمینە بەقەد خۆت
بتراشی و بچووك كەیتەوە!

## ڤاليۆم

ئەوە لم نییە نا برادەر
بیابانی مەرگ و زریانی
کەپکە شاخی خۆڵاوییە
غار لە سواری ڕێ دەسێنێ
مینای زمانت دەشکێنێ
ئەم هەوارە
ڕەشەمەی چامەی درێژو ڤالیۆم بارە
ڕەشەمەی دڵی تەنەکە و
عاتیفەی ناو قووتی مسە
خەونی تەلی و ئەوینی ئەو شەمشەمانەن
چاویان لەبەر هەتاوی سبەینێ کزە

## شمشێر

دەستت لە بنج و دەوەنی
ئەم گرد و خەرەندە قوولە گیر کردووە
دەتەوێ لە هەڵدێرانا
بەرەو ترۆپك سەرکەوی
کەمەری خۆت
لە بڕبڕەی درەختێکا شەتەك داوە
دەتەوێ لە فەرشی پڕی
دارستانێکا دەرکەوی
ئەسپە شێکەی خۆت بەجێهێشت
لە پەنا پەسوێکا خەوتی
ئەگینا ئێستا
لە کەنار خۆرەتاوا سوارێ بووی
وەك بریسکەی شمشێر و خوێن
بژ و یاڵی ئەسپە شێکانت ڕەنگ دەکرد
لە دوندێ وەدەر دەکەوتی

## نامە

من لێرە سنووری مەینەتی مانەوەم پێ نییە
من لێرە بۆ ساتێك مەرگی خۆش
لە بستی ژێر پێما زیاتر جێم نییە
کە هاتی قامچی بوو
تاجی سەر برینی ئەو سینەم
تۆ سینەم نابینی بۆتە چۆن درەختێ
تۆ چاوم نابینی چۆن بەناو هەنیەما
ون بووە و ڕووچووە لە تەمی غوربەتا

## جەنە

سەیرکە دڵی تۆ و ئەو خەمە دژوارە
سەیرکە مەلەی تۆ و ئەو چەمە گێژەنە
سەیرکە
ڕەگی ئەو درەختە و خوێنی ئەو بنارە
سەیرکە
پەنجەرەی برینی شاعیر و ئەو بایە بێزارە
سەیرکە لاشەی خۆر
ئەو داڵە برسییە
سەیرکە سینەی من
لاولاوەی خەمێکی کەڵەگەت
بەر لەوەی کۆرپەکەی ڕوانینت
لە کەپری چاو بمرێ
سەیرکە
گڕویان گرتووە و ئاڵاونە یەکتری

## ئاڵۆزیی

ئاگرێك پێدەكەی
گەردنەی كێوێكی تەنكە
لایەكی دۆزەخی باربوسە
ئەوی تر بەهەشتی دانتییە
چراكەت هەڵگرە و هەردووكیان جێهێڵە
نە دۆزەخ ڕەشۆڵەی سەرمابووی دەروونت
گڕ دەدا و لەرزینت قاو دەدا
نە بەهەشت بارانی كۆڤانی
ناو سینەت كپ دەكا و
تینوێتی هەناوی كێلڕاوت ئاو دەدا

## قرژاڵ

ئێستاکە من ڕێگەم هەر یەکە و ئەو هەزار
کاتێ کە پێکدەگەین جارجارە دەگرژی
جارجارە تووڕە و توند
دەزانم ڕۆژێ دێ
چەنگاڵت لە ڕۆحم گیر دەکەی
خۆشحاڵم بەو ڕۆژە
چونکە من ڕۆحێکی سەرکێشم
دڵی خۆت لە دەستم پیر دەکەی
من بەفر و تۆ باران پێکەوە هەڵناکەین
کە هاتی دەمامکی خۆت بدە
بمناسی چەقۆکەت تووڕ دەدەی
چاویشت شل دەبی
تا دەمری
گیرۆدەی قرژاڵی برینی دڵ دەبی

## ساتێ بۆ ئەو

کە دڵم تەنها بوو
وەڕەسی لە خاچی خۆی دەدا
لەو شاخی نابووە کۆڵ
کە خوێنم دەسووتا بەزەیتی ئەوینێ
ئەو کەپری لە باران دەچنی
بۆ مەلی باڵ سووتاو دەگریا دۆڵاو دۆڵ
کاتێ من گوێچکەی خۆم
بۆ بەستەی ئارەزووم شل دەکرد
ئەو چوو بووە هەرێمی خاك و خۆڵ
ئێستاکە ئەی زۆربای خۆمانی
تەمبووری تۆ کوانێ؟
من تەنهام
کەوتوومە ناو ئەڵقەی چۆڵ و هۆڵ

## سزا

ئەو خوێنەم وەردێکە
چرا و خەم
برین و بێ دەنگی تێدایە
ئەو دڵەم شارێکی وێرانە و غوربەتی تێدایە
چاوی من چەمێکە
فرمێسك و ماسیلەی ئازاری تێدایە
تەمەنم کێڵگەیە و
دەوەنی ئەوین و سووتانی تێدایە
قەڵەمم پاسێکە
گریان و سەفەری کۆتایی تێدایە
دەستیشم بەردێکە ڕووخان و دۆزەخی تێدایە
بوونی من
ئەم کەونە بچووکەی وەك دەمی دەولکە
تا دەمرێ سەرەو ژوور
بۆ ناخی تاریکی و تەنهایی
هەمیشە لە کۆشی ڕێدایە

## ئەبەدی

ئەوینی کەپکە شاخ
لە مووخی زەویدا چەسپیوە تا هەتایە
شارەگی هۆنراوەی نالییە
لە چەمی شارەزوور شین بووە
سێبەری ئاسکە لە شینی چیادا ڕۆچووە
ڕۆحەکەی مەولەوی تا بەرزە
خانەقای گرتووە
شاباڵی هەڵۆیە تا دەمرێ
لە ترۆپك و یاڵی ئاسمانی شین دەفڕێ

## ئەڵقەی بۆش

تا چاو بڕکا ئەم زەمینە هەر خاڵییە
بەرچاوم پڕ ناکاتەوە
هەر چەند بەسەر سەبەتەی ڕێ دادەپرژێم
نارنجی دووکەڵی دەستم
بڕی تەمەنم ناشکێنێ
کە بینابیم گەورە دەبێ
ئاسۆ بچووك دەبێتەوە
کاتێ ئاسۆش برینی لێدەکەونە لەش
خۆی دەکوژێ
بەسەر تەرمی خاك و خۆڵدا هەڵدەگەڕێ
بیناییم لێ بچووك دەبێ و
ڕەنگی دەروونم دەپەڕێ
کە چاو بۆ گردێ هەڵدەبڕم
سەرم بە ئاسمان دەکەوێ
کە دەمەوێ لە چغزێدا
باوەش بەدەروونی خۆم کەم
قاچم لە زەوی گیر دەبێ
سەردەکەوم
دەگەم بەناخی بێدەنگی زەمینەوە
دادەبەزم
سەرم لە بەفری ئەو ترۆپکانە پیر دەبێ

## سێوی مەرگ

بۆ وەی لیمۆی ئارەزووی خۆم
بەدەست و پەنجەی ئەم کەونە دابهێنم
دەبێ ناکۆکی دژەکان کەم کەمەوە
دەبێ سمۆرەی ئاگر و
پشکۆی برین کەوی بکەم
لەم ئەبەدیەتە نادیارە
خۆم لە مەرگ ڕابهێنم
سەرپەنجەکانم لە ڕمی
قەڵەمی شمشێر گیر بووە

****

بۆ وەی دەستم لە پێستی زەردی
ئەم کەونە گیربێتەوە
دەبێ چاوەڕێی لاڵێ بم
وشەی مەل و ئاوازی ئاڵم بداتێ
دەبێ سەرخۆشێ بەدی کەم
هۆش و ئاگام وەدی بێنێ
بەزەوی پان و پۆڕ بڵێم
بالۆرەی ناخیم بۆ بچڕێ
بەبیابان بڵێم
لاوکی دوند و ترۆپکان سەربدا
بەئامێردی خەونم بڵێم
لەبەر چاوی من ڕۆح بدا
داوا لە لافاویش بکەم
بمباتەوە ئەو شوێنەی منی لێ هێنا

وا لە سووری خوێنم بکەم
بەپێچەوانە خول بخوا
بۆ وەی دەستم لە پێستی زەردی
ئەم کەونە ئازاد بکەم
دەبێ زیندوێتی خۆم
لە تەرمی سوارەکاندا بدۆزمەوە

****

ئەوە چییە لەناو خوێنم
بەندی غەریبی دەخوێنێ؟
ئەوە بارانە دەبارێ
یا ستوونی کەونە دەڕووخێ
گریانە قۆنداغ کراوە
یا زیڕەی ئەم کەونە کاسەیە
لە زاممدا وەرپێچراوە؟
****

تۆ چی دەکەی؟
ئەی کەتانی عەشق و میهر
بۆ دوو دەست و دوو قاچی خۆت
بۆ دوو چاو و دوو گوێچکەی خۆت
ناوەتە ناو قاسەی شکاو؟
بەدوای چەند دێڕێ دەگەڕێم
بمکاتە سوڵتانی شیعر

***

ئاو لە کوێ بێنم ئاگری
تەقەڵای خۆمی پێخۆشکەم؟
ئاگر و پەڕەند لە کوێ بێنم
پوشی دەروونم سەرخۆش کەم؟
دەمەوێ بزانم مەلێ
کە دەخنکێ چی بەسەر دێ
کە باران دەبارێ
زەوی چۆن چۆنی شاگەشکە دەبێ؟
بۆ وەی دەستم بە دڵی
نهێنی بەخشی ئەم سروشتە دابهێنم
دەبی ورد ورد خۆم لە مەرگ و
دەمی شمشێر ڕابهێنم

## گوڵی پێوانەیی

گوڵی زوقم :

تەرمێکم زیندووتر لە بتی ئەبەدی
ساتێکم درێژ تر لە سەدە
دەمەوێ کڵپەیێ لە خوێنی دڵ بەردەم
گەورەتر لە دۆزەخ
بنارێ لە وشە بچنم بەرزتر لە لوتکە
خۆمی تیا دارێژم
چۆن ئەم ڕێیە ببڕم؟ کاتێ دێم
ڕوخسارت خۆڵەمێش، دڵی من ئاگرە
کاتێ کە پێت دەگەم
ڕوخساری تۆ گڕە و دڵی من خۆڵەمێش

گوڵە مار:

دەهاتم زانیبام ڕێگاکەم کورتە
وەك ڕێگاکەی شاری هات و نەهات
دەهاتم زانیبام
لە شوێنێکی نزمی وەك ئاسمان
دەهاتم زانیبام
بەرزی وەك پەنجەی پێی شەڕەفخان
جامێکت دا بە من ژەهر با باشتربوو
لەوەی کە بەتاڵ بێ
گوڵێکت دا بەمن حەزیا با باشتربوو لە پەڕێ
بەخوێنی دڵی خۆما ئاڵ بێ

گوڵی ئاسمان:

هاتبا دەروونم بۆ ساتێ تەنهایی
وەك ملی بەفراوی قوڵینگێ گرتبا
تا هەتا لالەی سووری خوێنم
دەبوو بە خاوەنی شا کچی پشوودان
هاتبا تەنهایی وەك سوارێکی هیلاك
ڕێشمەی ناو لەپی خۆی
لە بژی ئەسپی ناو ئەو خوێنەم کردباوە
لە هامۆنی کەسکا ڕامدەکرد
خۆم لە بەرد و دار و زەویدا لوولدەدا
خەریکە بباریێ لەو دووره خوێنێ خۆم
دابایە ئەم گەواڵە هەوره
ئێستاکە ئاسمانی بان سەرم
دەبوو بە مەلەکوتی گوڵێکی گەوره

دەماره گوڵ:

بۆ وەی تۆ لە دوندێ ببینم
دەبێ خۆم بچمەوە بناران
بۆ وەی تۆ لە هەورێ ببینم
دەبێ خۆم ببمە جێ پێی دڵۆپە باران
بۆ وەی کە پێك بگەین
دەبێ یەك زەوی بین ئەویترمان ئاسمان
لەگینا ڕیسە گیای ئەوینمان

جەستە مات و مردوو شین دەبێ
ئێمە بەو مەودایەی نێوانمانا بەندین
وەك گوڵی دەماری
خوێنی خۆی بۆ باران دەربخا
دەبێ قاچێکی من لە زەوی خاك و خۆڵ دابگرێ و
ئەوی تر تۆی سووسکە بۆ ساماڵ سەربخا

کۆلارە گوڵ:

کە جەستەی خۆم
لەناو بروسکەی شمشێردا دەدۆزمەوە
هەست دەکەم منی بچووك
کلیلی ئەم کەونە گەورەیە ون دەکەم
کۆلارەکان پەڕ دەردەکەن
بەسەر تەرمی زیندووی منەوە دەخوێنن
دەزانم دەمرم و جەستەی خۆم
لەناو زریانێ وندەکەم
هەست دەکەم منی گەورە کلیلی دەرگای
ئەم کەونە بچووکە دەدۆزمەوە

گوڵی با:

ئەگەر بام لە دەست بێ
دەتوانم خوێنی خۆم
لە جامی لەشم دا بگۆڕم
باشووکەی بیناییم بگرم و

ئاسۆی خۆم بەرین کەم
ئەگەر بام لە دەست بێ
دەتوانم لە زمانی بەفر و
باران و کڕێوە سەر دەرکەم
کەوانەی وەستان و نەبزاوتن بشکێنم
ژمارەی پەنجەی خۆم زێترکەم
بەچاوی دیتنم ببیستم و بەگوێشم ببینم
ئەگەر بام لە دەست بێ دەتوانم
جاویدانی و ئەزەل
لەناو خوێنی خۆمدا بچێنم
بەڵام کە مەچەکی شاژنی با دەگرم
لە ڕۆحم ون دەبێ
کە ڕەهاشی دەکەم
وەك لاولاوەی تەنکی بیابانێ
لە ڕۆحم دەئاڵێ

گوڵی خوێن:

لە جومگەی لەشمدا نەماوی و
سەقڕی با تۆی بردە درەختێکی توورە
کێ ڕێگەی لۆکەیی ئەو بایەم پێ دەڵێ
کێ دەستی لە قژی ئەفسانەی با داوە؟
ئێستاکە تێکەڵی با بوویت
ڕوخساری شوشەییت نابینم
ناوێرم هەناسە هەڵکێشم
دەترسم بچیەوە ناو سینەم

ناوێرم هەناسە دەمەوە
دەترسم لە دڵم بچیتە دەرەوە
کەس وادەی بەمەرگ نەداوە
گیرۆدەی با بوویمە و باش گیرۆدەی تۆیە
لە میانی تۆ و بادا
دەروونم کێڵگەیەك برین و چەقۆیە

گوڵی مەسیح:

کە با دەبێتە سوڵتانی
ئەم کەونەی مەرجانی ئەشکە
درەختان لە جامی شەختەی مەرگ دەگرێ
دڕ دەخاتە ڕووبارەکان
مێگەلی هەوران ڕادەدا و بەرد دەجمێنێ
بێخی تابووتی چیاکان هەڵدەکێشێ
کە بەناو سینەشم دادێ
بەللووری دڵم شەق دەکا و
چیغی پەراسووم دەشکێنێ
خوێنی لەشم دەکا بەتاڤگەی یاقووت
سەدەفی دەمم پەرت دەکا
بارانی خەنجەر بانگ دەکا
گوڵی مەسیح لە هەنیەما دەپشکوێنێ
شمشێری ڕۆحم لە کاڵان دەردەهێنێ
ڕۆحێکی تازەی منالیم پێ دەبەخشێ
من چیم؟
کە با دێ گەردوون لە دڵم دەشارمەوە

بەڵکو تەنهاییم لە خاچدا
کە باش دەڕوا دڵم لە گەردوون دەشارمەوە
نەبا هەست بەتەنهایی بکەم؟

## دوا سەفەر

1

بەر لەوەی برینی ئەو دڵەی
هۆنراوە کون کونی کردووە
تێکەڵی شمشێر و چەقۆکەم
بەرلەوەی هەنگوینی باڵۆرەی شێتی خۆم
تێکەڵی ژەهراوی ئەزەل کەم
بەر لەوەی بمرم و بۆ شیعرێ گەورەتر
بۆ ساتێ کرێشمەی بارانیی نەمێنم
دەمەوێ ئەو چەمە بەشاخ و دۆڵەوە
بەکاژ و لاولاوە و مێرگەوە هەڵگرم
بیخەمە کیسەیێ
لە پەراسووی تەن و چاومی حەشاردەم
تا ئەبەد خوڕڕەی بێ
لە تەلانی تۆ و دامێنم

2

ئێواران جار جارە هەڵۆی چاوی زیوت
بفڕێنە سەر داو داوە بسکی ئاسۆی دوور
کە چاوی لە گریان سوور دەبێ
ون دەبێ لەو دیوی تەیمانی نەیستان
بڕوانە دوا مەلی ئاسمانان
کە بولێڵان ماندوو
گەروویان لە جریوە داغ دەبێ و
بەبێ دڵ دەچنەوە دارستان
بڕوانە دوا تاولی کۆچەران
کە بارکۆڵەی خۆیان لوول دەدەن

دەچنەوە زەنوێر و ترۆپکی تەمینی
هەر شوێنێ بارانی لێ دابێ و
هەور سێبەری خۆی دابێتێ
لەو جێیە
دوو چاوی خەم ڕەنگ و شەق شەقی
دڵی من دەبینی

1

چەند ئەستەم بوو، گڕی ئەوینێکی پیرۆز

لە دەفەی سینەم سوور دەبوو

ڕێشم تا دەهات دژوار و

ئەستێرەی بەختم دوور دەبوو

2

باڵا بوو لە کۆڕی درەخت و دامێنا

پێشەنگ بوو

لە پرسەی ئەو ئاسۆیە سوورەی

دەگەوزی لە خوێنا

3

زانیم گۆرانی ئەو شایە

تا ئەو بۆ ئاوات گەدایە

کۆتایی هات

لە دوو چاوی ئەو کۆرپەیەی

وەك خەنجەری

ژوانی نێوان ئەویندارانن

لە نێوان هەردووکمان دایە

4

تاقە گوڵی دامێنێکم لێ دیارە

لە دوورەوە وەکو پشکۆی ئاگردانێ

دادەگیرسێ و دەتوێتەوە

لەنێو هەزاران باراندا

هەر بەتەنها

گەواڵەیەك ئەو دامێنە دەگرێتەوە

5

مەلم دەبینی دەهاتن
سوور دەچوونەوە لە ئاسۆی
مات و خەمگینی ئێواران
دڵی بریندارێ منیان
پڕ لە خوێنی حەسرەت دەکرد
دەیاندامەوە غوربەتی
ڕەوەزە شاخ و لێواران

6

ئەی پروشەی خێڵی باران
بمدەوە دەست ئەو یادانەی
منیان لە ئێستاکەم تۆران
ئێوەش ئەی لوتکە دوورەکان
هەڵمدەنەوە
نێو خەونی ئەرخەوانی جاری جاران

7

شەڕابی جامی ڕەوەندان
مەستی سەفەری دەکردم
بەڵام هەمیشە بەرلەوەی
کەڵی شاخێ جێ بهێڵم
لە نیوەی ڕێدا دەمرم

8

زۆر جار دەمەوێ گریانم
لە بازرقە خوێنی سینەی بەر پەنجەران
نەرمتر بێ
یا کۆڵانم لە هی مەم و خانێی شاعیر گەرمتر بێ

9

ئەگەر دوو باڵیشم هەبێ، بەرزە فڕی

هەر هی هەڵۆ و هەر هی بازە

ئەگەر خەونیشم گەورە بێ

هێشتا هەر بەقەد شیعرێکی نەنووسراوە

هەر نیازە

10

چۆن دەتوانم

قژی نێوان زەوی و ئاسمان ببڕمەوە

خۆم لە ڕابردووی پڕ تاسەم بکڕمەوە

چۆن دەتوانم؟

سێبەری بازی پڕ شکۆ

لە مانگە شەوی شاخەکان بسڕمەوە

11

لە گوڵی دامێنێ ماندووتر ڕێ دەگرم

لە پشکۆی ئەوین دادەگیرسێن

تا مردن

12

ئەی زێدی خۆم

بێ تۆ زیندووێکی مردووم

تاشە بەردێکم لەژێر گۆم

ئەو برینە گرانەی جەستەم

لە خەرەندی پڕ مەترسیدا تل دەخۆم

13

گریان گوڵێکە ئەبەدی

لە کێڵگەی ڕۆحم شین بووە

گریان ئەو کۆترە شینەیە
لە لیسی شیعر دەنیشێ
بەڵام هەمیشە دوور بووە
14
گەوهەری ئەو دڵەم بۆ کێ دابڕێژم
کام گریان بکەمە ئەفسانە و
ئاواتی کۆنینەی خۆمی تیا بنێژم؟
15
کە چڵێ لە قەدی خانەزای دادەبڕێ
دەبێتە دەوەن و ئاگر و پووش
دەبێتە دووکەڵی ڕەوەزێ
هەڵەمووت ئامێز و دارماڵی بەفری تووش
16
ئای ئەم کێوانە چەند تەنهان
دڵی من و ئەو کێوانە
وەکو یەك وان
یەکێ لە تەم
ئەوی دیکەش لە خەم پەنهان
17
ئەی زات
وەرە دەست لە ملی شاعیریم کە
با تێپەڕین
ئێمە تەنهاین
بێ تەخت و تاج و سێبەرین

18

کۆچ بکەم من

یا لە دۆزەخی گومانا

درەختی یەقین بچێنم؟

نە دەبوو چرا بشکێنم

19

نە دەیگەمێ و نە لەبەر چاوم ون دەبێ

نە دەیگرم و نە لە سینەی من پێدەبێ

تا ئاگری ئەو ئەڤینەم دادەکەوێ

نە هەنیەی سەوزی ئاسکیش

جارێکی دی دەردەکەوێ

20

چەند پیرۆزن سینەمان دەکەن بە لوتکە

هەڵۆی هەمیشە بەرزەفڕ

شیری پیاوەتی لە دەمی ئێمە دەکەن

21

ئەمەیان گۆڕی ڕەندێکە

با لەسەرخۆ و بەشەرمەوە

بەفرمێسکێکی گەرمەوە

بنووشتێینەوە سەر ئەژنۆ

22

هەوار دوورە

هەر تروسکەی بەردی چیا بەدی دەکەم

ئێوارەم بۆ ڕوون کاتەوە

هەر ورشەبای ڕەزەکانە

دڵی تەنگم بداتەوە

23

ئاسك ئاسا وەدەركەوتی

مەچەكت لە خەنەی دڵم سوور كرد

24

ناچارم چاوم دابگرم

نەوەك لە هاڵاوی گەرمی

برینی سینەما بمرم

25

سەیركە ئەزیزم

شەوقی نێو برینی ئەم دیو و ئەودیوم

چۆن بۆتە تاجی سەر

ئەدگاری وەك گەڵا وەریوم

26

كە ئاوابوو پێكی مەستیم كوژایەوە

هەرچی جوانی ئێوارە بوو

پەری ئاسا لە چاومدا توایەوە

27

قوڵینگی سپیم دەبینی قەتار قەتار

گڕی ئەوینیان لە سەختی ڕێ بەردەدا

كۆنە یادم دەكولانەوە

هەردوو چاوم تەڕ تەڕ دەبوون

28

دواجار بوو هەر تەنها

یەك بالۆرەی سەفابەخشی بۆ من دەچڕی

دواجار بوو هەر تەنها

باسی یەك ڕێژنە بارانی دووری دەكرد

باسی یەك بست هەور و
یەك ڕووباری ڕوونی دەکرد

29

شنەبا
کە سینەی دامێن و ڕیزە چیا جێ دێڵێ
زۆر پرچ و شاکەزیان ئاڵ دەکا
دڵنیام ئەو بایە
لە درەختی کپی گوندەکەم هەڵدەکا

30

چرا دیاربوو لە دوورەوە هەڵدەتروسکا
گیانی منیش
شەڵاڵی شیعر و شەرابی ترێ دەبوو
ڕێگەشم پڕ لە پابەند و گرێ دەبوو

31

کە دەهاتی
دارستانیش ئامێزی پڕ دەبوو لە گەڵا
جۆگە ئاویان ڕانەدەگرت
کەناریش قژی پڕ دەبوو
لە بروسکەی سپی چیا

32

بەیانییەك کە دەستی خەو چاوی بەردام
گریەی ساوای ڕۆحێکی ئاڵ
منی شادی لێ تامەزرۆی خستە سەر چۆك
ورد ورد ئاگری یادێکی لە دڵ بەردام

33

نامەوێ ڕۆژم لێ دابێ

ئەو خەمەت ببێتە کۆت و

مارەزیوی بەر گەردنم

بەسەر شان و ملم دابێ

34

بڕستی تەمەنم شکا

تەمی ترۆپکان دەپڕژێ

بۆیێ جار جار

چاوەکانم لە ئاست مەرگی تۆ دادەگرم

فرمێسکم بەگوڕ هەڵدەڕژێ

35

ئەلەوێدا لە تەمی سەر ترۆپکان و

لە دووکەڵی سەر پشکۆدا

لەنێو هەزاران هەزاران

ئەستەمی سەخت و نسکۆدا

لە من دەرگا واڵاکردن

لە تۆش نەهاتن تا مردن

36

ئاخۆ چ برینێکی کۆنە

کۆرپەیان دەلاوێننەوە و ورد ورد دەگرین

37

ئەو دڵەی من دەڵێی درەختێکە تەنها

تێکەڵ بەتەمی شاخ بووە

دەڵێی نالییە بە تەنها

سواری بۆراقی ئاخ بووە

38

سەیرکە ئەو دڵەم

دوای ئەو هەموو حەمکە ساڵە

لە حەسرەت شەفەقی چاوانت

هەر دەڵێی مناڵە

39

دڵم توندە

دەڵێی چیایێکە بێ کانی

بێ ڕەز، بێ کەڤر

بێ خوێنی زیندەگانی

40

لە پەنجەرەوە ڕا دیارن

ئەو مەلانەی کۆمەڵ کۆمەڵ

بۆ نێو ئارانێ ڕەو دەکەن

ئاخ بۆ یەك جاری دونیای من

پڕ لە برین و شەو دەکەن

41

لەو مێرگانە بە سۆترم

هێشتا ڕەوەند و کۆچەری چیاکان

لە ڕۆحیان نەخەوتوون

ئێواران شاژنی خۆرەتاو بەجێیان دەهێڵێ

42

بارانێکی تووش لێی داوم

بەدوای ئاگرێ دەگەڕێم

تەنها لە گوندە دوورەکەم دەست دەکەوێ

هەم دیارە و هەم نادیار

دڵنیاشم ناگەمەوە جێ

43

گریان و سۆز

دەڕژێنە نێو کوانووی برینم وەك باران

هێندێ مەشخەڵ تروسکە دەدەن

دەکەونە سەر قوببەی بەفرینی بناران

44

ئەوە بالۆرەی ئەو دایکانەیە

کە بە کوڵ ئەگرین

با دەیانهێنێ و

تێکەڵی تەمی شاخیان دەکا

ئەو ناوە پڕ بووە

لە مەلی فرمێسك و لە ناڵەو گرین

45

سەرچاوەی دوو دڵیم

مینای ئەو پەنجەرە دوورانەن

دیارن و دیار نین

هەندێ جار لە چاو ون دەبن

جارجاریش بارە کچیان تێدا دیارە و

دەشتایی دەگرن چین بەچین

46

نە هەورێ لوتکەم دەگرێت و

نە بەفرێ گۆنام تەڕ دەکا

نە وەرزێ بەسەرما دەخشێ و

نە بارانێ تاجی گەشی

پەلکە زێڕینەی ئومێدم لەسەر دەکا

47

گەڵا دەڕژێتە ژوورەکەم

گەڵای ڕژاو

هەزار و یەك زام و برین

هەر گەڵایێ کوختێکم بیر دێنێتەوە

کۆستی کەوت

لە نسکۆی سووری چل چرایێ

## کەڵەکێوی

ئەبارێ و نابارێ
ئەبینم یەکێ دێ و لە پەنا سووچێکا
زۆر بەتاسووقەوە چاوەڕوانیم ئەکا
ئەیناسم نایناسم
جار جارە برووسکی چاوانی
وەك چاوی کەڵێکی بریندار
دەستم پێ شل ئەکا
لێی نزیك ئەبمەوە و ناگەمە ئاکامی
دەستم لە سێبەری بڵندی گیر ئەبێ
ئەوەندەی پێ ناچێ
وەك ئەسپی ئەفسانە ون ئەبێ
سینەشم وەك زمانی کێوی
کە بێچووی لە شاخێ هەڵزنێ
پڕ ئەبێ لە عەتری سەرسامی
ئەچمەوە سێبەری کەپرەکەم
داستانێ تەی ئەکەم گریان و ماتەمە دێتەوە
لەوەتا بانگ ئەکا و بانگ ناکا
ئەمامی هاواری لە سینەم گوڵ ئەگرێ
سمی ئەسپەکەشی برووسکان
لە تاوێر هەڵئەگرێ
لێم گەڕێ بتناسم ئەی ڕێبوار
دەزانی چەند ساڵە ئەسووتێم بەترپەی
کەشەنگی پێتەوە
ئەمجارە سەیری

هەوری ڕەشی ئاسمانی دوور ئەکا
پەنجەکانی سڕن
چاوی ئەسپەکەشی لە بەفر کول بووە
بە مەچەك فرمێسکی خۆی ئەسڕێ
ڕێی دووری نێوانمان
بەچەقۆی دیقەتی خۆی ئەبڕێ
دڵێکی برین بار، کورژنی چیا بڕ
هەر سەیری پەنجەرەی ئەو ئەکا
چاوەڕوانی تەمی بێ بنی شاخانیش
پڕ لالەی خوناوەی بۆن بەفری شەو ئەکا
گریانم بوو بە مەل
ناچار بووم کەڵەکێوی دووری
لە فڕین بۆ باڵکەم
ئەبارێ و ناباریێ
ئەو گیانە نامۆیەم
هەمیشە هەر کەیلی مەشخەڵ و گریانە
چونکە من ئەزانم یەکێ دێ و چاوەڕوانیم ئەکا
ئەیناسم نایناسم لەم تۆف و زریانە

## ئەسپەکان

بەیانییان ئەو ئەسپانە
ئای بەیانییان ئەو ئەسپانە
نوقمی تەم و بریسکەی شمشێر و تیرن
دەڵێی شیری شێریان پێیە
لە بێشەڵانی جوانانەوە هاتوون
عەتری ماچیان لێ دەتکێ
لە گزیر کوشتن ڕاهاتوون
حۆرین، پەرین
تا ڕەت دەبن برووسکان داوێن
لەو ئەسپانە دەڵێی لە دەریاوە هاتوون
بەربوونەتە ئەو کێوانە
سینەیان پڕە لە ئاگری ئەوین
مەرجانی ڕژاوی زەوین
شەڕابی هەزار ساڵەی شەوین
ئای ئەو ئەسپانە چەند جوانن
دەڵێی لە ئاسۆوە هاتوون

## ئاسکەکانی نێو شووشە

کۆمەڵێ درەختن، خەونیشن لە گەڵا
ڕووبارن لە شەختە
ئەسپە شێن لە شووشە
هەوێردەن لە میناى سابڵاخێ
کۆمەڵێ گەوهەرن
لە لیتاوى مێژووى لەبیرچوون چنراون
کۆترن لە قەفەزى ڕاوچیدا تەنراون
ئاسکەکان ئاسکەکانى دۆڵى غوربەت و
ڕەوەزى دیاربەکر
تەوێڵیان کاشانى عەجەم و
گەردنیان لاملەى ئارارات
بەکەزى و بسکى لوول و نەرمى زرێبار
دەشتایى هەورامان جوان دەکەن
ئاسکەکان، ئاسکەکانى دڵى دەربەند و
سوارەکانى گۆلى مەریوان
شەوەکانیان درێژ ڕۆژەکانیشیان کورت
ئاسمانیان بێ مانگ و زەوییان پڕ دیلى
هەر لەگەڵ کازێوەى بەیانێ
تا کاتێ خۆرەتاو دەکوژرێ
بۆ بەختى هەزار جار کوژراوى خۆ دەگرین
ئاسکەکان، ئاسکەکانى لە خەم هەڵاتووى
پشت حەوت ئاو و چیایان
تەوێڵییان کاشانى عەجەم
گەردنیان لاملەى ئارارات

## ڕابردووژینی

ئای جارانم، تۆ ئاسکێکی چەند خێرا بووی
بروسکێکی چەند تیژپەڕ بووی
ڕووبارێکی چەند بەپەلە بووی
بەهارێکی چەند کورت بووی
شەیدام هەر وەکو جاران بم
سپێدان بێ ئەوەی وەکو ئێستا
لە خەو ڕابم و خەمەکانی ڕۆژانەم بژمێرم
یا بۆ کراسی پرسەی هاوسێکانم
هەناسەی سارد هەڵبکێشم
بێ ئەوەی سەرنج دەمە فڕینی مەلان و
لە کچانی کۆک ڕامێنم
بێ ئەوەی خەم لەو پیرە هەڵۆیە بخۆم
سەردەمێ هاوڕێی ساماڵ بوو
ئێستاکەش دیلی دامێنە
شەیدام هەر وەکو جاران بم
لە نێوان ئێستا و جارانم
دەیان هەزار دۆزەخ هەیە
دەیان هەزار کێڵگەی ژەهر و قسەی هەنگوین
ئای جارانم تۆ ئاسکێکی چەند خێرا بووی
براووسکێکی چەند تیژپەڕ بووی
بەهارێکی چەند کورت بووی

## لوتکە

تۆزێ ئاسمان، تۆزێ زەوی
تۆزێ لوتکەی کپ و نەوی
هێندێ تروسکەی سەرشێت و باوەشێ با
مەوادی نەهەنگی هزریان
دارماڵی ئازار کردەوە
ئەوە منم دوا سواری پێشەنگ کوژە
گزنگ و ئاسۆ تێکەڵی یەکدی دەکا
شمشێری دەستی
ئەو ناوەی پڕ لە برووسك کردووە
دێوی ترس لەت لەت ئەکا
تۆزێ درەخت
تۆزێ هەناسەم پێدەوێ
تۆزێ سێبەر، تۆزێ خەنجەر
تۆزێ تێڕامان و دامان
تۆزێ ون بوون
خۆ هەڵواسین بەدار کاژی سەوزی مەژی
تۆزێ ژیانم پێدەوێ بۆ خودکوژی
ئەختێ مەرگ و ئەختێ ژیانی پشکۆبار
تۆزێ خنکان،تۆزێ مەلە و شەختەزانی
لە سینەمدا پشکۆڕێژن
بۆ هەورازی جاویدانی

## پیری بخوور

ئەی پیر، پیری میهر
پیری شەوق، کە دیدگا بێ شەوقە
پیری شریخە و کوانووی ئاگر
پیری شکست و سارێژی
پیری پاکی
پیری بخوور
پیری شمشێر
پیری دوای هەموو جەنگەکان
پیری ئەو بایەی
لە پاکستانی زەردەشتەوەت هێناو
لە مەچەکی خۆتت لوول دا
پیری ئەو تیشکە دوورانەی
لە دڵی ئەشکەوتەوەت هێناو
لە باوەشی خۆت چەپك کرد
پیری ئەو بۆن و بەرامەی
لە بەهەشتەوە ڕامت کرد
دونیات پێ کردە ئەفسانە
پیری شان بەر خەنجەر کەوتوو
پیری دونیا دیدە و جیلوە
پیری خاکی
پیری ڕەونەق
کە ڕەنگەکان کەڕوویان گرت
لەی پیری پەرستگای میهر

دەستم بگرە بیناییم ڕەش داگەڕاوە
خەریکە ڕۆحم پڕ دەبێ
لە وردە ژەنگی وەڕسی
لە چڕە دووکەڵی جودایی
دەستم بگرە تا بتوانم
بەتیشکی قەفتەبووی سینەت
بەو بەرامەی لە جۆگەڵەی شیرت هێنا
هەر بۆ ساتێ حەقیقەتی خۆم ببینم

## هەڵوەرین

1

ئەوەتام لە پەنای تەنهایی مانادا

چەند پارچە ڕۆحێکی زۆر سپی

ڕێگەیان لە مەرجان گرتووە

چەند پارچە بایێکی ڕەوەزان

ئەو ناوەی لە جووڵەی ئەبەدی خستووە

خەمبارم گوڵەکەم خەمبارم

خەمی من ڕێ نییە بەسەریا تێپەڕی

خەمی من گوڵ نییە بۆنی کەیت

خەمی من ئاوێنە نییە

پرچی خۆت لە بەریا دابێنی

2

ئەوەتام بەتەنها لە پشت کێوی کتێب

لە پشت گرد و شاخی وشەوە

لە پشت چیای مانای قووڵ

ون بووم و دیار و دیار نیم

3

بوومەتە باران و هەر جارەی دەبارێم

وڵاتێک سەوزەکەم

بوومەتە گوڵە گەنم و هەر جارەی دەدروێم

کێشوەرێك تێر دەکەم

بوومەتە چاوێك و هەر جارەی دەگرییێم

دەریاییێك هەناسەی سارد و کپ لێر دەکەم

4

خەمبارم گوڵەکەم خەمبارم

ئەوەتام لە خەڵوەتگای کپ و تەنھاییم

خۆم لە ڕۆحی سپی نێرڤانا لوولداوە

لەگەڵ با

کارەساتی قەدی درەختان دەنووسین

لە ژێر سای تەوری تیژ

ئازاری گەردنان

لە سینگی وشە دادەڕێژین

5

خەمی من، گوڵ نییە مەیچنە

سێوی بەردەم سیمرغی ڕێ نییە مەیڕنە

ڕۆژانە گەڵایێ لە لکم دەوەرێ

ڕۆژانە جۆگەیێ لە گیانم وشك ئەکا

ڕۆژانە پیفۆکێ لە جەستەم دەپشکوێ

6

ئەوەتا دەشتایی کیانی ونی من

بەتەنھام،لە پشت زنجیرە شاخی کتێبان

بەتەنھام،لە بەردەم مردنێ چەند سەختە

سەختە وەك ئەو ئەسپەی بە تەنھا

لە دەمی هەڵەمووت دادەڕمێ ڕۆح نادا

سەختە وەك ئەو ئاسکەی

لەڕەوگەل دادەبڕێ

بەڵام دەست لە سەمای بەرنادا

## بەختەوەرەکانی سەر زەوی

وای چەند بەختەوەرن ئەوانەی
ئێواران کە بازنەی ئاسۆ
دەکەوێتە ملی زەوی
دەگەڕێنەوە کوختەکانی خۆیان
زمانیان تامی ڕاستی لێ دێ
دڵیان بۆنی زناری پاکی
دەستەکانیان
شەهدی دۆستایەتی لێدەتکێ

***

وای ئەوانە چەند بەختەوەرن
گۆرانی دەڵێن بێ وچان
دڵیان وەکو ساماڵی سەرچیا سافە
زمانیان تەنها بۆ شەکر دەگەڕێ
دەستەکانیان هەمیشە بۆ ڕاموسان

***

چەند بەختەوەرن ئەوانەی
ئێواران دەکەونە سەر گازەرەی پشت
سەیری ئەستێرەکان دەکەن
هەر ئەوەندە دەزانن مانگ
وەك کیژۆڵەیەکی کێوی
دێتە نێو باوەشیان، تریفەش دایاندەپۆشێ

وای ئەوانە چەند بەختەوەرن
ئەم زەویە بسووڕێ یاخود نەسووڕێ
دڵیان وەك بەللوری ئەشکەوتان، بێگەردە
زمانیان وەك زمانی کوکوختی، بێ گوناهە
دەستەکانیشیان
وەك دەستی مەلۆتکە، موقەددەسە

* * *

وای ئەوانە چەند بەختەوەرن
هەر لەگەڵ یەکەم داڕژانی ئەستێرەیێ
ئەوان چوونەتە خەوێکی قورسەوە
پێیان وایە ماڵەکەیان، سەرەتای دونیایە و
دەرگاکەشیان، کۆتایی دونیا
وەك ئێمە کتێب ناخوێننەوە
وەك ئێمە بەدێرێك شیعر
دونیا لێك نادەنەوە
کە چرایان هەبێ پاشان
چونکە ئەوان هەر لە تاریکی
لەزەت وەردەگرن

* * *

ئای ئەوانەی چەند بەختەوەرن
خاکین، کە پەنجەیەکیان بریندار دەبێ
بەخۆڵ تیماری دەکەن
کە عەشق لێیان دەدا دەبن بەشوان

دەگەڕێنەوە دەشتایی
دڵیان پاکە
وەك ئەو قامیشەی دەیژەنن
زمانیان سپی
وەك ئەو شیرەی دەیخۆنەوە
خەونیان شیرین،
وەك ئەو کچەی خۆشیان دەوێ

***

وای ئەوانە چەند بەختەوەرن
بەبزەی گوندینیەك
دەیان ساڵ تای عەشق دەیانگرێ

## تەوقی وشە

فڕینی ئاڵ، لە ڕەگ و ڕیشەی درەختی هەتاوایە
فڕینی مەل، لە بارستەی شادەماری باڵیدایە
فڕینی خاك، لە پەڕ و باڵی پڕ تینی هەڵۆ دایە
فڕینی ساماڵی زیوییین، لە بارانی پەڵە دایە
فڕینی شیعریش لە ئەفسانەی جوانیدایە

***

سووتانی شەو، لە شەفەقی ستێر دایە
سووتانی کێو، لەنێو نرکەی لوتکە دایە
سووتانی ڕۆح، لەنێو جەستەی بێسیمایە
سووتانی دڵ، لە ئاڵتوونی ئەویندایە
سووتانی شیعریش
لە دێڕی مەولەوی باری ڕێدایە

***

هزری ڕووبار، لە شەپۆلی تووڕە دایە
هزری ئاگر، لە هەڵچوونی کڵپە دایە
هزری ئەوین، لە سووتانی تەمەندایە
هزری زەوی، لە لەرزینی ناخیدایە
هزری شیعریش، لە ترۆپکی مانا دایە

## ستوونەکانی با

وەرزێکی نادیارە
خۆم لە با لوول دەدەم
پڕووشە لە ڕۆحی شکاوم هەڵدەسووم
سواری ئەسپی ئاسۆو بۆراقی گڕ دەبم
ناو لەپم بۆ مەرگ ڕادەخەم
با گیای ئەبەدی لێ شین بێت
وەرە خۆت ڕووت کەوە
لەبەر بای کۆڤانم
وەك داربی ڕۆخانەی چەمی تاڵ
دەگریم و دەهەژێم
دەمەوێ بچمەوە دەریایێ
تێکەڵی کپی بم
***
لەو ناوە بێدەنگ بوو
ڕەشەبا ئەسپی خۆی دابووە دەست پاچەکان
زەنوێرو گیا بوو لوولی داین
ئاگر بووین خۆڵەمێشی مێژوو قووتی داین
کوا گرێ کوێرەی کەون بە من شل بێتەوە
قاچی من بە زەوی نووساوە
لەگینا فڕین بوو مەبەستم
سەریشم لە ئاسمان گیر بووە

ئەگینا زەوی بوو
وەك تاڤگە هەڵدەڕژایە هەستم
وەرزێکی نادیارە
کوا ڕووگە نەمایێ لەم هەرێمە نییە
بزانێ سیمورغی داهێنان لە کوێیە؟

## کۆمێدیای با

با دەپرسێ چی بکەم باشە
تا میراتگری ئەزەل بم
دیارو دیار نین
هێندێ دەبنەوە باشووکە بۆ قەڵایان هەڵدەکشێن
لە سارای سپی دەگەڕێن
شەرابی ئاسێگە دەخۆنەوە
زێوەندی گۆرێکی سپین
من بام بای سیحر
بۆم هەیە لە باڵای دارستان بناڵێم
بچمە نێو سینەو مەمکی پەری
ڕوو بچمە نێوانی کڵۆی بەفرو ئاگر
من بام با
دیۆنیس بەم ناوەختە
کەللە سەری خۆی گرتۆتە دەست
پیاسە دەکات
ئای ئەم پیاسەیە چەند سەختە
هێندێ کەمەریان گرتووم
سێڵی دەروونی پرۆتۆسن

هەندێکیان زڕەبان لە مژاد کەوتوون
ئەوەشیان مەلهای شالیرە
پەڕەسێلکەو کۆردیلیا
بە یەکەوە گۆرانی دەڵێن
من بامە با
سەرسامم پەریخان
تۆ بەقەد ئەم کەونە بچووك کەمەوە
یا ئەم کەونە
بە قەد تۆ گەورەکەم؟

## هەڵوەشانەوەی با

چی دەبێ زێ هەڵکاو ئاگر لە کێڵگەکان بەربدا
یا ئاور تەڕاتی چیا دامرکێنێ
ئەسپی شەو چوار ناڵە تاو بدا
ئەشکەوتان دیلی دەست و قژی چرا کا
ئەم ڕێیە چەند سەختە بێولە پاوانی شین بتاڵێ
بکرایە بچێتە ناو فەریکی وشە
دەمتوانی قەفتەی دوورودرێژی بگرمە دەستم و
لە مێرابی ڕۆحم گیر بووایە
ئەمە بای دۆزەخی سەر بەفرە
لەمێژە سایەدم هەڵدەکا
بکرایە ئەو باسکەم لە گەردنی لوولدابا
دەستم لە ئاورینگی سوور دەکرد
وا هاتن ئەو مەلانەی
خەیاڵی دوندی دووریان پێیە
بە شەقەی شاباڵی هەڵۆیان دەخوێنن
بە چەقۆی زمانی ئەشکەوتان
چەمی شاعیرەکان دەدوێنن
هەناسەی کەمتیاری ئەبەدە
بەسەر تاڵە ڕێی ڕۆح هەڵدەکات
سایەدم کرمە بەفری لووتکە لوورەی دێ
چی دەبێ زێ هەڵکا بەر لە لافاو بگرێ
یا دووکەڵ لە گڕ بەربێ و ئاگر دامرکێنێ ؟
یاخۆ مەرگ گیان بە لەشی کوژاوە داتەوە
لەم ڕێیە چەند لە شووشە دەکا

ئەم بەسەریا هەڵکا
دونیا وەك ئەڵماسی بەفر هەڵدەگەڕێ
مەلی نێو دەشتایی کۆچ دەکەن
مۆرانەی بێدەنگی بەم ناوە وەردەبێ
دەروومان دەبێتە چلوورە
ئەمە بای دۆزەخی سەر بەفرە
ڕوومەتم قاو دەدا
ئاسکی جەنگەڵان ساو دەدا
سایەدم لەمێژە هەڵدەکا
مەرگی ئاڵەکۆکی ئەبەدە
بەسەر ئاڵە ڕێی رۆح هەڵدەکا
ڕێگەو با تێکەڵ بوون
مانگ گیرا
ئەستێرە بە کۆمەڵ دارڕژان
بێدەنگی و ئەم کەونە تێکەڵ بوون

## کتێبەکانی با

1

ئێوارە بوو کە جێی هێشتم ئەفسانەیی
دڵێکی شووشەیی
خوێنێکی قەفقاسی
هەندێ عەتر و قەیرێ ئەشك
ڕۆحێ لە سپیاتی بەفر و تەتەرێ لە جوانی
بەیانی بوو کە هاتەوە
لەسپێکی سورخێ و بریندار
بخوورێکی ئاسمانی و تابووتێکی ئەرخەوانی

2

ئێوارە بوو کە جێی هێشتم
مشتێ ئاوازی کێویلە
باوەشێ بای نێو ژوورەکانی دارستان
دوو نوکتەی خۆش
دیشلەمەیەك
دەستێ پڕ لە میهر و
ئەشقێکی ئەرسۆسی یەکجار ئاڵ
بەیانی بوو کە هاتەوە
کراسێکی ئەبەنووسی
تەرمێکی گوڵ گوڵ و
سرووتێکی جەنازەیی

3

ئێستێکە لە خۆشی پێشوازیت
بخوورێکی شامیانە دادەگیرسێنم
مۆمێك لە عەنبەر

کتێبەکەی زۆربا دەخەمە بەر دڵم
لە پەڕی یەکەمەوە
گریانێکی قووڵ،خەمێکی تیر دامدەگرێ
چ مەلێکی موقەددەس بوو
باڵیگرت و لە ئاسمان سووتا
چ پەرییەکی ئەفسانەیی بوو
تەمەنی لێ داگیر کردم
ئای لەم خەڵوەتە ئەبەدییە
4
ئێستێکە لە پێشوازیتا
چەپکی با ڕامدەکەم
تووڕەیی ئەسپێکی کێویلە
دەکەمە نێو شووشەی
شەرابێکی خەست و کۆنینە
لە پێکی یەکەمدا
چەمە ئاڵەکانی جەستە و
مەلەی پڕ لە شەبەقی من
ئاسۆ دادەگرن
کەمتیاری چ گوناهێکە
دڵی منالیمی دیل کردووە
چەقۆی چ ژەهرێکە لە دەستی پرۆتوس
5
لە ماڵاواییتا
لەبەر چرایێکی غەریبانە
لە بەردەم پەیکەری هەرماسا
بالوورەییێک،فرمێسکێکی خەمبار

کتێبەکەی مەولەوی دەکەمەوە
چ ئاگردانێکی پڕ سرووت بوو
لە باڵی فریشتەییم بەربوو
ئای لەم خەڵوەتە ئەبەدییە

## پیانۆی ڕۆژهەڵات

1

بای ئەشقیا چەند شێتە
هەر دەڵێی خووی بەجوانییەوە گرتووە
لە چاوتروکانێکا
پاڵتۆکەی برووسکی لەبەرکرد
کتێبەکانی ڕێنواری فڕاند
تابلۆکانیشی بەسەر درەخت و گەڵادا بەشیەوە

2

با دەروون ناخوێنێتەوە
تەنیا بەدوای جوانیەکاندا دەگەڕێ
جار جارەش دارستانەکان
لە گیرفانی خۆی دەنێت
دەیانبەخشێ بەلافاو
ڕێنواریش هەمیشە وەستاوە
گۆچانەکەی لە زەوی گیر کردووە
چاوێلکەکەشی تەمی بولێڵ دایپۆشیوە
بە ڕامانەوە سەیری فەرتەنەی با دەکا
بە بزەیێکەوە دەڵێ
بای سەر ئەو گۆڕانە
هەر دەڵێی تەمتوومانێکە لە گومان
کتێبەکانی تەواو کردم
تۆم هەر نەبینی ئەیدۆست

3

بێ تۆ ڕۆژهەڵات خاڵییە و بۆنی فیراق

چ شتێ سەختترە لە تەواوکردنی حەرفێ

بۆ فەریکترین پرسیار و ئەشقیاترین ئەشقیا

4

بۆ من ڕۆژهەڵات

بەتەنیا فاتیمە و تاقە بەرزەکانی بوزای لێبوو

فاتیمەش وەکو ئەفسانە، وەکو با

چاوێکی دابوو بە ئاشقەکانی سەر زەمین و

چاوەکەی تریشی دابوو بە پەریەکانی ئاسمان

دەستێکی لە شانی گومانەکانی هاملێت و

دەستەکەی تریشی نابووە سەر شانی نەمریی

5

ئەوە تابلۆکانم سەیرکە بەر کێ کەوتوون

درەختێکی شکاوی سەر کەنار

کەناچە و نەوڕەسێکی زۆر

بەسەر تەرمەکەیا وەستاون

سەیری ئەو دووکەڵە لە کۆختێکی تەنیا

ڕەوە چۆلەکەیێ لە ساماڵدا سەما دەکەن

6

با دەروون ناخوێنێتەوە

تەنیا موریدی ئایینی جوانییە

ئاوڕ لە ڕێنوار داتەوە

گیانی پڕ دەبێ لە گریان

چانییە ئاوڕ ناداتەوە

با ئاوڕ ناداتەوە ڕێنوار ئاوڕ ناداتەوە نا نا

7

بۆ تۆ ڕۆژهەڵات بەتەنیا

فاتیمە و تاقە بەرزەکانی بوزای لێ بوو

کەچی بوزاش وەك حەقیقەتی زەیتی تۆ

دەستێکی بۆ ڕامانی جەنگەڵەکانی کەشمیر بوو

دەستێکیشی بەزەیی بوو بۆ قوتبەکان

چاوێکی خستبووە سەر خەڵوەتەکانی ڕۆحانی و

ئەوی دیکەشی یۆگای ئازارەکانی سەر زەمین

8

بەفر دەبارێ سەرما

وەك لاولاو بەگۆچانەکەی ڕێنوار هەڵدەگەڕێ

تەماشا کە ئەی با

ئەوە چ فەرتەنەیەکی جوانیت ناوەتەوە؟

سنوورەکانت تێکشکاند

ڕەنگەکانت تێکەڵاو کرد

9

ڕێنوار سەیری با دەکا

لەناو پاڵتۆکەی برووسکا

فاتیمە ئەی ئەمیرە جوانەکەم

ئەمیری هەموو ڕۆژهەڵات

10

فاتیمەش ئەمیری جوانەکانی ڕۆژهەڵات بوو

لە وڵاتی نوور

لەسەر مەرقەدەکانی بخوور

هێندە دوور بوو

نە دەستی فەلسەفە دەیگەیشتێ و

له عیشق دەرسی سووتانی پێ دەبەخشی
مەعبەدە پڕ بخوورەکان زەنگیان لێدا
11
ئای بای ئەشقیا ئەوە من بۆ کوێ دەچم؟
نۆڤالیس دوای تەواوبوونی ئەم دوو دێڕە مرد
منیش دوای فڕێدانی کتێبەکەم
لە ئاگردانی زارادا
12
ئێستاکەش چل ساڵم
چل جاران کەوتووم و ڕماوم
هەر جارەی چل پەنجەم
لە داخی ڕۆژهەڵات تەقیوە
هەر پەنجە و هەزاران برینی تیا زاوە
هەر جارەی چل شووشە
لە خوێنی کاستالیام پڕاوە
دەزانم سەفەری دەریای مانگ دەمکوژێ
13
ئێستاکە چل ساڵم، چل کەڕەت بەو شانەم
بەردەکەی ئومێدم بردۆتە ڕۆژهەڵات
چل کەڕەت بەردی من، لە لووتکە دێراوە
لەی دوورگەی پەپوولە و ئاگردان
کەوتوومە بەر بایێ، دەروون ناخوێنێتەوە
خەریکی ئایینی جوانییە
هەر کەڕەت چل هامۆن، ئارەقم ڕشتووە
کوانێ نوور، لە چاوی پڕ ئەشکی فاتیمە

14

ئێستاکەش لەبەر بای ئەو گۆڕە دوورانە
چل هەزار دێڕی خوێنم پێیە بۆ تابلۆ
چل تەغار لەشکەنجەی ڕۆحیشم
لەبەر پێی ئومێدت دەڕێژم
با کتێبی فڕاندم ئەیدۆست، بەڵام تۆم نەبینی
بۆ منیش ڕۆژهەڵات فاتیمە و بوزا بوو
مەعبەدی پیرۆزی ڕمان بوو
گۆڕستانی نوور و یەقینی خەمگینی و نەمان بوو
با دەروون جێ دێڵێ و ئایینی جوانی تەی دەکا

15

بەفر دەبارێ
ئاخر ناکرێ لەگەڵ بەفر پیلە بکەین
کە بگاتە نێو قەدی ڕێنوار
دەتوانێ تا پای ئاسمان خۆی فەرز کا
ڕێنواریش وەستاوە و
هەر سەیری ڤیگەری خۆی دەکا
کە با لە پاڵتۆی بروسکا، هەموویانی بەشیەوە

16

ئەو ناوە غەرقی غوربەت و سەدای پیانۆیە
پیانۆیێ لە ئاو
پیانۆیێ لە با
پیانۆیێ لە بەفر
نۆتەیێکی بۆ گریان
فەرموون بۆ ئەوەی جوانی هەبێ، ئێوە بگرین
نۆتەیێکی بۆ سەما

فەرموون بۆ ئەوەی نەوڕەس هەبێ، سەما کەن
نۆتەیێکی بۆ گۆرانی
فەرموون با وەڕسی نەمامکوژێ، گۆرانی بڵێن
نۆتەیێکی بۆ باخوس
فەرموون بۆ ئەوەی ئاهەنگ هەبێ بخۆنەوە
نۆتەیێکی بۆ ڕێنوار
بۆ ئەوەی نەمریی هەبێ، ئێوە ڕەنگ بڕێژن
17
بایێ لە ئەبەد
بایێ لە پیانۆ
بایێ لە ئاو
شنەیێکی بۆ بەشینەوەی جوانییەکان
نەبادا لە هیچی بمرین
شنەیێکی بۆ گواستنەوەی پێشانگای ڕێنوار
لەبادا کەسێ مەحرووم بێ
شنەیێکی بۆ بەرگەی ژیان
لەبادا وەڕسی بمانکوژێ
لافاوێ لە ژاڵە، لافاوێ لە ژەهر
شەپۆلێکی بۆ ڕمان
پیانۆ، با، لافاو
18
پیانۆ بۆ بالێ، بۆ خاتری گۆڕی عاشقان
پیانۆ دەروون ناخوێنێتەوە
بەدوای جوانی دەگەڕێ
لافاو بۆ نائومێدی ڕێنوار
بەفریش هەروا دەبارێ

چاوێلکەکەی ڕێنوار، تێکەڵی بەستەڵەك بوو
تابلۆکانیشی لە دەستی پۆستەچی با دایە
هەموو شارەکانی دنیا دەگەڕێ
ئەوە بای ئەشقیا بوو
لە پاڵتۆکەی برووسکا هەڵیکرد
کتێبەکانی ڕۆژهەڵاتی فڕاند

## کۆچی شمشاڵ

هاتیتەوە ئەوەتا
نە درەختەکەی دایکم گوڵی گرت
نە من لەبەر بارانی کتێبدا
فێری مەزمووری داود بووم
نە تۆش لە بەندەری مەنفا
خەونەکانی خۆت هێناوە
ئێستا بە سینەی کون کون و ڕوخساری تەم
لەبەر پەنجەرەی مناڵیدا هاوار دەکەم
ئاخر تەرمی سەرپشتی ئەو ئەسپە کەرەندیانە
ئەوەتا شمشاڵەکانیان، لەلای من جێهێشتووە
چ زوو چ زوو گەڵای ئاوازتان هەڵوەری
ئەوە چ زەمانێکی سەختە
سەرێ نابینم لە تەوقی پاییز ڕەها بێ؟
مەلەکان وەرنەوە
بچینەوە بەندەری سەفا
لەوێ بەسەر باڵی باراندا
دەچینەوە ئاسمانی جاران
لەوێ درەختی عەتری ئەوین
دەپرژێتە سەر پەنجەران
دڵمان دەبێتە عەترستان
با بچینەوە سەر ئەو تاوێرە بەردانەی
هێشتا فرمێسکی یای زینێ
شەوقی خۆیان دەدەنەوە پیرە بەندەنێ
لەلێرە شمشاڵ نەماوە

قامێشەڵان سەوز نابێ
دەنگ خۆشەکان باریانکرد
بەللوری دوا گۆرانی خۆیان هەڵوەراند
وەرە با بچینەوە سەفەری سەفا
بەندی گریان بڵێینەوە
ئاخ لە منێ ئاخ لە تۆیێ
لەبەر پەنجەرەی مناڵی هاوار دەکەم
ئەوە چ زەمانێکی سەختە
لە من و لە پیرە هەڵۆیێ
گۆڕەکانمان هێندە زۆربوون
گوڵ لەسەر گۆڕی کێ دانێین؟
نە درەختەکەی دایکم گوڵی گرت
نە من لەبەر بارانی کتێبدا
فێری مەزمووری داود بووم
نە تۆش لە بەندەری مەنفا
خەونەکانی خۆت هێناوە
ئەوە چ زەمانێکی سەختەن شەکەت بووین
وەك دڵۆپی شەونمی دارکاژی چیایان
ئەو بەستە وەك ژەهرە دەچڕین
مسۆگەر دەزانین بۆ مەرگە
کەوتووینە سەر زەمین، لەت لەت بووین
ئاسمان پڕبوو لەترووسکەی لەشکر و
برووسکەی شمشێران
هەر سوارە و لە تۆزی شەڕی تووش
خڵتانی خوێن دەبێ
هەر ئەسپی سورخنە و کوڕژنی پڕ سامە

ئەو ناوە دادەگرێ
هەر تەرمە و گەردنیان
وەك كوانوو سوور دەچێ

## وەرزێك لە گوناە

حیکمەتی مەستی بوو یا پەندی ئاگاهی
چوونەوە قەفەزی ئازادی و خۆیان کوشت
بەرلەوەی لە چەمکی شمشێری هەق بگەن
یەك یەکە خۆیان لە خەرەندان هاوێشت وباریان کرد
ئاسمانێك کەناری
ئاسمانێك لە عاج و سەدەفی سوڵتانی
لە کۆشکە تەنگ و تارەکانی ڕۆژهەڵات
دوای ئاوابوونی خۆر
چوونەوە ناو ماڵی شووشەیێ خەمی تاڵ
پیرۆزەی باران و قەدیفەی ڕۆحیان
بوو بەتەم بەسەر پەنجەرەکانی سەر زەوی
تەوقێکی ژەهر ڕێژ
جەللادی وەڕسی وەك گەڵا ڕژایە نێو سینە
هێشتاکە زۆر زووە بتوانین
لەبەر قاپی خەون بوەستین
قەدەرێ یۆتۆپیا و کۆمارێ مەستیمان پێبەخشێ
حیکمەتێکی قورسە پرسیار
لە ژێریا پشتم و هەزاران کتێب کووڕ بۆتەوە
لە دوورەوە گۆڵێ لە هود هود و بستە خاکێ لە نوور
دوورگەیێ لە هەرماسی سپی ڤاوستی
سەرابە سەراب نییە
کەنارێ ڕووت و قووت
نەمتوانی سەفەرم دوابخەم
بۆ خزین بەسەر ئەو جەستە نیلۆفەڕیانەی

وا لە تەك ئاگری دەروونیان
لە جەنگی سوهاقی شەربەتی شەهادەت دەنۆشن
پاڵەوانەکانیش شمشێریان سڕبووە
ئێستاکە لە میانی گریان و سەفەردا
تەنێکم شەلاڵی ئازار و تاوسی جوانیی
مێوانم لە کۆشکە تاق بەرزەکانی
باکوورەوە ڕاهاتووم
درەنگە سەفەری خۆش نەما
تازە من ناتوانم وەك جاران
لە بناری قەدەردا ڕامێنم
کتێبی پەندە پاراوەکان لە ئامێزما بگرم
چەند دوورە بتوانم ئەو هەموو جوانییە
لە شیری خلودێ نوقمکەم
ئەوەتا لە ژوورە دوورەکانی دەروون
ئەو سەری دۆستێکی دێرینی مەحاڵە
ئێستاکە درەنگە ناتوانم
لە ورد و خاشبوونی خۆم خۆشبم
بوتڵیان خاڵی کرد لە شەڕی جوانی
ئەوێستاش درەنگە و سەفەری خۆش نەما
کاتیشمان بەسەرچوو
تا لەگەڵ بیریا چەند شەکرێ بشکێنین
ئەم دەقەش تەواوکەین

## درەنگە سەفەری خۆش نەما

گەرەکمە جلی ئەو حیکمەتە فڕێدەم
تازە ناتوانم وەك جاران
لە بنار قەدەرا لە کەون ڕامێنم
ناتوانم وەك جاران
کتێبی پەندە پاراوەکان
لە ئامێز بگرم و وەك مەلێ بخوێنم
زۆر زووە بتوانم زمانی ئەو سیحرە داڕێژم
یا بگەمە کۆماری ئەندێشە
ئەوەتا لە حەپسە دوورەکانی دەروون
کە سەدان ئێرڤانای شیعری لێ دیل کردووم
بۆ ڕێگای نادیار بانگم دەکەن
ئێستاکەش درەنگە ناتوانم
لە وردوخاش بوونی خۆ خۆش بم
حیکمەتی مەستی بوو یا پەندی میسال
بەسەر ئەو مێزانە جێماون

## وەك كەنارییەكان هێمن

1

گوڵە هەڵووژەیێ لەژێر باران سەما دەكا
قەدەر گۆرانی بۆ دەڵێ و شمشێر بڕستی پێ دەدا
كچانی نێو كتێبی باران و با
خۆیان لەبەر تیشكی هەوەس دەشۆنەوە
ئەمە یاقووتە هەڵڕژاوە
یا جوانییەكانی قەدەرە
بەسەر ئەم كەونە پژاوە؟
ئێستاكە سەعات چوارە
كاتێكی خۆشە بۆ مردن

2

گوڵە هەڵووژەیێ لەژێر باران سەما دەكا
یاری بەقەدەری شاعیر دەكا
دار كاژێك شریخەی شكانی دەدا بەچیا
كچێ تازە بە ساماڵی پاییز ڕووی هەڵگرتووە
گۆرانی بۆ عاشقەكەی خۆی دەچڕێ
سەد ساڵە چاوەڕێی دەكا
دڵنیایە خۆی و ئەسپەكەی دێنەوە
جەستەیان بۆتە گوڵی دەشتاییەكانی جەنگ
ئاسمان ئەمڕۆكە تووڕەیە
ڕەوە ئەسپێ لەو گردە هاتنە خوارەوە و
خەرەند قووتی دان
كورژنی برووسكەداریان
بۆتە شمشێر مانگیان شەق كرد

## خەونی ڕژاوی پیاوێك

ئەمە درێژترین وەرزی سەمایە
لە نێو زیوینی قەدەردا
باران چەند بەتووڕەیی
ئەم کێڵگانە دەسمێ
دارستانەکانی پڕ تووڕەیی کردووە
دەبێ بازرقەی ئەم خوێنە
خەونی ڕژاوی ئەو سوارە بێ
خۆی دەکوژێ
ئەو ناوەی کردووە بە ئاگر

## بەدیار سەمای گوڵە هەڵوژەکانەوە

خودایە ئەمڕۆکە چەند عاشق
مەستن و گۆرانی دەڵێن
دەبن بە گەڵاو دەوەرن
ئەسپ سوارێ تیژتر لە برووسك شەقەقی خستۆتە سەر شان
باڵەکانی فڕینیان لێدەڕژێ
لە دواوە دەبن بە مەرجان
دەبێ شریخەی ئەم دارکاژە
کام هاواری ئەو سوارە بێ
تەنهاترین ماندووی کەنارە
نا نا بێهوودە نییە
ئەو گوڵ هەڵوژەیە
سەمایەکی وا مەرگاوی بە لەش دەکا
دارکاژەکان شریخەیان دێ
ئەوە تۆی ئەی با
فەرموو وەرە ژوورەوە

## کردنەوەی دەرگا

دەنگێ نابیسم
چرایێ دوور دوور دەسووتێ و دەشنێتەوە
ئەوە دەبێ کوڵبەی ئەو ژنە جوانە بێ
کە پێش تەمەنی خۆی کەوتووە
هەموو ڕۆژێ بەگۆچانێکی شووشەیی و
سیمایێکی نوورانی بەم ناوە گوزەر دەکا
هەموو ڕووناکییەکان لەگەڵ خۆی دەبا
دەبێ ئەو بێ ئا دەبێ ئەو بێ
ژنە جوانەکە
ئاسۆ لە شانیەوە هەڵدێ
کەنارییەکان خۆیان لە لمی کەنار وەردەدەن
ئەو ناوە دەکەن بەکەنارستان
ئەمە نهێنییە و تەنها با پێیان دەزانێ با
شمشاڵی فڕینیان دەژەنێ
ئەمە نهێنییە و تەنها با دەزانێ با
کە هات
بەهار لە دەم و چاویا سەوز بوو
ها ئەوەتا دەچێتەوە
کەچی بەفر سەری سپی کردووە
با دەیزانێ با
بینیم کە هەڵیکرد
گیانی شەڵاڵی ئەشك بوو بوو
دەبێ چ کۆستێ دڵی ئەنگوا بێ
با دەیزانی با

## قسەکردن لەگەڵ با

ئەی با، بای ماندوو
کە لە قووڵایی برینی مێژوودا هەڵتکرد
بۆنی جەنگەکانت لێدەهات
پشکووتنی گوڵەکان لەگەڵ خۆتا مەبە
بۆ ساتێک خۆت لە ئاوێنە بترازێنە
تا بزانم تۆ چی؟ لە ئەزەلی
یا لە قورقوشمی گریانی هەزار ساڵەی
تۆ چی؟ لە بریسکەی سەمای
یا لە خەونی جاویدانی
ماندوو نابێ و سەما دەکا
دار کاژەکان شریخەیان دێ
ئەوە تۆی ئەی با؟
فەرموو وەرە ژوورەوە

## شەڕ

گەڕامەوە، نەچووم ئەو تەتەراتە بدۆزمەوە
کە لە شەوێکی بەفرانبارا ونم کردن
زۆر نهێنی منیان پێبوو
نەچوومە سەر ئەو گۆڕە غەریبانەی
لە شەڕێکی خوێناویدا
خاك و خۆڵی ڕمی سواران دایانپۆشین
نەمتوانی چاویان دابخەم
بەجێمهێشتن
ئەو منالە گەنم ڕەنگ و قشتیلانەی
لە دوورەوە بەپەنجە بچووکەکانیان
هێمایان بۆ دەکردم
منیش لە زریانێکی تووشا ئاسێ بووبووم
هەموو ڕۆژەکانی عومری من شەڕ و مەنفایە
ڕۆژێ نەبوو بێ فرمێسك شەو بەڕێ کەم
تەقە نەیهێشت کتێبەکانم تەواو بکەم
تەقە نەیهێشت جارێکی دی دایکم
کراسە ڕەشەکەی فڕێ داو
گۆرانیەکەی جارانم بۆ بڵێتەوە

## باخچه هه‌ڵبزڕکاوه‌کانی مید

ڕۆحێك بوو له شووشه‌ی شکاوی
دوا قه‌تره‌ی مه‌ی ئه‌چوو
که بانگی ئه‌کردین ون ئه‌بوو
شاژنی مید هێشتا له خه‌و هه‌ڵنه‌ساوه
چه‌ند پریاسکه گوڵێ له باده‌م
له‌به‌رده‌م میره‌کان ڕیز بکا
به مشتێکی پڕ له گه‌نم و باوه‌شێ پڕ کتێب
کاسه‌یێ له شه‌ڕاب
به‌ره‌به‌ره‌ی ئێواره
که خۆی و شمشێرێك له بریسکه
زه‌مبیلێك له نزا
ئه‌گه‌ڕایه‌وه ئه‌و قه‌ڵایه‌ی
تاوێره به‌رده‌کانی له سیحرێکی شووشه‌یی و
گومه‌زه‌که‌شی له په‌لکه گیای ئه‌مری بوو
ته‌متوومانێکی شه‌ڕابی
ئه‌و ناوه‌ی له مه‌ستی ده‌گرت
مشته خوێنێ ڕژا
سروشت ته‌ژی گوڵی سوور بوو
گومانێکی ئاڵ و زه‌مزه‌مه‌ی یه‌قینێکی ته‌نك
دارستانی خاڵی کردم
خه‌یاڵی سه‌ری شکاندم
هاوارم کرد ئای ئه‌و ڕێیانه ده‌چنه‌وه کوێ؟

جۆباره غەمگینەکانی عەدەمن
هێندە نهێنی ئامێزن
بانگیشی تا دەهات خۆش دەبوو
هاوارم کرد تاجە بەخوێن شەلاڵەکەی مید
ئێستاش هەروا دەبریقێتەوە
بەدەم و دوێکەوە بانگی کردمەوە
ئەوسا دوا تیشکی ئارمووشینی خۆر
لە نەخشەکەی میدا
ئاوەکانی پڕ لە پەپوولەی پرسە و
تەتەری خانزاد ئەکرد
جانتای ڕێبواران و قاسیدانی
پڕ لە تێشووی گریان ئەکرد
بانگی ئەکرد: بگەڕێوە شەوێکی تووش
تووشتر لە هەنگووێنی گومان
کە هاملێتی لەنێو تەرمی خۆی ئەخنکان
تاریکتر لە مردن لەنێو قەفەزی ئازادی
هەتا زووە سوارەکان بانگکەوە
با ئەو هەموو تەرمە نوورانیانە
بەرنەوە گۆڕستانەکانی مێژوو
نەبادا نوور لەم وڵاتە قاتی بێ
هەتا زووە شمشێرەکانتان بکەنەوە شان
نەبادا بریسکەی گەنم لەم نیشتمانە نەمێنێ
ئەو مشتە خوێنە ڕژاوە

سەری پڕ لە ئومێدی ئەو سوارانە بوو
کە لە باخچەی یەقینەوە
ئەچوون بەرەو فەنابەخشی هەتاو
گەردەنی ئەو ئەسپە سوورخنانە بوو
لەبەردەم شمشێری زەمان
بەچاوی ئەبڵەق ئەیانڕوانیە لووتکەکان
مێژوو بوو بە قەفەزیان
ئەو مشتە خوێنە ڕژاوە
تاجە بە خوێنەکەی میدیا بوو
کە پڕشنگی خۆر لێی ئەدا و
ئاسنگەرانی دەرسیم و مەیتەرەکانی ئاگریداغ
خۆیان لەبەر گەرم ئەکردەوە
کە ئێستاکەش فەلەک لە دوای فەلەک
سوڵتانێ ئەیداتە دەست سوڵتانێ
لە کۆشکێ ئەچێتە کۆشکێ
سەدەیێکە ئەو بانگە
لە و تاجە ڕەش ناکرێتەوە
کە بە ئاوی شەوق نووسراوە
سەدەیێکە میرێ ئەیداتە دەست میرێ
لە کۆشکێ ئەچێتە کۆشکێ
شمشێرێ ئەیبەڕێنێت و تەختێ وەرینەگرێتەوە

## وەهم

ئەو جەنگاوەرانە چەند بە تاسووقەوە ڕادەکەن
تا بگەنەوە ئەو جەنگەڵانە و
بچنەوە سەر ئەسڵی خۆیان
چەند بەلەز ڕووەو کانی خوێن شۆڕ دەبنەوە
تا شمشێرەکانیان بشۆنەوە و
بۆ تاوێ دونیا ببینن
زەینی ئەوانە لە تەمتوومانی هەرماس بوو
دەروونیان لە مشتە کەفێك و
چەند مەترێ سەراب بوو
بازوویان لە گڕی وەهمێکی ئەبەدی
چاویشیان لە خوێنی ئینسان بوو
جەنگاوەرەکان شمشێری دەستیان شکابوو
بەڵام خوێنی شەڕ لە دەمارەکانیان چکی نەدەکرد
نیەتی تۆڵە و غەریزەی جەنگەڵی
لە ڕۆحیانا دەکفکفا
پێیان وابوو ئەم شمشێرە
پەیتوونێکە و بەرەو یۆتۆپیایان دەبا
بەرەو جۆگەڵەکانی عەدن و
ستوونەکانی ئیرەمیان پەلکێش دەکات
هەمیشە بەدوای ترووسکەی
ئەم شمشێرە ڕایاندەکرد
ڕایاندەکرد و ڕایاندەکرد و ڕایاندەکرد
کە لە غەیبستانەوە وەك هاوارێ، بانگی دەکردن

هەندێ جار تێکەڵاوی لوورەی گورگ دەبوون و
گورگ ئاسا ڕایاندەکرد
هەندێ جاریش خەرەندی گوناه قووتی دەدان
شەکەت دەبوون دەکەوتن
هەڵدەستانەوە و ڕایاندەکرد
کەچی دەستیان لە شەڕ بەرنەدەدا
لە یەکەم بەرەبەیانی مێژوودا
کە پڵنگ و مرۆڤ
لە پشت چارۆگەی زارادا
لە دەوری کورە بورکانەکانی ئەڵقەیان دەبەست
ئەو جەنگاوەرە بازوو کوتراوانە
بەسەر پشتی مۆرانەوە
هەر خەریکی بڕینەوەی دار و
سڕینەوەی ئینسان بوون
خەریکی بیر لێدان و
خەنجەر تیژکردنەوە بوون
کۆمەڵە گوێزانێك بوون لەناو ماڵی پاکیدا
چەند باقەبێنێکی ئەبەنووسی بوون
لەناو مەرکانەی نووردا
هەمیشە هەر لە جەنگا بوون
جەنگ جەنگ جەنگ
شیر و تیر ئیمامیان بوو
بازرقەی خوێن قیبلەیان بوو
جەنگەڵەکان نیشتمانیان بوو
جەستەی مرۆڤ بەرماڵیان بوو
نە شمشێریان فڕێدەدا و نە وچانیان دەگرت

هەمیشە هەر ڕایاندەکرد و ڕایاندەکرد
زەینی ئەوان لە تەمتوومانی شەیتان بوو
هەریەکە و کتێبێکی قەبەی
لە بارەی شەڕ و کوشتار لەبەر باخەڵ بوو
وێنەی هەموو مەتحەفەکانی جەنگ و
پاڵەوانەکانی سامۆرایی و
شمشێر وەشێنەکانی فتوحات
پەیکەرەکانی شەڕی تێدا بوو
هێندەی دیکە شمشێری دەستیان تێنووتر دەبوو
ئەو جەنگاوەرانە چەند زیرەك بوون
لە دەرسی کوشتن
ئەو جەنگاوەرانە چەند ئازا بوون
لە خوێن ڕشتن
ئەو جەنگاوەرانە چەند خێرا بوون لە ڕاکردن
ئەو جەنگاوەرانە چەند وەستا بوون
لە سووتاندن
ئێواران ئەو جەنگاوەرانە
لەبەر ڕەشەبا کۆ دەبنەوە و
زناری شەڕ دەکەنەوە
چەندین سەعات و سەعات
سەریان بەسەریەوە هەڵناگرن
جەنگاوەرەکان شمشێریان ورد و خاش بوو
شەکەت بوون، کەوتن، هەڵسانەوە
بەڵام هەر ڕایاندەکرد و ڕایاندەکرد و ڕایاندەکرد
تا تێکەڵی گەلە گورگی مێژوو بوون

## شیکار

ماڵێك بۆ هەمووان، ماڵێك بۆ جوانی
ماڵێك بۆ شایی، ماڵێك بۆ حیکایەت
ماڵێك بۆ ئێستا
ماڵەکەی هەموومان نە دەرگای هەیە نە پەنجەرە
ماڵەکەی جوانی کرایە کارگەی خۆڵەمێش
ماڵی شاییش ئێستا دیوەخانی پرسەیە
ماڵەکەی حیکایەتیش بۆتە مەتحەفی شۆڕش
ماڵی ئێستاش بۆتە ئەلبوومی شەهیدان
**
حیکمەتێکی کۆنینە، حیکمەتێکی پڕ لە نوور
حیکمەتێکی ئاگراوی، حیکمەتێکی تووڕە
حیکمەتی کۆنینەمان فڕێ دایە دەریا
حیکمەتی ئاگراویمان دایەوە زەردەشت
حیکمەتی تووڕەشمان کردە پاشا
قەمچییەکمان دایە دەست
**
کتێبێك لە باخەڵی شا
کتێبێك لەسەر ڕانی پیرێ
کتێبێك لە ڕەفەی دیوار
کتێبێك لەبەر ڕەشەبا
کتێبەکەی باخەڵی شا
نەخشەیەك بوو بۆ کودێتا
کتێبەکەی سەر ڕانی پیرێ خەونی دوارۆژ
کتێبەکەی سەر ڕەفی دیوار

هی دەستێکی پڕ لە نوورە
کتێبەکەی بەر ڕەشەباش هی نیشتمانی منە
**
ئیمارەتی سۆران کۆمەڵە سوارێکی سەرگەردان بوون
ئیمارەتی بابان کۆمەڵە شێرێکی کوێربوون
ئیمارەتی بادینان قەفتەی شمشێرێکی شکاو
ئیمارەتی ئەردەڵان کارگەیەکی بێ ئاگر
ئیمارەتی ئێستێشمان بێ تەیمان
**
خەمێك بۆ برین، خەمێك بۆ سنوور
خەمێك بۆ گەل، تاجە گوڵێك
خەمێك بۆ برین، بەشی هەموو برینەکان ناکا
خەمێك بۆ سنوور، دادی هەموو گورگان نادا
خەمێك بۆ گەل، ناکاتە دەمێك دڵپاکی
تاجە گوڵێکیش، بەشی ئەو هەموو شەهیدە ناکات
**
ڕەوە ئەسپێ، ڕەوە سوارێ
دەسکە گیایێ، باقە ئەستێرەیێ، من
ڕەوە ئەسپێ لە ترسی هەڵەمووت چوونەوە ئەشکەوتان
ڕەوە سوارێ لە خەرەندان هەڵدێران
دەسکە گیایێ لە ترسی سیس بوون دەگریا
باقە ئەستێرەیێ لە ترسی هەورە تریشقە داڕژا
منیش لە وەڕسی پیر بووم
**
کۆتایی شەو، سەرەتای سپێدە
دوورترین کەنار، قووڵترین برین

کۆتایی شەو دڵێ بوو شیعری تیا مرد
سەرەتای سپێدە شەوێ بوو مانگی تیا زا
دوورترین کەنار خەونێکە لە کۆڵانەکانی یوتوپیا
قووڵترین برینیش نیشتمانێکە لەبەر ڕەشەبا
گەڕانەوەی با، کۆچی مەلان
مەرگی شاعیر، ئاسمان
گەڕانەوەی با کاتێك بوو
گەڵاکانی چووبوونەوە ماڵ
کۆچی مەلان ئەو کاتە بوو
هەموو کۆشکەکان تەپی بوون
مەرگی شاعیر ئەو کاتە بوو
نیشتمان کەسی تیا نەما
ڕووخانی ئاسمان کاتێك بوو
باران کوژرا

## ئاگر وتی

هەمیشە بایێ هەڵدەکات
دەروونتان بخوێنێتەوە
هەمیشە لە نادیارەوە
شەبەیخوونێ هەڵدەکات
تارومارتان کات
هەمیشە کتێبێ هەیە پەشیمانتان کاتەوە
هەمیشە بوومە لەرزەیێ هەیە لوولتان بدات
هەمیشە وەسوەسەیێ هەیە قاوتان بدات
** *
ئەشکەوتێ هەیە بە درێژایی مێژوو چۆڵە
پەنجەرەیێ هەیە بۆ پاکی
بە درێژایی مێژوو داخراوە
تەوقەیێ هەیە بۆ دۆستایەتی
هەمیشە تەنهایە
کتێبێ هەیە بۆ سەفا هەمیشە داخراوە
ڕووبارێ هەیە لە شەوق
کەس مەلەی تیا ناکات
قومە ئاوێ هەیە بۆ عیشق
کەس نایخواتەوە

## کۆست

نامەی جەستە بەخوێنەکەتم خوێندەوە
پیاوی هەڵۆم تیا دەبینی
بە ناکامی چۆکیان دەدا
خەونی ئاڵی خۆم دەبینی هەڵدەوەرین
وەك خۆم وا بوو
هەموو شتێ لە نامەکەت
دارمان و بێ ئومێدی و ڕەشەبا بوو
ئومێد
کەنارێنکی شینی کاکۆڵدار بوو باڵیان بڕی
مێژوو دار کاژێکی سەوزی سێبەردار بوو
لە قەدەوە هەڵیانپاچی
خاکەکەشم جوانترین مێرگی سەر زەمین بوو
داگیریان کرد

## خۆڵەمێش

قەفەزی ڕۆحی خۆم کردەوە ئاوا بووم
هێشتاکە مەل مابوون بڕستیان نەشکابێ
داو داوە هەناسەی کەمتیار ئاوزینگی نەدابێ
تەونکێش هەر مابوون
دوا دڵۆپ ئارەقەی ڕوومەتیان
بەسەر میرابی خەونی پاشا نەچکا بێ
بای دەهات
دارگەزی ڕۆخانەی بن چیای دەهەژان
دەرگای لە قومری خوێن دادەخست
پەڕ و باڵی هەڵۆی
بەسەر تەرمی شاخان شل دەکرد
ترێی چاوی ڕەشی قڕژاڵی
پڕ لە تای کل دەکرد
هێشتاکە ماڵەکان هەر مابوون
گریان و پێکەنین لە مەزرای گەنمدا بچێنن
هەر مابوو بزنە کێوی
گرەو لە خۆری ڕاوچیان بەنەوە
لە شاخی یەکتری بزرمێن
بچنەوە سەر دەمی خەرەندان
تەرم بۆ قووڵایی و زیندووش بۆ ئەشکەوتان
بای دەهات
شمشێرەی سەر پشتی دەرگاکان
هەر سوار بوون
ئەشقیا نەچووبوونە قافی سەرکێشی

گورگی تووش بەکێو وەر نەبووبوون
پەنجەرەم کردەوە
هێشتاکە هەر مابوو دز دەمامك بدەن
خەنجەران لە کاڵان دەربێنن
تاژی لە ڕاوی کارمامزان بێنەوە
قاویتی ئەستێرە تێکەڵی زیوانی شەو ببێ
کاروانی یاساغی ڕێگەی دوور
بکەونە نێو دەمی ماشەی ڕێ
واز لە کەوڵە ڕێوی پشیە خەو بهێنن
قاچ و پێم نایە نێو
بوخچەی شەو ئاوا بووم
هێشتاکەش هەر مابوو
کەروێشك پاوانان جێهێڵن
کۆڕەوی قولینگان بگەنە جێ
چەم هەڵسا
ئاسمان و زەوی لێك هاتنە پێش
کە ئاورم دایەوە
چیم نەدی جگە لە کۆمەڵێ خۆڵەمێش

## دوای سەعاتی بیست و پێنج

ڕووبارێك بوو لە شیری سپی
فەنەرێ بوو لە درەوشانەوە
گەلەرێ بوو لە پەیکەرەکانی نەمریی
ئا لەوێوە سوزانا چەمکێ بوو لە نادیاری
حەقیقەتێ بوو لە هولامیەت
تاوسێ بوو لە لافاوی دارستان
مەعبەدێ بوو لە گوناه
ئاوێنەیێ بوو لە سامالّ
زنارێ بوو لە کەمەری عاشقەکان
گەنجەکانی گەڕەکی
دەخستە نێو توولەی فیراق
سوزانا ئێستێکە
قژە چەرکەسییەکەی سپی هەڵگەڕاوە
باڵای زراڤی
وەك کاژێکی بەر ڕەشەبا کۆم بۆتەوە
فرمێسکەکانی وشك بوون
سوزانا ئێستێکە لە دەروازەکانی ڕۆمادا
چاوەڕوانە و هەمیشە گوڵ دابەش دەکا
نەوڕەسەکان لەسەر شان و ملی دەنیشنەوە
ئاسۆ دەگاتە لێواری ڕووبار و
ئەوسا سوور سوور دەچێتەوە
سوزانا لە کوێی
ئێواران کتێبەکەم بۆ بهێنی و قاوەیەکم بۆ گەرمکەی؟
ئێستاکە وام لە نێو کتێبی سەد هەزار لاپەڕە

هەر ڕۆژەی لاپەڕەیەکی داغون دەکرێ
پاڵەوانەکانی دەچنەوە باغی حەقیقەت
ئەم ئێوارەیە تاجە گوڵینەکەت
لەسەر لینجانەی ڕۆحم دانێ
ئێستا من مەرکانێکم لە خەم
گۆڕستانێکم لە ترس
جەنازەیەکم لە ستران
یۆهانا لەبەردەم فڕنە هەزار بەهەزارەکانا
بیر لە تەواوبوونی کتێبەکان دەکاتەوە
ئەوساکە چەمکی بوون تامی نامێنێ
زەوی چۆڵ دەبێ و گۆرانی دەبڕێتەوە
بیر لە بەسەرچوونی وەرزەکان دەکاتەوە
گەڵا گەڵا گێلاسی چاویان
هەڵدەڕێژێتە باخی بەهەشت
سوزاناش بەسەر سیسەمەوە دەگری
چاوەکانی کز کز دەسووتێن
دەستەکانی توانای ڕاگرتنی ئەلبوومەکەیان نەماوە
سەیری پەنجەرە کراوەکانی ژوور دەکات
نە باێ، نە بارانێ
نە ڕێبوارێ، دنیا لە قیامەت بۆتەوە
ساتێکە هەموو شتێ لەبەر چاوی تار دەبێ
یۆهانا چووە سەفەرە سەختەکەی
خۆڵەمێشەکەی ڕژایە باخچەی هیتلەر
ئێستاکە هەر درەختێکی نێو بەرلین
دەست و پەنجە و چاوی کچانی پێوە دێ
عاشقە ساویلکەکانیش لە ژێریانا

گوڵ لە قژی فرێندەکانیان دەدەن
بەهارانیش کە شەونمی سپێدان
تك تك دەڕژێتە خوارەوە
جۆگەڵەکان دەیانبەنەوە پارکی نیشتمان

## یادستان

1

ئەوە قەت نەغمەی تۆ نەبوو

بام بۆ ناردی

مشتێ ئەستێرەی ڕژاوی هێنایەوە

مەلەکانی پرچی فریشتەم بۆ ناردی

گۆڵمێ ئێوارەی تەماوی

سەر گۆڕی تۆیان بۆ هێنام

ناچارم لێرە لەو سێبەرە پڕ لە سامە

ئەو سێبەرەی لە خەرەندەی ترسناکی قەدەر دەکات

بۆ تا ئەبەد تێکەڵی ئەو بایە ببم

کە لەلای تۆوە هەڵدەکات

2

گوڵی چیام پرژاندە پرچتەوە، گوناهم کرد

بەو عەترە تۆیان ناسییەوە

ئێستاش گۆڕەکەت هەر بۆنی ئەو عەترەی لێ دێ

3

لە نێوان نسکۆی بەردی بن مێژوو و

ستێر بارینی دوور وڵاتاندا

لە مەرگی کپ و لەسەرخۆوە ڕا

بەرەو مردنی توند گوڵمان دەگرت

ئەوسا من و تۆ لە بۆشایی بوون

لە بێ ئومێدی بێڕەزم و سەروا

شۆڕ دەبووینەوە نێو ئەو خەرەندەی

کەوا ڕووباری ئازارەکانی ڕۆژهەڵاتیمی

بەسەریا دەڕوا

## باخی فەنا

بارانێ بوو لە هەڵووژە
سوورە بایێ بوو لە زەمبەق
کۆمارێ بوو لە حەسرەت
دارستانێ بوو لە وچان
ئەفسووس مەرگ مەودای پێ نەداین
بگەینەوە باخەکانی خەڵوەت
تۆزێ باسی دارمان و
شووشەی شەهدی شەڕاب بکەین
شەڕابی مەرگی ئاسکان
کە دەچنەوە وڵاتی مسك
ئەفسووس زەمەنێکی چەند دژوار بوو
زەمەنی غەرق بوون لە ژەهری هەلا
زەمەنی تاپۆکردنی برین
لە سینەی پەڕەسێلکان
زەمەنێ لە گۆڕستانی دۆستان
کە چوونەوە باخی فەنا
بارانێ بوو لە کۆلارە و زەمانێ بوو لە شەبەق
کۆڕەوێ بوو بەدوای تەرمی باخۆسەوە
ئەو ئێوارەیە تەمێك بوو لە ژەهری هەلا
ئەفسووس چ مەزارێ
بۆ ئەم حەسرەتانە داگیرسێنم؟
گۆڕێکی جوان لە تەمتوومان
کێڵێ لە مەڕمەڕی گومان
ئاڵایەکی سەر بەخەم

پەرژینێ لە گوڵی بادەم
هەی داد هەی بێداد کەی دەگەمەوە
ناو لەپی گەرمی وچان؟
وچانێ هێمنتر لە شەوقی چاوی ئاسك
وچانێ لە پێستی سوورخنی ئەسپ
ئەسپێ لە خێرایی بروسکە
بروسکەیێ لە شەرارەی باران
بارانێ لە هەڵووژە
هەڵووژەیێ لە زەمبەق
زەمبەقێ لە شەهدی شەڕاب
ئەفسووس چوونەوە نێو باخی فەنا و
مەلەکووتی بیرەوەری

## شکستە ڕۆحییەکانی ئەخاب

سڵاو بۆ تۆ دەریا، سڵاوی ئەبەدی
منم شای بابل، خاقانی موقەددەسترین کەشتی
پارچەیێ ئاسمانم کردۆتە خوودە
خواتێکی ڕازاوە بە عاج
بخووری سەمەرقەندی
کەنارێکی مەرجانیی، شەپۆلێکی پیرۆزەیی
پێنج هەزار ساڵە کوڕی دەریا و خزمی شەپۆلە
تەنها لە گێژەن و لە هەڵەمووتا
دەگاتە کۆشکی نێرڤانا
ئەی سیحری هەمیشە تەنهای
سەر ئەم دەریا مەرجانییە
تۆ چیت هەتا
بایش لە ناڵە و وەحشەتی شەپۆلان ڕادەکا
نەوڕەسیش جار جارە، لە ڕقی تەنهایی
لە قوڕی کەناران خۆی دەکوژێ
دەریا ئەی زێدی ئەبەدیم
ماندوو بووم لە ڕاوی ماسیان
لە شەوی درێژی جووتبوونم لەگەڵ ئاو
ماندوو بووم لە گریە و هاواری
زەنگی کلێسا گریکییەکانی کریت
کە تەرمی جەنگاوەرەکانی دیرۆك
بۆ گۆڕستانی لە بیرچوونەوە بەڕێ دەکات
کێ ئەوەندەی قەدەرم بەسەر پشتی پاپۆڕ
ئەرشیدۆقی ناوە بەقۆچی قرشەوە

هەزاران جیوکوندای بەچاوی شینەوە
داوەتە دەم کەڵبەی حووتەوە
من و دەریا جیران بووین
سەرێکمان لە دارستانە چڕەکانی ئەفریقیا
سەرێکیش لەناو خوودەی دۆقە برسییەکانی لاتین
دەستێکمان لەسەر مەمکی خڕی ڕۆژهەڵات
دەستێکیش گەدایی
لە گەڕەکی بێ منداڵیەتی ڕۆژاوا
من و حووتە عەنبەرییەکان خزم بووین
پەنجەرەی پڕ مانای هەرماسمان دەشکاند و
تا ماڵی زۆر دووری خوا دەچووین
ماندوو بووم ئەی دەریای پڕ سەمای پاکی
ماندوو بووم، پێویستیم بەتۆزێ گریانە
ماندوو بووم، پێویستیم بەتۆزێ ژیانە
ماندوو بووم، پێویستیم بەسەد ساڵ تەمەنە
ڕزگار بم لەو ساتە کورتانەی درێژن وەك حەزیا
بچووکن زۆر بچووك
وەك ساتی ڕۆحدانی ماسیێ لە هەوا
دەگرییێم غەریبتر لە دەریا

## ئاوێنەی سێو فرۆشان

چۆن ڕابرد نازانم، نە پرسە و نە وەڵام
پریاسکەی هاوارم ڕژاوە
بێ دەنگیم وەك هەزاران هەزار لووتکەی دوور
بەگۆنای ڕەوەزا پژاوە
بوونە ئەو سەبەتە سێوانەی پەرییەکان
دەیخەنە سەر شان وماڵ بەماڵ ئەفسانە دەگێڕن
زۆر گریام، گریانم بارانێ بردیەوە سەر درەخت
مەشخەڵی دۆزەخێ لوولیدا
ئێواران پێکەوە دەچنەوە سەر ئاوان
سەیری ئاسۆ دەکەن
چۆن ڕابرد نازانم نە پرسە و نە وەڵام
پەلکە گیای ئاواتم دایە مەل
هەر مەل بوون کراسی ساماڵیان
لە جەستەی دەئاڵاند
ئەوەتا ناخی من وەك سینەی فریشتە
پڕ بووە لە عەتری خودایی
پڕ بووە لە ناڵەی قامیشی کون کونی
سەدان ساڵ جودایی
نازانم چۆن ڕابرد نە پرسە و نە وەڵام
پرس بێ، پێی دەڵێم ئەوین چۆن دەنەخشێ
ترێ چۆن تووڕە بێ وا تامی شەڕابی
سەد ساڵە دەبەخشێ؟
پرس بێ پێی دەڵێم، زستان هات نەهاتی
زۆر مەلم دی لافاو بردنی، لافاوی مەلان بوو

بەهار هات نەهاتی
تەرمی زۆر درەختم دۆزیەوە
زەهمانی دڵان بوو
هاوین هات نەهاتی
کراسی کانییان لەبەر من کردەوە
بینینی نەهێنیان لە چاوم سەندەوە
بیستنی شەفەقیان لە گوێچکەم کردەوە
ئەم وەرزە درەختی ژەهرێکی دەگمەنە
پرس بێ، پێی دەڵێم
دوا ئاوڕت وەك ستێرا داڕژا
تا ئەبەد تەنها مام
نزمایی بەربووە گیانی هەورازم
پرس بێ پێی دەڵێم
ئاسمان بچووکە و فڕینم گەورەیە
ون بوونت گەورەیە و دیاربوونم بچووکە
کێشەکە ئاسێیە
وەك ئاسێ بوونی مەل لە دڕکی ڕەشەبا
وەك ئاسێ بوونی ڕۆح لە داوی مەرگەسات
نازانم چۆن ڕابرد نە پرسە و نە وەڵام
وەڵام بێ، پێی دەڵێم
کاسەم بۆ پڕ کردیت ڕژاندت
ئەزانی خوێنم بوو
ئەوەتا ئەو کاژە چەند ئاڵە
سێوی مانگی زەردم نایە سەر زمانت
ڕووی خۆتت وەرگێڕا
ئەزانی دڵم بوو

ئەوەتا خۆرێکی چەند گەشە
هەموو ڕێگاییێکم بەبای وەشت گیاڕێژ کرد
هەناسەی ئاگری دۆزەخت پێوەرکرد
ئەزانی ڕۆحم بوو، ئەوەتا شاباڵی هەڵۆیان
وەڵام بێ، پێی دەڵێم
هەر من بووم ڕێی ژەهرم کلیلدا و
کلیلم فڕێ دایە دەریا و
ئاشووبم خستە نێو نەهەنگان
چەند سەختە مردنی نەرسۆسی و
بەعەشقی خۆ مردن
چەند سەختە ئاوێنە مەنفات بێ
ئاگر بووم فووێکی سەرمەست و شێتانەی ڕابوونت
منی لە خۆڵەمێش مارە کرد
سەرم بوو دەسووتا
باران بووم
باییێکی زڕمانا زەوی لە دڵۆپەی من تۆران
ئەشك بوو هەڵدەڕژا
هاوار بووم دەستێکی چەپاوڵ
جوانی هاوارمی هەڵتەکاند
دڵم بوو گۆرانی دەچڕی
تۆ ئاگات لێنەبوو لە دوای تۆ
چ خەونێکم سووتاند عشقم بوو
تۆ ئاگات لێنەبوو
سەری شالیری من چۆن کوێرایی داهات
هەستم بوو
تۆ ئاگات لێنەبوو

## دیل بوون لە ئەفسووس

ئەفسووس زەمانی پیاسەی خۆش نەماوە
شمشێرە ڕێیەکان ئاڵ دەکا
سووتانی ناو سینەی کتێبە
کتێبێك لەبەر تیشکی مانگدا
تاوێری کەناران بانگ دەکا
کچانی کەناری لەزەتێ
سینەیان دۆزەخی هەوەسە
دەچنەوە بەر دەرگای مناڵی
درێغا زەمانی شەهادەت
پەیکەر بۆ وێرانی ڕۆح دەکا
باوەشێ تیشك بوو جاویدان
چەپکێ بای توورە بوو لە عومری ترووسکە
لە ئاوی پڕ زەنای حیکمەتا دەخنکا
هەڵیکرد و ڕابرد و ڕوومەتی بەیانی داماڵی
ئەو ناوەی کردە خۆڵەمێشی ئەزەلی
سەفای ئەم زەمینەی خستەوە سەر شانی
چی ڕووناهی هەبوو گلیدا و ڕایماڵی
ئەوەتا لەوساوە هەموومان
کراسی پڕ سیحری کتێبمان فڕێدا
سەما لە ژێر شمشێر دەکەین

مەرگ مەودای نەداین من و تۆ
بچینەوە لێواری دەریا
سەما لەگەڵ کچانی مانگ بکەین
بریا ئەو ڕێیە ئەوەندە کورت نەبووا
بچینەوە پیاسەکەی ئێواران
لەوێوە بەسەر باڵی سیحر و سەمەندەر
ئێسقانی ڕۆحیشمان گوڵی مەستی بگرێ
مەخابن زەمانی پیاسەی خۆش بەسەرچوو
تا بچین لە بوخاری گەرمی هەوەسمان
چرای نێرڤانا هەڵبکەین
دەبوایە ئەو ڕێگە درەنگتر تەواو با ئەی پەری
مسۆگەر دەچووینە کۆماری ئەفلاتوون
کەشتیمان پڕ دەبوو لە سیحرو
دەروونمان لێوڕێژ لە جوانی و دەخنکاین
وەلێ ئەفسووس زەمانی پیاسەی خۆش نەماوە

## ژوورەکانی مەستی

وەك ڕەوە ئەسپێکی ماندوو
بەدەست قەدەری نادیار
شۆڕ دەبووینەوە ئەو ژوورانەی
سەفا بە ئێمەی بەخشی بوو
ئەو ژوورانەی خشتەکانیان لە سامالّ و
ستوونەکانیان لە مەڕمەڕی ئومێد بوو
شووشەکانیان لە ئاوی حیکمەت بوو
گەورە دەبوون، دەبوون بەکۆشکی بلوورین
بچووك دەبوون، دەبوون بەشارە مێرووله
نەرم و نیان بوون وەك چەند ماڵێك لە گیا
سەوز دەبوون  وەك چەند باخێك لە کەوەر
وەك فەنەرێك لە فەزا
چەند سیحراوی بوون ئەو ژوورانە
لە دوورەوە لە شەباقەی حەسرەتەوە
سەیرمان دەکردن
هەندێ جار تێکەڵی بولێڵ دەبوون
ئێمەش وەك کۆمەڵە مەیتەرێ
ئەسپەکانیان لە دەست چوو بێ
سەرمان لە سەبەتەی نەژنۆ دەنا
بەهەشتاوی شۆڕ دەبووینەوە ئاتەشگا
مشتێ جۆگەلەی سەبر بوون
هەر جۆگەلەیێ
شیعر و گەدای لێ مەست دەبوو
دەفری خۆیان سەر هەڵدەدا و بوزایان دەبەشییەوە

دەیان گەڕناس دەیان جوامێر، دەیان مێرخاس
لە قومێکا دەتوانەوە
کە خەیاڵ شەکەتی دەکردن، لە کوژانەی ئاگر دەچوون
بادی دەستیان تانگۆیان بوو
مەیپەرستان ماڵەکانیان لە هەور بوو
لە پێکی دووەم دەبوونە شای دنیا
ئەو ژوورانە دەروازەیان لە ئارمووش بوو
ئێواران وردە وردە پڕ دەبوون لە سەری ماندوو
ئەو سەرانەی جگە لە سەفا هیچی دیکەیان تیا نەبوو
سەرشار دەبوون لە دەستی ماندوو
ئەو دەستانەی جگە لە دۆستایەتی
هیچی دیکەیان لێ شین نەدەبوو
ئەو چاوانەی جگە لە جوانی هیچی دیکەیان نەدەبینی
ئەوسا دنیا پڕ دەبوو لە نوور و بخوور
لە بۆنی ئەو بخوورانەوە بوزا خۆی دەکرد بەژوورا
سڵاو، ئێوارەتان باش ئازیزترین موریدانم
کە دەگەڕێنەوە حەقیقەتی خۆتان
پەنجەکانیان ئاهەنگیان لێ هەڵدەستا
لەو ئاهەنگانەوە داود مەزامیرەکانی خۆی هەڵدەپڕژاند
سڵاوتان لێ بێ عاشقەکان:
شەکەت بووم ئەوەندەی بناڵێنم
هاتوومەتە ماڵی ئێوە تۆزێ لاتان بحەسێمەوە
چاوەکانیان برووسکیان دەدا
لەو برووسکانەوە زۆربا دەهاتە ژوورەوە
سڵاو هاتووم شەلاڵی سەما بم
دڵەکان شەرارەی پشکۆیان لێهەڵدەسا

لەو تەمە موقەددەسانەوە شیعر دەهاتە ژوورەوە
سڵاو، مەخلووقە جوانەکان
چەند سیحراوی بوون ئەو ژوورانە
دڵیان بۆ یەك دەکردەوە
دڵێك دەبوو بەکانیەکانی ڕۆژهەڵات
کچان بەدەوریا کۆ دەبوونەوە
کانییەك بۆ شەوق کە دەچووینە خزمەت جوانی
کانییەك بۆ ئاو خواردنەوە
کە سەفەرمان هات و نەهات بوو
کانییەك بۆ مەلەی جوانان
کە ئەو ڕۆژە دنیا ڕووت و قووت
کانییەك بۆ تەقینەوە، کە بەهار بە برینداری ڕابرد
دڵێك بۆ گریان
گریانێ هی دۆزەخەکانی سەر زەمین بوو
گریانێ هی بەهەشتە دوورەکانی سەر زەمین
گریانێ هی تەنیا بوونی ئینسان بوو
گریانێ هی وەڕس بوون
دڵێك پڕ شایی کە پرسە سەردەستەی ڕێ بوو
دڵێك پڕ ڕامان کە ژاوە ژاو سەرداری دنیا بوو
دڵێك پڕ حەسرەت کە تەمەن بەشی خۆشی ناکات
چەند سیحراوی بوون دڵەکانی نێو ئەم ژوورە
خودایە ئەم هەموو دڵانە چۆن بوون بەئاو؟
وردە وردە خۆیان لە گوناه هەڵدەتەکان
ئەو گوناهانەی وەك مارەزیو
ڕایان دەکرد و ئەو ناوەیان جێ دەهێشت
ئەوەی دەمانەوە چەند باڵە فریشتەیەك بوون

که دنیا بەهۆی ئەوانەوە بەردەوامی دەدا بەخۆی
دەبوونەوە مرۆڤە ڕاستەقینەکەی جاران
دەمامکەکانیان ورد و خاشدەکرد
دەگەڕانەوە ئەو ڕۆژانەی
که بەڕووتی هاتنە سەر زەوی
چاویان پڕ بوو لە تیشك
بەپاکی هاتنە سەر زەوی دڵیان پڕ بوو لە بەرائەت
بەگریان هاتنە سەر زەوی زمانیان
پڕ بوو لە شیری حەڵاڵ
بەحیکمەت هاتنە سەر زەوی
هزریان پڕ بوو لە یەقین
تیشك تۆرا لەو ڕۆژەوەی
خەنجەر لە دواوە وەشێنرا
شیری حەڵاڵ بڕاویەوە
لەو ڕۆژەوەی مەمکی کچۆڵان پڕ کرا
چەند سیحراوی بوون ئەو ژوورانە
قسە پڕ دەبوو لە شەکر
ئەو ناوە دەبووە پیاڵە چایێ
هەموو لێیان دەخواردەوە
دڵیان لە هەموو قسەیەکی ڕزیو
لە هەموو گەڵایەکی سیس
سپی دەبوونەوە وەك بەفری دوندەکان
ئەو ژوورانە لە چەند شارێکی شمشاڵ دەچوون
شارێکی پڕ تاق وپەنجەرە و تاق
لە هەر تاقێ ئاوازێ، لە هەر پەنجەرەیێ عاشقێ
که شەو تەك تەك لە سەفاخانەی ژوورەکان

**ماڵاوایی دەبیسترا وەك کەمانێکی سەرخۆش**
**لێوان لێو دەبوون لە ئەوین**
**سەرشار دەبوون لە ئازادی**
**ئەو ژوورانە ژووری شەراب بوون ئەیدۆست**

## خەڵوەت

1

شەوێکیان ئاگری خەونی خۆم
لە سێوی دڵ بەردا و خانەقام جێنەهێشت
ئەستێرەم یەك یەکە بە کتێبی دانتی ئاوا کرد
مانگ لەنێو درەختی ئاسماندا
ئەوینی شەلالی خۆی دەکرد
خاتوونی تێکەڵی دوا قومی نەی دەکرد
ئەو شەوە ئاگرێك لە دڵما داگیرسا
چوومە نێو شیعرێکی ئەبەدی
کە سواری بەلەمی دڵم بووم
دار ئالآ و خاك و خۆڵ، خانەقا چۆڵ و هۆڵ
لە ڕوخساری گەشی نێرڤانا تواینەوە
لە نووریا داگیرساین
لەو سەرە چووینەوە ڕێی باریك، دۆڵاو دۆڵ

2

کە دوێنێ منتان دی لە کتێبی شەفەق
سەری خۆم دادێنا
لە کەشتی سەرخۆشی ڕامبۆدا گوڵاوم پیا دەکرد
لە سەمای ئەو دیوی هۆشمەوە
تێکەڵی مەشخەڵی ڕێ دەبووم
ئێستاکە پیریەتی سووتاندی
کەوتوومەتە پاوانی ناو ساڵان
من وشیعری سپیم
لە کەزی درێژی تۆ ئالاین

## شەقامێ لە ئاسمان

1

خودایە بن باڵم بگرە و مەهێڵە چیتر بکەوم

ڕۆحم پڕ بووە لە خەرەند

دیقەتم لە خەتەر دایە

دیدم گەورە و زەمین بچووك

شەوم کورت و خەونم درێژ

چرام کز و ڕێگەشم لێژ

2

خودایە بن باڵم بگرە و مەهێڵە چیتر هەڵوەرێم

تەمەنی من کورتە و دەزانم ڕۆژێ دێ

کۆڵانێ لە زەوی ڕووبارێ لە لالش

جۆگەیێ لە چیا چاوەڕێی من دەکا

3

من بۆ خۆم دڵێکم لە ئەوین چاندووە

دڵ نییە سەراپای وجودمە

شەوێکم لە لالش هێناوە

شەو نییە کانیا سپیە

4

من ڕەنگم لە ڕەنگی بارانێ ڕشتووە

لە بەهەشت باریوە

من دەنگم لە دەنگی گریانی شمشاڵێ هەڵچووە

لە پەلکی پیرۆزی نەیستان خولقاوە

گۆرانی و گریانم تێکەڵی نەرمە بابێ دەبێ

دەچنەوە سەر گۆڕی عاشقان

6

چەند مەستم خودایە چەند مەستم

ئێستاکە هەر دەڵێی بۆ شیعر خوڵقاوم

بەیانیم جریوە و نیوەڕۆم گۆرانی

7

تەمەنی من کورتە و دەزانم ڕۆژێ دێ

لە ژێر ڕێژنەی گەرمی بارانێ

یا لە بەردەم هەرای قاوەخانەی مەچکۆ

یا لە خەمی شکانی شووشەیێ لە شیعر

ئەو ڕۆحەم دەژاکێ

8

چەند پەستم خودایە چەند پەستم

ئێستێکە هەر دەڵێی بۆ مەرگ خوڵقاوم

بەیانیم خەمێکە لە کەناری ئاگر

نیوەڕۆم شینێکە لە حەسرەت

ئێوارەم کۆستێکە لە گۆڕی ئازیزان

شەویشم خەونێکە لە کابووس

9

خودایە بن باڵم بگرە و مەهێڵە چیتر ئاوا بم

ڕۆحم پڕ بووە لە درز و دڵم پڕ بووە لە شکان

دیدم گەورە و زەمین بچووك

ڕۆحم پڕبووە لە درز، شەوم درێژ

چرام کز و ڕێگەشم لێژ

بەردی مراز

خۆزگەم بوو خەونی خۆم
بەڕشتەی نادیاری ڕۆحەوە هەڵواسم، باڵگرێ
ئەسپی با، لە گەڵای جەستەی خۆم تاو بدەم
بارانی زمانم لە زەوی کەفردا
بخەمە ڕێژنەی ئاڵ، برینم تۆمارکا
باشوکەی قەڵایان لە بادا نوقم بوون
نەوڕەسیش لە هەڵەی بەفردا
تا هەتا بزر بوو
با لاولاوەی پەنجەم بەسەر وشە هەڵگەڕێ
با پڵنگی ناخم
بچێتە بەر نووری ترسێکی ئەزەلی
وەرە فریام کەوە
هەوێردەی ڕوانینم لە پەرێزی زەردی ئەندێشەم
باڵای مشت فڕینی دوور بووە
کاروانی پرسیارم بدەمە دەست مەلی کام
ڕەوەی ئاسێ بوو لە دەریا؟
ئەوەتا سەری بێ ئەشکەوت و
مەلی بێ ئاسمانیم
ختمی بای نێوانی
مەلەکووتی گریە و ئاهەنگی مەنفایە
لە باوە هەڵمکرد، کە هاتم تەنیا بووم
نوورێکی قووڵایی زناران
لە باسك و ڕوومەتی من ئاڵا
چی پارچەی بڵاوی ڕۆحم بوو
لە بریقەی پڕ نازی تاوسێ یەکی گرت

چی ترێیترووسکە ئامێزی سەرم بوو
لە جامی سەرمەستی خرۆشا
دامەوە نێو دۆڵ و هودهودی نوورانی بڕیارم دایە پێش
هەر مەل بوو لە شانم هەڵکورما و
ڕووبار بوو لە فرمێسکی کانی خواردمەوە
لە باوە هەڵکردن چەند سەختە
لەسەرخۆ ئێوارەم با لاولاوەی زەینی پیرۆزم
لە دینی شیعردا سەرخۆش بێ
ئەی ڕەهابوونی ئاڵ درەنگە
مەرگی من لەنێو کام کەلێنی زیندوویتی ون بووە؟
بێزارم لە جادووی ئاگاهی، ئەو دڵەم پڕ
لەماینی زەردی ئەفسوونی مەی بوو
ژەهراوی وەڕسیم دەرخواردی کام گەڵا مێو بدەم
شەڕابی ئەزەلم خەستتر کا؟
هوشیاریم مەست بکا
لەسەرخۆ ئێوارەی ئازیزم
دامرکانی ڕۆحم لە گڕی چ شیعرێ تاو بدەم؟
یا ئەسپی سورخنی ئەو بایە
لە گەڵای جەستەما ئاو بدەم
لە باڵێکا فڕینی ناخم لە زیوی هەڵۆ دائەڕێژم
هەزار ساڵ بەر لە خۆم ئاسمانی بڕیبێ
لە باڵێکا تووکی شەپۆلم لە ڕووبار دەرئەکەم
هەزار ساڵ پێش ئێستا سەرچاوەی
لە ئاوی ئەلیاسدا کڕیبێ
هەر ئەبێ دەستم لە ڕوومەتی ئەو سێوە
شین ببێ و لەتی کەم بۆ تاوێ

گەردەنی قوڵینگی بەفراوی ڕوانینم
لە کێردی با و بۆران ساوبدەم
ئەوەتا سەری بێ پەناگە و مەلی بێ فڕینم
نوقمی بای مەلەکوتی گریە و ئاهەنگی مەنفایە

1

دەگەڕێم دەستم لە پرچی هەور گیر دەبێ
بارانێ توندوتیژ دادەکا
پێم دەڵێ پاییزان گۆرانی
بۆ گەڵای وەریوی درەختی من بڵێ
نهێنیم گەورەیە
پەرچەمی ڕەوەزە شاخەکان
لە خوێنی پرسەدا ئاڵ دەکا
دەگەڕێم دەستم لە ئاگری چرایەك دەسووتێ
پێم دەڵێ پاییزان با ڕاگرە
بالۆرەی منی هەڵگرتووە
پێتی لێ فڕاندووم
نە باران ئەمجارە دادەکا
نە ئاگر کوختەکەم ئاڵ دەکا
ئاوازم پڕ گریە و ناڵەیە
وەردی ئەو دڵەی تۆ پڕ لە باران دەکا

2

دەگەڕێم کتێبێ دەستی دیدگام دەگرێت و ڕادە بێ
دەمباتە درەختی ساماڵ و وشەی ئاڵ
پێم دەڵێ گوڵاڵەی ڕوومەتی ئۆرفیوس
نەماوە و هەڵوەری
پەندور و سێتاکەی ژێر پەنجەی
کەوتە سەر شەپۆلی دەریای قووڵ
بگەڕێ بەدوای ئەو ئاوازەی

له ژێی ئەو پەندورە هەڵدەچێ
بگەڕێ بەدوای ئەو گۆرانییە نەمرەی
لە دەمی شەپۆلا گڕ دەگرێ
نە دەنگم دۆزیەوە
نە پەندوری ئێوارەی شاعیریش
من و ئەو دڵەی خۆم چووینەوە
ئەو گۆڕەی هی جەستەی مێژووە
3
ئێستاکە لە دەریای بێ تەهی شیعری ئاڵ
هەستێکی بێ باڵم
ئەستێرەی خەفەتم ڕەهێڵە ونی کرد
ئای میداس پەشیمانی خۆتە بۆتە زێڕ
کۆرپەکەت ڕوومەتی شەوبۆی
خۆی بۆ مەستیت کردە خێر
تەلارت پەیکەر و داستانی بێ گیانە، بۆ ناگری؟
پەشیمانم لە ئارەزووی خۆم
بمدەوە سروشتی جارانم
با هەناسەی ساردم تێکەڵی زەمەن بێ دێڕ بەدێڕ
4
باڵیگرت ئەوەتا شین دەچێ
تێکەڵی سامالی شین بووە
دەنووکی سوور دەچێ و
تێکەڵی ئاقیقی سوور بووە
لە کوێیە گراوم من خوێنم دەسووتێ
لە نادیاری شووشەی سیمایا
بڵندیم کەوتۆتە خەرەندی نەویان

لووتکەشم دەسووتێ لە زەوی
ئەشکی هەردوو چاوم
تێکەڵی پشکۆی گەرمی دەروون بۆتەوە
لەو سەرە پڕ بارە و ئەو دڵە پڕ سۆزەم
یەکتری ناگرن
بوومەتە دوو جەستە
جەستەیەك ئاوەز و ئەویتریان سۆزە
لە میانی پەرەنگ و کڵۆ بەفری پەڕۆ
پەڕی ئاڵەکۆکە برینم
تا پەڕەنگ دەسووتێ
بەفر ماڵاوایم لێ دەکا و دەبێتە شلێوە
هەورەکەش دادەکا و لافاویش هەڵدەکا
تەمەنم دیماهی دەبەخشێ
5
ڕەوێ مەل درەختی ماڵەکەمیان داگرتووە
کامەیان ئەسپی ئەو دڵە تەنگەی منە با تاودا
دەگەڕێم
دەستم لە پرچی هەور گیر دەبێ و بارانێ دادەکا
دەیگەمێ و نایگەمێ، هەموویان باڵدەگرن
بۆ ئەوبەر هەڵدەفڕن
کچەکەم باڵی گرت ئەوەتا شین دەچێ و
تێکەڵی ساماڵی دوور بووە
دەنووکی سوور دەچێ و تێکەڵی ئاسۆگەی
بێ پەنا و سوور بووە

## پەیتوونی شەرابیی

مناڵیی باوەشیك ئەندێشە و ئەزەلە
سەبەتێك جوانییە لەسەر پەلکی سێودا
مناڵیی شارێکە بێ دەرگا و پەنجەرە
بناغەی ئەوینی لەسەر گیای حیکمەتە
لە نەوای شمشاڵی شکاودا ڕووچووە
لە شەهدی زۆر کۆنی شەڕابدا دەپشکوێ
بەسەر پشتی زیوی پەیتوونی شەرابیی تێپەڕی
بێ سڵاو
بێ بزە
تا دەهات لە چاوان ون دەبوو
مناڵیی

## مەچكۆ

مەتەڵێكە لە قەترە قەترەی یادگار
شووشەیەكە لە بەرائەتی منالّی
شۆخە ژنێكە لە شەڕە چەقۆی نوێخوازی
پەنجەرەیێكە دەڕوانێتە هەموو دونیا
هیچ شوێنێ لە مەچكۆ ناچێ
شەمەندەفەرێكە لە سیحر
لە ژاپۆنەوە كابووكییەكان بۆ مەشق دێن
هەموو ساڵێ چەپكێ لەم سیحرە دەدزن
كە وەك نوور لە دیوارە پانەكانی هەڵدەسێ و
جار هەیە لە ئەوروپاوە بۆ قاوەیەكی مەچكۆ دێنەوە
جاریش هەیە هەر لەبەر خاتری چایەكەی تەحسین
سیلان لە پێدەكەن و دێنەوە ڕیزی كورسییەكان
لە بن ستوونە ئەفسانەییەكانی مەچكۆدا
ئەوروپا دەبێ بەهەڵم و پاریس دەبێتە كەلاوە
ئەوانەیش كە دەگەڕێنەوە هەر بەتامی ئەو چایە دەژین
مەچكۆ كۆنە خانێكی ژێر قەڵای هەولێرە
فرمێسكەكانی میدیای تیادا
وەك وردە شووشە دەبریسكێنەوە
ئاشوور هات یەكەم قەتارەی لێرە دابەزی
بابل هات شێوەی ستوونەكانی ژوورەوەی دزی
ئێستاش بەم ستوونانەوە ماون
كەچی مەچكۆ ساڵ بەساڵ جوانتر دەبێ
كەرپووچەكانی پتەوتر دەبن
پەنجەرە و تاقەكانی

هەتا دێ شێتەکانیشی زیاتر دەبن
ساڵانە لە فەرەنساوە جالییە و دەزگای فۆکۆ دێن
تا پەی بەسیحری وان ببەن
مەچکۆ گەورەترین حوجرەی زانستی دەلالەتی لێیە
لاڵەکان بەڕێوەی دەبەن
گەورەترین ئەنیستیتۆی هونەری لێیە
دۆمەکان بەڕێوەی دەبەن
لە کوفە و نەجەفەوە لە مەغریبی مەعریفەوە
لە ڕۆلان بارتەوە دێن دەیگۆزنەوە
کەچی مەچکۆ تەواو نابێ و تەواو نابێ
سووچێکی تایبەتە بەلانەواز و
جەزرەبە دراوەکانی دەروونی
فرۆید هەتا ساڵانی دواییش لیژنەی دەنارد
تا کتێبی هوڕێنە و خەونی تەواو کرد
ئای مەچکۆ تۆ یۆتۆپیایێکی چەند خۆشی
تۆماس مۆر و فارابی
لە ناوەڕاستی سەدەکانی شازدەهەمدا

بەکەشتییە سەرخۆشەکەی ڕامبۆ هاتن
سەبەتەی دوو کتێبیان لێ پڕ کرد و ڕۆیشتن
بەڵام مەچکۆ بنی لە بەحری قەڵایە و تەواو نابێ
شاکان وەزیرەکان، گزیرەکان
بۆ قومە ئاوێکیش بێ سەریان لە مەچکۆ هەر داوە
تەنانەت زۆر جاران عەسکەرتارەکان
هەناسەی سارد هەڵدەکێشن
دەڵێن بریا دانیشتوانی ئەم شارە باین
مەچکۆ شارێکی ئاڵۆزە شاعیران دەزانن چییە

*لە قاوەخانەی مەجکۆدا - شێت،کەڕوڵاڵەکان،پەککەوتە،شاعیر
ەکان،نوێخوازەکان، دۆمەکان، هەموویان شوێنی تایبەتی خۆیان هەبوو.

## ئەی دژوارترین دۆست

1

ئەی دژوارترین دۆست فریام کەوە
سەرم پڕ گەڵای سپی بوو
دەمیشم پڕ لە فووی شمشاڵ
مەنفایێ لە جوانیم بدەرێ
دۆزەخێ لە شووشە بانگ دەکا
بەهەشتێ لە ئازار
دارستانێ لە ئەشك و گومان

2

لەوێوە جوانییەکان کە وەك عەتر و شەڕاب
لە شووشەی منالّیمان ڕژان
گەڵا سەوزەکانی نێو ڕۆحم هەڵوەرین
بێزار بووم لە فەل و
لە تەونی کۆمیدیای قولابی
فریام کەوە ئەی ساتێ درێژتر لە سەدە

3

ئێستاکە بۆ وارێ دەگەڕێم
بچووك بێ بەقەد هێلانەی مەل
بۆ دۆستێ دەگەڕێم پاکیزە
بەقەد پاژنەی منالّ
ناتوانم ئەو هەموو برپایە
لە سەرما هەڵگرم
ناتوانم درۆیە ناتوانم

ئەو وڵاتە پەرشوبڵاوە بخەمە سەر شانم
ئەو هەموو فرمێسك و شكەست و هاوارە
لە كێ من دەتوانم بیانخەمە كۆڵ و
بەم شار و ئەو شاریان بگێڕم
درۆیە ناتوانم

4

ئەی دژوارترین دۆست
ئەو دڵەم لە عیشق چكی كرد
جەستەشم تەژی بوو
لە گەڵای ڕزیوی بێزاری
فریام كەوە
ئەی دادڕەسترین جامی شەراب

## حەڵاڵتر لە شیری دایك

1

لەی درێغا کە زناری عیشقت فڕێدا و
کەمەربەندی ڕقت بەستا
ئەی جوانترین جەنگاوەر
لەو خەنجەرە زیوپین و ئاوپیە دەکەی
کە بەسەر برینمەوە سەما دەکا
ئەفسووس لەگەڵ یەکەم شەرەری تووڕەییت
پیری مەنفات کردم
لە زیندانی بەفرانباری نێو سینەتا
تەوقی دیلیت لە مل کردم
ئەفسووس لەگەڵ تامکردنی
یەکەم قەترە شیری گوڵە گەنمەکانت
لە بەهەشتی تۆ دەرکرام
تەنها لەم کەونە مامەوە
کەی ئەو شمشێرەی نێو دەستت فڕێ دەدەی؟
وەرە خوێنم حەڵاڵت بێ
حەڵاڵتر لە شیری دایك
بەڵام ڕمی هەزار تیغەی
عیشق و عەزابت بەرەوە
لە ئەڵماسی ڕۆحی ورد و خاشی مندا
شەرابی ئەبەد هەڵمژە
گەردنی باوکت ئازابێ
بەڵام تەنها قاپە خەونێکی مناڵیم بۆ بێنەوە

2

کەی ئەو شمشێرەی نێو دەستت
تووڕ هەڵدەدەی
شتە جوانەکانت لەبیر بردمەوە
کە لە مەزاری منالّیمەوە
دێ بەدێ و گۆڕ بەگۆڕ و شار بەشار
نێرڤانای من بوون
درەختی شووشەییت شکاندم
ئەی جوانترین جەنگاوەر
بەسەر ئەسپە شێی دڵمەوە
کتێبەکانت پێ سووتاندم
ئەی جوانترین تزار
ئەی خۆشترین زیندان
ئەی زیندانیترین خۆشی
وەرە شمشێری دەستت فڕێدە
با بچینەوە هێمنی

## تا ئەبەد خاچ

1

لە پەنجەرەی ئەو هەناسە ساردانەوە
کە لە دارستانەوە دەهاتن
تێکەڵی بایەکانی خوێن دەبوویت

2

چرا بەشی بیناییم ناکات
کتێب بەشی ڕوانینم ناکات
ئاسمان بەشی فڕینم ناکات
فرمێسك بەشی جوانیەکانت ناکات

3

ئێستاکە بە تەنها مایتەوە
بەیانیان بە کراسێکی سپی و
دڵێکی سپی
بەسواری ئەسپێکی سپی
سەرهەڵدەگری
ئێوارانیش بە فرمێسکێکی ئاڵ و
بە تاسەیەکی ئاڵەوە دێیتەوە

4

جارجارەش لە چاوەڕوانی میناس دا

سەیری ئەملاو ئەملات دەکەی

دەڵێی ها ئەوەتا گوێم

لە سمی ئەسپەکەیەتی

ئێستە نا ئێستا دێت

دەستم دەگرێ و

دەمهاوێتە سەر پشتی خۆی

دوور دوور دەڕۆین

5

بەسەر ئەو کەنارانەوە گوزەر دەکەین

یادەکانیان لێ زەوت کردووین

دەچینەوە لای ئەو کۆشکە تاق بەرزانەی

لەوێوە سەیری بەرزەخمان دەکرد

ئێستاکەش وێرانە خاکە

6

دواجار

بە قردێلەیەکی ڕەش و

بە خەمێکی ڕەشەوە

کراسە سپییەکەت لوولداوە

ئەسپە سپییەکەت لە دواوە دەڕوا

دڵە سپییەکەشت سارد

هەر دەڵێی

ریشۆڵەیەکی ئەبەنووسی نێو بەفری

## کتێبە جوانەکانی قەدەر

بەر لەوەی بگەینەوە باخچەکەی ساوایان
قۆغە جوانەکانمان پڕ لە شیر کەینەوە
بەر لەوەی دوا چایەی ئێوارە
لە نێوان ستوونی دیرۆکیی مەچکۆدا بخۆینەوە
بەر لەوەی لە ژووری دووکەڵدا مەست ببین
قەدەر دێ خۆیمان پێ ناس دەکا و ڕادەبرێ
لە دوور ڕا ڕەفتە ڕەشباوەکەی هەڵدەدا و ون دەبێ
قەدەر هەمیشە بەر لەوەی سپێدان
لەناو زیوە ڕژاوەکانی دارستان
کتێبی دوێنێمان کەینەوە
یا قەیتانی پێڵاوەکانمان توند بکەین
بەر لەوەی بچینە سۆراغی
وێنە سووتاوەکانی ڕۆح
بەر لەوەی بووك ستیانەی خۆی بکاتەوە و
لە چاوەڕوانی گۆدۆدا
ژوور تژی خورپەی دڵ بکا
قەدەر لە پەنجەرەکانەوە دێتە ژوورەوە
وەك خەونێك لە شیر و
کوگایێ لە تیغی بڕندە
وەك سوارێکی ئاورین، سڵاوی خۆی دەکا
وەك برادەرێکی لەمێژینە
لە باوەشمان دەگرێ و لەسەرخۆ
شمشێرەکەی هەڵدەکێشێ

ئەمانەتەکەمان لە سینە دەردەهێنێ
ئەو ئەمانەتەی
مەعریفەیەکی زۆرمان بۆ سووتان و نەماندی
ئەوسا ماڵئاوایی دەکات و
لە دوای خۆی دوو کێلی تەمتوومان جێ دێڵێ
وەك گیای ئەفسوونی بن دەریا
بەر لەوەی دوا پێك هەڵبدەین
دوا لاسکە گوڵی لۆتس لە ئاو دەرێنین
قەدەر دێ وەك ناسیاوێکی زۆر نزیك
بێ ئەوەی کە لە دەرگا بدا دێتە ژوورەوە
بە دەنگی سیحراوی بانگی ئەفسەری ڕۆح دەکا
ئەویش هەموو تانج و نەجمەی فڕێ دەدا و
بێ داکۆکیکردن ئاڵای سپی خۆی هەڵدەکا

## وەسیەتخامە

بیرکەرەوە، سەختە دەڵێی ژەهری هەلایە
دژوارە وەکو شمشێری دوو تیغە
مەینەتە دەڵێی ئاگرە
کپییە دەڵێی پرسەی ئەبەدییە
وەرسییە دەڵێی زیندانی ڕۆحە
گێژەنە دەڵێی خەرەندی ترسە
ساردە دەڵێی بەفرستانە، مردن
چیتر کتێبە جوانەکانی سەحەر ناکەیتەوە
برادەرەکانت نابینییەوە
گێژەنە، قەت ناگەیتە کەنار ئەیدۆست
ساردە کەس تەوقەت لەگەڵ ناکات
مردن مردن مردن مردن مردن
وەرە با بەینێ ببەستین مردن
کە هاتی یەکسەر وەرە
ئەگەر لە کاتی گۆرانی چڕین بووم
لێگەڕێ با تەواوی کەم
ئەگەر لە کۆماری شیعر بووم با دوا وشەم بڵێم
ئەگەر لە کاتی پیاسەی ئێواران بووم
لێگەڕێ با دوا تاڵە قژی دۆستەکەم لە مەچەکم بئاڵێنم
خۆ ئەگەر لە باوەشی دایکم بووم ئەوا یەکسەر
بگەڕێوە و لە دوای خۆت بەهێمنی دەرگاکە داخە
با فرمێسك و بالۆرەی بمشواتەوە
چونکە کە هاتی ئیدی تەواو
تەواو تەواو

## شکستی گەوهەر

1

کتێبێ بوو، پڕ لە سیحر و ئەفسوون
فریشتە و شەیتان، تژی جوانی و خورافەت
لە خەیاڵ و مەستی و سەفا
لە دەف و نەی، لە نەوای سپێدەی عاشقان
لە تاوس و تابان و تروسکەی سەما
پڕ بوو لە ئەلفابای لەززەت
پڕ بوو لە نهێنی خوداوەندەکان و گەمەی باخۆس
پڕ بوو لە ناوی ئەو جاویدانەی
لەناو خوێنی کتێب دەژیان
کتێبێ بوو هی ڕابردوو خەونی ژانوسی دەگێڕایەوە
هێ ئێستا، تابۆکانی ئاشکرا دەکرد
ئاگری شی دەکردەوە
هی داهاتوو، کە پڕبوون لە خەونی یۆتۆپی

2

پەیمانێکی فاوەستی بوو لە میانی پاکی و شەیتان
پارچە گڕێ بوو، شەوقی لە چاوی ئەبەد وەردەگرت
کانیێ بوو گەلگامش مەلەی تیا دەکرد
وەلێ ئەفسووس لە تاریکە شەوێکی هێجگار خەمگیندا
لەبەردەم ئەشکەوتی سەری ئینسان کوژایەوە
لە ڕەفەی قەڵا بەرزەکان بوو بە خاك و خۆڵ
کەس نەیخوێندەوە
لە پەنجەرەی دوا نهۆمی لەبیرچوونەوە کەوتە خوارەوە
لەو ڕۆژەوە زەوی بەو پەیمانەوە دەسووڕێ

## ئەمیرە جوانەکان

1

ئەمیرە جوانەکان
لە فڕیندا بەدیار دەکەون
لە نیشتنەوەدا ون دەبن
ئەمیرە جوانەکان
لە خەوتندا زیندوو دەبنەوە
لە بێداربوونەوەدا دەمرن
ئەمیرە جوانەکان
لە تووڕەبووندا دەبن بەمانگ
لە هێوربوونەوەدا ئاوا دەبن

2

کە ڕاویان دەکەی دەتوێنەوە و دەبن بەهەڵم
کە ڕەهاشیان دەکەی ڕۆح دەگرن
لە گۆمی گومان مەلە دەکەن
لەبەر چاوتا با لوولدەدەن
لە خوڕڕەدا وچان دەبەخشن بەجەستە
لە تەمتوومادا بانگت دەکەن
لە باوبۆراندا دەردەکەون
بەسەر پشتی پڕووشەوە گوزەر دەکەن

3

ئەمیرە جوانەکان تای بە تەنیا بوونی خۆیان
لە شووشە مل باریکەکانی ڕاکی دەکەن و دەیبەشنەوە
کە باڵدەگرن یادەوەری خۆیان
دەسپێرنە دەست عاشقەکان
کە دێنەوە سەر زەوی دەیانبەنەوە سەردابەکان
جار جارە لە پەنجەرە بەرزەکانەوە
لەتێ جوانی و قاپێ نیگایان بۆ فڕێ دەدەن
ئەمیرە جوانەکان لە جوانیدا گوڵە پەمۆن
کە باڵدەگرن بەدیار دەکەون
کە دێنەوە بۆ تا هەتایە ون دەبن

## شاعیر

تۆ چاوبەستەی بن شمشێری دیمۆکلیسی
تۆ سەمەندەرێکی تەنهای ئاسمانی
گۆرانییەکانی خۆت بڵێ و
بچۆرە ناو مەترسییەکانی ڕەهایی
تۆ کەڵە پیاوێکی تا ئەبەد لەبیرکراوی
تۆ غەریبی نێو مێگەلێکی پڕ سامی
تەکانێ بدە برادەر
تا بگەیتەوە ناو سیحری جاویدانی
تۆ کەسێکی بێ نەزیری
تۆ مەخلووقێکی پڕ سەفا و بێ خەڵوەتی
تۆ کوورەکەت بێ ئاگرە
تەنهاتری لە زەمینێکی چۆڵکراو
تۆ دیرۆکت تاشەبەردێکی بنگۆمە
پێکێکی تر هەڵقوڕێنە
با پڵنگی مەستی بتگرێ
تۆ لەنێو ئەم خەراباتە
بەتەنها دیدگا شکدەبەی
ئەوان کە ڕەتبوون ترس قوتی دان
تۆ یاریت بە کتێبی خۆر دەکرد
کە ڕەشەبا بینایی دار کاژی دەچنی
تۆ گەڵا ڕژاوەکانت کۆ دەکردەوە

زۆرم بیر لە تۆ کردۆتەوە
نە ڕۆژێ ویستت مەشخەڵە ئاگرێ بدزیت
نە وچان دەگری لە حەرفێ
تۆ چەند تەنهای ئەی مرۆڤ
بۆ کوێ دەچیت؟ با تەلبەندێکیش تەی بکەی
بپەڕێتەوە لەوبەری
یا لە کەنارێ سەمای بێهوودەیی بکەی
با گۆرانییەکی خۆشیش بڵێی
خەمگینی سەمای سەردەمە
گریمان ڕزگارت بوو
ئەوسا کەسێ لە دەوروبەرت نەماوە
دەست لە شانەکانت بدا
هەرچەند ڕاکەی
هەر دەگەیتەوە ڕۆحی خۆت
تەنهاتریشی لە جاران
گریمان دەتەوێ سۆراغی کتێبی ڕەهایی بکەی
دەبێ تا ئەبەد خاچت لە دەست بێ
ئای چەند تەنهای ئەی مرۆڤ؟

## برۆنزییەکان

با خۆسیترین ڕەنگاڵە بوون
ئەو ئاوێنە سورفڵانەی لە کتێبی بارانەوە
دەڕژانە سەبەتەی زەوی
بەهەشتیترین زێوان بوون
ئەو حیکمەتە سرووتیانەی
لە جوانیتەوە هاتبوون
تەمتوومانی قەدەریان دەڕەواندەوە
ساتە درەوشاوەکان
کۆمەڵە قەرەجێکی یاقووتی بوون
ئاڵترین سترانیان دەچڕی
ڕەشماڵە برۆنزییەکانیان
لە باڵی بەرائەت بوو
ستوونیان لە نووری ئەزەل
بەحەقیقەتیان دەگوت ڕەزی هەتاو
بەو دەست و پەنجانەش دۆزەخ
کە مەمکی هەرماسیان دەگوشی
ئەو ساتانە ڕەمزی یەقین بوون
لەناو باخچەی ئەپیکۆردا
باڵای شمشێر بوون لە تەرازووی داد
کۆمەڵە شاعیرێکی خەمگین بوون
شەوانە بۆ مینا شکاوەکانی یۆتۆپیا دەگریان
ئامێز ئامێز نەویدیان بەمێژوو دەدا
ڕۆژانەش دەچوونەوە مەنفا
لە پەنجەرەکانەوە بۆکێتی

شەبەقیان دەبەشییەوە
ساتە درەوشاوەکان
گوڵە مێلاقەی لەشق بوون
لە ماڵی کۆتران دەخەوتن
لە حەوشەی کەناریان پرسەیان دادەنا
ساتە برۆنزییەکان
گڵاسێ شەڕابی تەناهی بوون
سەبەتێ ترێی شەراب بوون
سفرەیێ تاوڵی موراد بوون
سەلامەت بن پەڕەسێلکە برۆنزییەکان
کە ناوادە کۆچتان کرد و
ژووری کتێبەکانتان چۆڵکرد
ئەوا من هەمیشە لەژێر تریفەی مانگی تەنها
لەژێر منارە چۆڵەکەی شاری غوربەت
لە پەنجەرە و لە تەك ئاسەوارەکانی مەچکۆ
لەبەر دەرگای قەڵا وەهەم کوژەکەی شار
لە لای پەیکەرەکەی زەعیم
لە کن ئاوەکەی کەسك و سۆر
لەلای قەسرەکەی عەتاوڵا
لە مزگەوتی شێخی چۆلی
وەستاوم و گوڵم پێیە
بخووری نوێژێکی ئەبەدی دادەگیرسێنم
کە میحرابەکەم پریەتی لە ژاڵە

## کاسەیێک چەنگاڵ

هەموو خەوتوون
پاسەوانەکان، خەفەرەکان
سوارەکان، شەمەنەفەرەکان
پاسەوانەکان: خەوتن بۆ ئەوان
ژەهری چاومانە
خەفەرەکان: خەوتن بۆ ئەوان
کوژانەوەی ئایندەیە
سوارەکان: خەوتن بۆ ئەوان
پاییزی ئەقڵە
شەمەندەفەرەکان: خەوتن بۆ ئەوان
باستێلی ئەبەدییە
پاسەوانەکان ئەو کاتە خەوتن
کە نیشتمان بەتۆزێ ئاگاهی
غەرقی خوێن نەدەبوو
خەفەرەکان کاتێک خەوتن
کە منداڵەکان بەتۆزێ بەزەیی
ئایندەیان دەنەخشاند
سوارەکان کاتێک خەوتن
کە کتێبەکان بەتۆزێ خوێندنەوە ڕزی نەدەبوون
شەمەنەفەرەکان ئەو کات خەوتن
کە هەموویان لەبەر بارانی مەرگدا
چاوەڕوانی سەفەر بوون
هەموو بێداربوونەوە
پاسەوانەکان، خەفەرەکان
سوارەکان، شەمەنەفەرەکان

پاسەوانەکان کاتێك بێداربوونەوە
کە تەرمی نیشتمانیان بەڕێ دەکرد
خەفەرەکان کاتێك بێداربوونەوە
کە منداڵەکان بەبچووکی سەریان نایەوە
سوارەکان کاتێك بێداربوونەوە
کە ڕەشەبا خۆڵەمێشی کتێبەکانی پەرت دەکرد
شەمەنەفەرەکان کاتێك بەگڕ کەوتن
کە مەرگ هەمووی دروێنە کردین
پاسەوان لەگەڵ تۆمە هەی موخەننەت
نیشتمان موقەددەسە
خەفەر لەگەڵ تۆمە هەی بەد نمەك
منداڵەکان هی مەلەکوتی خودان
سوار لەگەڵ تۆمە هەی نەگریس
کتێبەکان کلیلی ئازادین
شەمەنەفەر لەگەڵ تۆمە هەی بەد ڕۆح
هەمووومان سەفەری بووین.

## شکانی ئاو

1

ڕەنگە دڵۆپە ئاوێ هەبێ لە پشتی کێوەکانەوە
خۆی بە قەدی چیلکە گیایێ گرتبێ
یا بەسەر شاخی کەڵە مامزێکەوە
خۆی لەبەر خۆر هەڵخستبێ

2

ڕەنگە دڵۆپە ئاوێ هەبێ لە پشتی کیشوەرەکانەوە
جاویدانی دابێتە نەوڕەسەکان و
حەسرەتی بۆ من نووسیبێ

3

ڕەنگە دڵۆپە ئاوێ هەبێ
تاجیلەی نەمریی پێ بێ و من نەیگەمێ
ئێستێ لەسەر تاشە بەردێکا
یا بەدیار چاوی قرژاڵا
یاری لەگەڵ ماینی بەحر و تەم بکا

4

زۆرجاران کە قەڵەمەکەم بەکوڵ دەگری
گوێم لە ڕژانی لەپێ ئاو دەبێ
چك چك بەرەو زەوی دەڕژێ
وا هەست دەکەم ئەوە ڕۆحمە هەڵدەڕژێ
دەمەوێ زەمانێ بچمە ناو ئاو
ڕەنگە پەپوولەی ئاوان بم
زەوی هەردوو باڵی گرتووم
ڕێگە نادا بچمە نێو دڵۆپەکانییەوە

6

له پشتی شووشەوە هەر دەتگوت گەوهەرە
تەمێك بوو لە جوانی ئەو ئاوە
زەمەنێك بوو لە جاویدانی
یا پەیکەری گەڵایێ
کە سەیری شەونمی سوور دەکا
درەختەکە شەو بوو کەوتە سەما
کە مانگی بینی تاجێکە لە ئاو
بەسەر لقێکی قەدیەوە

7

ڕەنگە دڵۆپە ئاوێ هەبێ
لە پشتی کیشوەرەکانەوە
جاویدانی دابێتە نەورەسەکان و
حەسرەتی بۆ من نووسیبێ
یا لە کەنارە دوورەکانی عەدەم
فیردەوسی وەك فەریکە گەنمێ
بەدەنووکی تیتراوسك سپاردبێ
جەخاری بۆ من ناردبێ

8

زۆر جاران گوێم لە خوڕرە ئاوێ دەبێ
دەڵێم هەر ئێستا دەیگەمێ
بەڵام دوورە، هێندە دوورە
بەقەد ئەو تەمە زیوینەی
لەو بەری دەریاکانەوە
دوورتر لە تاقەدارێکی ئەوبەر زەمین

9

وا هەست دەکەم

خوێنمە جێی هێشتووم و نایگەمێ

ئەی ئاو دەرگام لێ بکەوە ئەی ئاو

من ئەوەندە فرمێسکم بۆ تۆ ڕشتووە

تا گیا لەژێر پێم شین بووە

10

ئەی ئاو

پاکیزەییم پێ ببەخشە ئەی ئاو

ئەی ئاویترین جاویدانی

ئەی ئاو بمکەوە هاوڕێی جارانت

کە دڵۆپ، دڵۆپ

دڵۆپ، دڵۆپ

لە چەمەنی ڕۆحم دەنای

ئەی ئاو بمکەوە دۆستی جارانت

کە خوڕ خوڕ، خوڕ خوڕ

هەڵتدەڕشتمە چاوانت

## ژنێك لە گیا

ژن
ئەی لوئلولی لالا
یاقووتی شکاو، کە ئاسك مەستی شکانە
ئاقیقی ڕژاو، کە نارسیس غەرقی ئاوێنەی ئاوە
عەتری پژاو، شەوق و شەباقەی برین و بۆ
ڕەزمی نەوا، کە چرۆی زینە وەکو باخی ڕەزانە
لالەنگی زەڵاڵ، گوڵ و گوڵگون
کەفچڕی دەریا، کە تەمەن پیرێکی ڕەهەندە
دەفژەنی باخاتی بەهەشت
گرفە گڕی مسك و مەتاڵ
مەستانە کوڵیك، تەختی هەمایون
ئەشکی مەریای لەعل و تاوس
ساقی یو مەی
ڕەوتی بەهێ
باخۆسی ڕەزم
بەزمی بەڵالوك
بەهرە شیعر
باخی میهر، میهری موغان
ژن
ئەی دولدولی باڵا
تۆ کە دەبانێکی دوو تیغەی
تیغێ جوانی
تا بتوانین بەرگەی بێ هوودەیی بگرین
تیغێ نەی

تا بتوانین خۆمان لە مەرگ حەشاردەین
یا لە خەونی شاپەڕێکی کاغەزینی باڵندەی
یا هەر نەبێ لە قوڕێکی جیاوازی
یا هیچ نەبێ جەستەیەکی دوای هەوەس و
لەززەتێکی ئاگرینی
ئاوەندی گەردوون: خۆر نەبوو
ئاتەشگەی ناو جەستەی تۆ بوو
سەوسەنی ڕۆح
گردی دیار
کاخی خەیاڵ
عەرشی موعەللا
دەمێك دەبی بە
سەرچاوەی نایاب ڕەگەزی سەر زەمین
یا کالآنی شمشێری پڕ لە خوێنی مرۆی باڵا
بە ئەدگار هەر لە خوای ئاو و حیکمەت دەکەی
گەلآ و قەتمەری ناو ماڵی فریشتانی
لە گەردن وەك پڵنگێکی تازە خەوتوو
ژن
ئەی نەی شەکەر و بادەیی فەڕ
عەرعەری عوریان
زۆرم بیر لە تۆ کردۆتەوە
وا تێ دەگەم
تۆ سەختەندازێکی
م ە ح ا ڵ ی
ئەی
ژن

## شمشێری ئاوین

ئاوێنەی ئاو بەو هەموو سافییە
بەو هەموو مرواری و سیحری فاڵ
بەو هەموو سێوە لا سوورانە
لە درەختی پەندێکی ئاورین
نەرسۆسی تواندەوە و
جوانییەکانی وەکو فلووت هەڵمژی
کیژۆڵە عاشقەکانی لە ئومێد خنکان
پاشا و مەملەکەتی غەرقی شایی کرد
گەمەیەکی چەند خۆشبوو
داگیرسانی شەوبۆی مناڵی
لە شەڕابی ترێی لاتین و
لە مەستی درەختی تەناوەر
لە لێوارە گەڵا ڕەنگەکانی زین و زەماندا
دوای هەموو جەنگە شووشەییەکانی دەروون
دوای هەموو پێکە خەستەکان
دوای بەجگەرە ئاور ڕێژکراوی نامەکانی
لەناو ئەفسوونی تەمتوومان
بێ گوڵە پەمۆی قوتبی و
بێ شەڕاب
بێ ئەڤین
خاڵی لە زیت و سۆزی ئومێد
بێ نەوڕەسە جوانەکانی سەر قەڵای ئاو
دەگەڕێتەوە ناو مەملەکەتی یادەوەری
ئەو پەڕانە هەڵدەداتەوە

شیر و گەوهەریان لەسەر هەڵبزرکاوە
ئەو دەرگایانە دەکاتەوە
کە دیلی قفڵی نیگەرانین
دەگەڕێتەوە سەر ئەو نامانەی
هەمیشە مناڵیی بۆی دەهێنا و
مناڵیشی بۆ دەخوێندەوە
تەڵە ژیلەمۆیێ دەخاتە سەر نەرگیلەکەی
بۆ ساتێ دووکەڵی زاتی خۆی هەڵدەکێشێ
چەند بوەیهیمی بوو ئەو دۆستە
دەمێ لە شەهدی شەڕابا مەست دەبوو
دەمێ لە پەرستگا
دەمێ گیا و پڕووشە، دەمێ هەورە تریشقە
قومێ ئاوی یەقین، شەونمێ لە سپێدەی کافوور
ئاگری گومانی تێبەردام
هەورازێ لە دۆزەخ، شەیتانێ لە ڕۆحم تاوی دا
وەك دەنگی ناقووسی شکاوی کەڵێسا
بەللوری ئارامی شکاندم
وەك چلێ زەیتوونی شەرابی
وەك دڵی شەق شەق بووی بەر کاردێ
وەك شیعر هەڵدەڕژا
چەند دوورودرێژ بوو ئەم گەمە تەمرێژە
ئێستاکەش نەوەیەك هەر ماوە
درێژە بەم گەمەیەی من دەدا
ترووسکێ لە کێوی منداڵی
غوربەتم لە ڕەندەی گەڤ دەدا

## تاجی جوانی

چوومەوە ناو تەمی تەمەنی بەسەرچووم
کتێبی گریانم کردەوە
چرایێ لە باخی ئیرەمی ڕامان و
ئومێدێ لە سەراب
کتێبی دووەمم کردەوە
سوفیێ لە نارنجی زیکر
زەندیقێ لە سافی خوناوەی بەربەیان
عابیدێ لە قەترانی زوڵم
کتێبێ لە عەشقم کردەوە
شنەیێ لە حەسرەت لەززەتی بابردوو
حەسرەتێ لە شەوقی کوژاوە
لەدیدارتا
تاجەکەت لە جوانی
تەختەکەت لە دڵنیایی مەلستان
شمشێرت لە برووسکەی هەمووان
پەرییە نیلوفەڕییەکان
سپێدان لە دەقی گەڵاوە بانگیان دەکردی
بۆ باڵات دەنووشتانەوە
قەلنەکەتیان بەگیانی نەمری دادەیساند
دەستیشیان لە عەتری ڕوومەتت دەسووتا
سینەیان گەڵاڕێژ دەکردی
ئەڵقەکەت بەخوێنی پەرییەکانی لاتین
لە پەنجەت داگیرسان
دەوروبەر گوڵ بوون گوڵ

گەوهەری نەرگزت بەجێهێشت
کتێبت نایە ناو قەفەزی دیلێتی
شمشێرت لە دڵیان بردە خوار
ئاگری قەلنەکەت لە بخووری تابان بوو
لاتین بەهەموو ئەشقە جوانەکانی
بە هەموو کەڵێسا و بارەکانی
تێواران کلیلی نهێنی دنیایان
لەناو دەنکە گوێزێ دادەنا
لە باخ و باخەڵی تۆیان کرد
کاسەی میهر و ڤانیان لە کاسەی چاو دەکرد
لەسەر مێزەکەتیان دادەنا
ئەسپە قەفقاسییەکەتیان
بەعەتری هەناسەی خۆ دەشووشت
لە جەنگەڵەکانەوە شیری شێریان بۆ دەهێنای
هەر بۆ خاتری ئەوەی گێلاسەکەی نیشتمان
تروسکەدار بێ و نەژاکێ
هەر بۆ خاتری ئەوەی
کە شووشەی شەبەڤیان نەشکێ
ڕۆحیان دەخستە ناو قەفتەی شمشێر و
بەشانی تۆیان هەڵدەواسی

## درەختی حیکمەت

پەنجەرەکانیان شکاند
تا بگەنە باخی هەقیقەت
ڕۆحیان وەك یاقووتێکی درزبردوو
وەهمیان لێ دەچۆڕێتەوە
ئەو تەڵەزمانەی
دەرگای نووریان خستە سەر پشت
تا هزر مەستی سەفاکەن کوژانەوە
ئەو شاعیرانەی سەر بە سەمای زۆربا بوون
تا چەند دێڕێ لە ڕۆحی شکاو دەرباز بکەن
لەناو لەپی سەرابدا خۆیان دۆزییەوە
ئەو برینانەی لەتە سێوێ هەڵیگرتن
لە باخەکاندا ڕزین
ئەو هەیڤە شەوانەی بۆ تاوێ
بە تیلمە هەورێ خۆیان داپۆشی
تا دوو پەیکی عیشق
لەبەر چاوی بەدکاران ون کەن
بەڵام بۆ تا هەتا ئاوا بوون
ئەو چاوانەی خۆیان لە یەخەی ئاسمان دووری
تا بارانی یەقین بباریێ
تا ئەبەد نوقمی گومان بوون
ئەو سەمەندەرانەی لە فڕیندا سووتان
تا لە بەرزاییا بچریکێنن
لە خۆڵەمێشەکانیان دۆزەخ داگیرسا
ئەو تیشکانەی دابەزینە سەربانی ماڵەکان

تا دڵان تەژی ئەوین کەن
ئاگریان بەردایە دەروون
ئەو شنەبایەی هەڵیکرد
تا تەپوتۆزی گەڵاکان بشواتەوە
بەناچاری هەڵیوەراندن
ئەو کەنیزانەی لە سۆنگەی میهرێکی پاك
دەستیان لە مل کردین
بۆ یەکجاری ئێمەیان خنکاند
ئەو ئازادییەی لە کوچە و کۆڵانە بنبەستەکان
بەدوایدا ڕامان دەکرد و دەتواینەوە
تەسلیمی دەستی دیلی کردین
ئێمە بۆ سەیری تریفەی مانگ
دەچووینە تاقە بەرزەکان
بەڵام لە بناران پیربووین
بۆ ژوانی ئاسکان دەچووینە سێبەری ئاوبارەکان
بەڵام لەوێوە شووشە جوانەکانی ئەوینمان دەشکاند
دەستمان لە ملی خۆشەویستەکانمان دەکرد
بەڵام بۆ ئەبەد هەناسەمان لەبەر بڕین
چەند سادیست بووین
شیعری یاقووتیمان دەنووسی
جوانترین مەلیشمان سەردەبڕی
بەپەلە بووین تا بگەینە کەنار ئاوەکان و
لەوێوە سەیری پەرییەکان بکەین
بەڵام بەمشتێ تووڕەیی
پەیکەرەکانی جوانیمان چەقۆڕێژ دەکرد
ئەو دەرسانەی سپێدان دەمانخوێندن

ئێواران ڕاومان پێدەکرد
بەتاسووقەوە
دەچووینە بەر ئاگردانەکەی زەردەشت
تا پاك بینەوە لە هەرماس
لە ڕێگە دیواری مەعبەدەکانمان دەبڕی و
خەزنەکانمان دەکۆڵییەوە
ئەو کیژۆڵانەی خۆشمان ویستن
نوقمی ڕقوقینمان کردن
ئەو شمشێرانەی باوانمان ئەوە بەنەوە
دێویان پێدەکوشت
ئێمە لاپەڕەکانی ئەقڵمان پێ هەڵدڕین
چەند جیاوازبووین
ئەوان هەمیشە دەگریان تا بەڕاستی پێبکەنن
ئێمە هەمیشە پێدەکەنین تا بەقەستی بگرییین
ئێستێکەش
ئەو دەفتەرانەی حیکمەتیان تیا نووسرابوو
زەمانێکە خوێنیان لێ دەچۆڕێتەوە

## کەمال ئەملولك

غوربەتی گوندینییەك لە بنی دونیا
ناڵەیەك لە دوور ڕەنگە باران بێ
شیعرێکی نالی لە ئاستانەی ئەستەنبوڵ
مەلێك لە ئازادی ڕەها
نەرگزێك لە وەرین
مۆزارتێك لە زیندان
ئەوانە هەموو کەمال مولکن
لەناو کۆشکە جوانەکانی شاژن
کەمال مولك هەمیشە لە ڕاوی جوانی
مەملەکەتێك بوو لە شووشەی هەست
داگیرسا، بۆ تا هەتا نەکوژایەوە
کەچی شا عەباسی سەفەوی
هەموو ددانەکانی وەرین
هەموو ئێسقانەکانی ڕزین
کەمال مولك دەیگوت:
هەر جارەی بیر لە خۆم دەکەمەوە
ئەو هەموو ساڵ و مانگانە
ئەو هەموو ڕۆژ و ساتانە
لەنێو دەر و دیواری شاهاندا
چۆن تێپەڕین و چۆن ڕابردن
نە ئەوان لە جوانی تێربوون
نە منیش لە ڕاوی جوانی بوومەوە
هەندێ جاریش وەڕسیی
دەستی پێ شل دەکرد و دەیگوت

تابلۆکانم بوونەتە خەنجەری سەر دڵم
ڕەنگەکانیان لافاو
چوارچێوەکانیان زیندان
بەڵام لێستێ هەر هەموویان
دەڵێی چەند لەتە سێوێکی سوور و سپین
لە تەلارەکانی پاشماوەی قاجاردا
وەك ئاگرسوور، سووردەچنەوە
ئەی شا
ڕەنگێ نەما لە غەریبیم
ئاسۆیێ نەما لە دیدگام
نەیکەن بەجوانی بۆ تۆ
تۆیێ کە لەمێژە چاوەکانت ئاوی بیناییان چك کردووە
لە چاو کەوتی
هێندە سەیری خوێنی من بکەی لەو ئاسکانە
لە جووڵە کەوتی هێندە ڕۆحم بەو دیوارانە هەڵواسی
بەڵام غەریزەی شاهانەت
لە قوڕی سەر تەرمی مردووان دەچێ
لە لەپ و پۆی شعور نابێتەوە
ئۆخەی دڵم ئازاد بوو ڕەنگە جوانەکان
ئێوە کێڵگەیەك بان بوونەتە میزانی ئەم کەونە
کەمال مولك هەمیشە بەخشندەی جوانی بوو
ئاسکەکانی هەر ئەوێ دەمێ
کە لە پەنجە دەبوونەوە
کە لە دڵ و دەروونی دەهاتنە دەرەوە
تۆڕی شا دەیگرتنەوە
ئاسکێ، دووان، سێیان، دەیان

هەندێ جار شووشەی شاخیان دەشکا و
کرت، کرت، کرت، لە تابلۆ دەڕژانە خوارەوە
کەنیزەکان دەیانکردە ملوانکە
بەرۆکیان دەبووە کەمالگە
ئای ئەو هەموو ئاسکە جوانانە
بۆ دیل دەکەی کەمال مولك؟
کە دەزانی هەر کات لە هەستت دەبنەوە
دەکەونە تۆڕی شا
ئەو هەموو ئاسکە جوانانە
بۆ دیواربەندی دەکەی ئەی شا
کە دەزانی دەتوانن دارستان تەی کەن؟
ئەی شا ئەی شا، ئەی پیرە شا
ئەوانە دارستانێکن لە چۆڕێ شیر
تنۆکێك مودیلیانین هەناسە ساردت دەکەن

کەچی تەلارەکانی پەهلەوی و پارکی ئیرەم
ئێستێش نوقمی لەتە سێوەکانی
پاش پەنجەی کەمال مولکن
ئەی شا ئەی شا، ئەی پیرە شا
بەکامتان بڵێم هەی زاڵم، بەکامتان بڵێم هەی زاڵم
شایەك عاشقی جوانییە و
ئاسکان لە دیواران دەگرێ
کەماڵێك جوانی دەخوڵقێنێ
ئاسکان بۆ دیلی ڕاو دەکا
نێوانیان باخچەیەك ترسە و کێڵگەیەك
نیشتمانێك دیلییە
بەکامتان بڵێم هەی زاڵم؟

* وێنەکێشێکی ئێرانییە - -7481 -8481

## باخچەی یەڤین

سێوی کوێر:
سەرێکی ئاهەنگەکە لێرە بوو
هەموو ئاهەنگێڕەکان کوێربوون
هەندێکیان بە گۆپاڵێکەوە
لە قورسترین شەڕدا
لە قووڵترین تەئەممولدا بوون
کچێکی کوێر باخێك لە سێو بوو
خۆی و سەبەتێکی نارنجی
عەتری دالیای دەبەشییەوە
فلووتژەنێ خوێنی لێ دەچۆڕا
بخووری ئایندەی دادەگیرساند
سەرێکی ئاهەنگەکە لێرە بوو

شەریف پاشا :
جانتاکەی پڕ بوو لە کولتوور
لە بۆینباغی مەدەنییەت
لە حەرفی کێشەیێکی ئاڵۆز
کۆنگرەی پاریس جوانترین پەساپۆرتی پێدا
لە سێبەرنامەی سیڤەردا
بۆینباغ و پەساپۆرتەکەیان لێ سەندەوە
خۆی و کێشەکەی بەتەنیا
لە ئەشکەوتێکی سەدەی بیستەمدا مایەوە

داوەت :
داوەتێ بوو لە خوانی شەترەنج
بازیکەرەکان لە کوشندەترین گوماندا
تەوقەیان لەگەڵ سەربازەکان دەکرد
لە بەخشندەترین یەقیندا
ژەهریان لە قاوەی مەلیك دەکرد

پشوو :
جەنگ تەواوبوو، بەڵام ئالووشی تۆڵە دەیهاڕین
جەنگاوەرەکان پەکیان کەوتبوو
لەبەر دەرگا، لە پەنجەرە، لەبن دیواران
لە شۆستە و شەقامەکان
بەسەر پشتی کورسییە لەعنەتییەکان
سەیری دنیایان دەکرد
پەشیمانی چاوی پێ دادەخستن.

## نێرڤانا

ئەی مەلیك مەلیكی وەردی خوێن
مەلیكی شەونمی دارستان
مەلیكی مێژووی بێ نیشان
مەلیكی خەندەی گەش
مەلیكی باران و هەم گریان
مەلێكم لە دڵ هەڵكورماوە
مەینەتی لە بن باڵیدایە
مەیخۆرێ، وەڕسیی سەد ساڵی ئینجیلی نۆشیبێ
مانۆری بۆ خاچی ئەبەدی نووسیوە
مەندێكە لەسەر سفرەی ویقار
مەرجێكە لەسەر خوێنی كتێب
ئەی مەلیك مەلیكی ئاگردانی ئایین
مەلیكی سرووت و برینم
مەلیكی سەر تەختی خەنین و گرینم
مەلیكی نێرڤانا و عیشقی ئاڵ
ماتاڤ بە بۆ بیابانی ڕۆحم
ماسوولكەی ئەزەلی دەقم بە
مانگێكی شیعر بە لە دیقەت
ماشەرەی پڕووشكی عیشقم بە
ماپۆسانی دڵم لە زیندان ڕزگاركە
ئەی مەلیك مەلیكی ناو تەمتوومان
مەلیكی میهر و جان
مەلیكی بێ دەنگی و دلۆڤان، مەلیكی بەفر و با

مامشی پرسەی ئازیزانم بکە چەپکێ نەوا
مارانگاز لە خشپەی گەڵایێ
ئەندێشەی نەهەنگی دوور دەکا
ماپۆکی پڵنگ و داڵی تووش لە سەفای گیر دەبێ
ئەی مەلیك ئەی دۆستی بوزاییم
ئەی تەونی ئایندەم
ئەی گەورەم
ئەی باخی ئیرەم و مەشها صەفێ
مەی بەرگەفێ
فێنکی ئەلەندەی دوعایێکم دەوێ
مەراقم بخاتە ناو لەپ و
مەزەندەی شکاوم سارێژکا
مەرکانەی ئومێدم تەقەت کا
ئەی مەلیك، مەلیکی وەردی خوێن
مەلیکی ئاگردانی ئایین
مەلیکی ناو تەمتوومان
ئەی دۆستی بوزاییم

## تەوتەم

کردم بەمانگ دڵم خۆش بوو شکاندم
کردم بەدرەخت کە هەتاو هات هەڵمپاچی
پەرستگاییێکم لە گوناە بۆ هەڵنایەوە
باخێك لە نوورم بۆ وێران کرد
خوێنم کردە پەرداخێ لە سپیی سپێدە
چەپکێ ڕەشەبام خستە ناو سەفا
لە هەر پارچەیێ ڕۆحێك باڵیگرت
لە هەر گەڵایێ مەلێ هەڵفڕی
لە هەر تیشکێکی ئەم نوورە جوانە مۆمێك داگیرسا
لە هەر دڵۆپێ لەم خوێنە سوورە گوڵێك گەشاوە
لە هەر تەوژمێ لەم ڕەشەبایە پرووشەیێ گریا
پارچەکانی مانگی شکاوم کۆکردەوە
درەختەکەم چاندەوە
پەرستگاکەم پاك کردەوە
باخی نوورم ئاو دایەوە
ڕەشەبام ناردەوە شوێنی خۆی
نە مانگ بۆوە مانگی جاران نە درەختیش لقوپۆپی دا
نەپەرستگا خاوێن بۆوە
نە باخی نوور گەش هەڵگەڕا
نە ڕەشەباش گەڕایەوە
ئەوەی من کردم تەوتەم بوو
کە تەوتەمیش ورد و خاشبوو
چەمکی جارانی نامێنێ

## شکست

سەدەی یەکەم بوو کە بینیم
گەڵای مەشاعییەت دەوەری
ئەو دارستانی تەی دەکرد
تا شەڕە جەستەی ئاسکان بەدی بکا و پێدەکەنێ
سەدەی دووەم بوو کە بینیم
دەستی مارکۆپۆلۆی دەگرت سەفەری
لێدەتکایەوە و پێدەکەنی
سەدەی سێهەم بوو کە بینیم
لەژێر کەپرەکەی کرۆسۆ تەنهایی خۆی
دەچنییەوە و پێدەکەنی
سەدەی چوارەم بوو کە بینیم
تازە لە وەهمی کەشتی نوح دادەبەزی و پێدەکەنی
سەدەی پێنجەم بوو کە بینیم بۆ تۆڵەی باوکی
پاڵتۆکەی ئومروئولقەیسی دەنەخشاند و پێدەکەنی
سەدەی شەشەم بوو کە بینیم، لەگەڵ ڕابەری کۆیلەکان
ڕەسمی بەیداخیان دەکرد و کتێبی بوزایان دەخوێندەوە
سەدەی حەوتەم بوو کە بینیم
بەجلێکی خوێناوی شکستبارەوە
لە کۆمۆنەی پاریس دەگەڕایەوە
شووشە شەڕابێك و چەند پارچە نانێکی
لە دەستا بوو پێدەکەنی
سەدەی هەشتەم بوو کە بینیم
ماندوو لەگەڵ فاکۆدی گاما

باسی تاعوونەکەی سەر ڕووباری مەسی سپی و
کوانووی کوژاوەی نەهری دەکردو پێدەکەنی
سەدەی نۆیەم بوو کە بینیم
بەتەنها ملی نابووە بەر ملی لەشکری فتوحات و پێدەکەنی
سەدەی دەیەم بوو کە بینیم بە لالووتی
لەگەڵ سەلاحەدین باسی شمشێری دوو تیغە و
خەنجەرەکەی دواوەی دەکرد و پێدەکەنی
سەدەی یازدەم بوو کە بینیم
لەگەڵ تۆماس مۆر و فارابی
دەچوونەوە نێویۆتۆپیا و پێدەکەنی
سەدەی دوازدەم بوو کە بینیم
تەختە مەقسەلەکەی ڕۆبسپێری
توورِ هەڵدەدا و پێدەکەنی
سەدەی سێزدەم بوو کە بینیم
لە شوورەی دەوری قەڵا بەسەر سینەی
ئەسکەندەرەوە گوتاری شکستی دەنووسییەوە و
بەهیلاکی پێدەکەنی
سەدەی چواردەم بوو
کە بینیم سواری
ملی لویسی شازدەم بووبوو بە
ئەکلیریك پێدەکەنی
سەدەی پازدەم بوو کە بینیم
ئەستەرلابێکی کۆنینەی لە دەستا بوو
بەماڵەکەی خۆی نەدەکەوت
کە گەورەترین ئەشکەوتی ئاسیا بوو، پێدەکەنی
سەدەی شازدەم بوو کە بینیم

لەگەڵ هاملێتی شەکسپیر
باسی گومانی نەتەوەیان دەکرد و پێدەکەنی
سەدەی حەڤدەم بوو کە بینیم
کتێبی شۆڕشی فەرەنسای دەخوێندەوە و
تەرمی دانتۆنی لە کۆڵا بوو پێدەکەنی
سەدەی هەژدەم بوو کە بینیم
شووشەی سەری خۆی دەشکاندو پێدەکەنی
سەدەی نۆزدەم بوو کە بینیم
مانیفێستی کۆمۆنیستی دەخوێندەوە
مەهاباد و لەشکری سووری تیا نەبوو پێدەکەنی
سەدەی بیستەم بوو کە بینیم
سەیری شۆڕشگێڕەکانی دەکرد پاساو بۆ
خەنجەرەکەی پرۆتس دەهێننەوە و
نوێخوازەکان پاڵتۆی سەلەفییەتیان
لەبەر دەکرد بەحەسرەتەوە دەگریا
منیش لەسەرەوە بەهەمان رێ
ئەو رێیانەی دەچوونەوە سەردۆزەخەکەی دانتی گەڕامەوە
سواری پاپۆڕە شڕەکەی سەدەی نۆزدەهەم بووم
لە سووچێکا بینیم، خەمەکانی خۆی دەژمێرێ
باسی بەلشەویك دەکا و سەرسام بووە
پەیتونەکەی سەدەی هەژەدمم دۆزیەوە و
گەڕامەوە لە دوورەوە بینیم
سەیری کوپەی شکاوی بەهاکان دەکا و
بەدیار قەتڵوعامی ئەرمەن سەرسام بووە
دەستم کردە ملی سەدەی حەڤدەم
گوتم، با بچینەوە دەشتایی

بینیم لە پەنای درەختێکی چەماوە
دەفتەری یاداشتەکانی دەسووتێنێ و سەرسام بووە
لە گوندێکی سەدەی شازدەم ویستم بحەسێمەوە
بینیم بەدیار قەڵای ڕماوی میدیادا
سەیری پەیکەرەکەی کوروش دەکا و سەرسام بووە
لەسەر کەناری سەدەی پازدەم دا
گالیگۆلا لە بانکی خوێن دەهاتەوە
ئەوم بینی ئاگر لە چاوی هەڵدەڕژا سەرسام بووە
لە ئاهەنگی سووتانی کتێبی سەدەی چواردەم
تازە بەهار خونچەی دەدا
بینیم باسی زستانی ئەقڵ دەکا و سەرسام بووە
چوومەوە نێو دوا ڕۆژەکانی سەدەی سێزدەم
بینیم کتێبەکەی حەللاجی پێ بوو
سوڵتانەکانی بەردباران دەکرد، سەرسام بووە
لە پرسەی کتێبەکەی عبدالخالق دانیشتبووم
کە سەدەی دوازدەهەم بوو
بینیم ڕیشێکی تەڵخ و دەستکردی
دەسووتاندو سەرسام بووە
سەدەی یازدەم بوو بیابانێ نائومێدی لە دڵ نابوو
کە لە سەدەی دەیەم نزیك بوومەوە
لە دوورەوە دیاربوو لە تابلۆی
پاییزی دڕندانی گۆیادا ڕاماوە و سەرسام بووە
بەپەلە چوومە ناو خەتی سەدەی نۆیەم
ئێوارە بوو بینیم بەسەر دوندێکی دەرسیمدا
سەیری دەروێشەکانی زەردەشت دەکا و
لە ئاگردانی خۆرەتاو سەرسام بووە

دڵم توند بوو کە خۆم لەناو بەندیخانەکانی
سەدەی هەشتەمدا دۆزییەوە
بینیم لە پەنجەرەوە دەڕوانێتە ئەو مەلانەی
لە ئاسمانی شین هەڵدەفڕن
بەدەم شیعرەکەی ئازادی ئەراگۆندا سەرسام بووە
بانگی هاوەڵەکەم دەکرد کە سەدەی حەوت ڕاینەگرتم
بینیم خۆی ومەولانا و نالی لە کونجی مەنفای غوربەتا
لە زیکر و فیکری خاکا بوون سەرسام بووە
وەکو تیری بەربووی کەوان ڕامکرد
سەدەی شەش بوو شکایەتم لەبەختی خۆم دەکرد
بینیم چراکەی دیوژین دەشکێنێ و سەرسام بووە
کەوتمە سەر ڕۆمانی سەدەی پێنجەم
دیاربوو ڕاسکۆلینکۆف
تەوری حەقیقەت دەشکێنێ و سەرسام بووە
هاوڕێکەم لە سروودەکەی ناڵەی نەیدا
منی بردەوە سەدەی چوار
ینیم تازە زنجیرەکەی تراژیك
دەکاتەوە و سەرسام بووە
سەدەی سێهەم بوو لەبەر دەرکی سەرا
بینیم خوێنی سەر شووشەی
یادگارییەکانی دەسڕییەوە
تنۆك تنۆك فرمێسکی دێتە خوارەوە
گوڵی نەمری دەژاکاند، سەرسام بووە
کە گەیشتمەوە سەدەی یەك
هاوارم کرد ئەیدۆست
ئاگری شۆڕش کوژایەوە

بەسەرچوو زەمەنی ئێمە
بینیم بەسەرسامی بانگی کردم و
چووینە سەر گردەکەی بابان
لە دوورەوە بەیەکەوە سەیری سەرابمان دەکرد
سەراب ، سەراب ، سەراب

تێبینی: لەم شیعرەدا مێژوو پەرش و بڵاوبۆتەوە و جێگۆڕکێی پێکراوە.

## درەختی درووود

خەونێك بوو ئاگر بۆ دڵۆپ دڵۆپ ئاوی دەنووسییەوە
نامەیێك بوو با بۆ گوڵە هەرمێکانی دەبرد
تەمێك بوو بە باوەشێ باران بۆ سەفەر دەچوو
ڕەوە مەلێ لەناو تەرزەدا
گیای نەمرییان بۆ چیا دەبرد
پریاسکێ پڕ بوو لە گەڵا و گوڵ
تازە لە گەردەنی بەهار ڕژابوون
هەنگاوێکم لە خۆرهەڵات گۆرانی بۆ فاتیمە دەچڕی
یەکێکیشم لە خۆراوا
شوێن پێی گوڵەکانی بۆدلێری دەدۆزییەوە
ئامۆژگارییەکانم چەخماخە بوون
مناڵان ئاگریان پێ لە خەرمانەی زوڵم دەدا
خەرەندەکانی سەریان بە کتێبی ئاڵ پڕ دەکردەوە
سواری پشتی ڕستەکانی دەبوون
دەچوونەوە باخچەکەی میدیا
ئەو باخچەیەی بە باوەش گوڵی
بۆ سەر زەوی دەبەشییەوە
خۆی تاقە گوڵێکی بۆ نەمایەوە
نەیانبینی تەنها ئەو کاتەی
چوونەوە سەر قەڵاکانی مێژوو
کە هێشتا بۆن و بەرامەی
تاج و شمشێری لێدەهات
ئەو قەڵایانەی دیاربوون و دیار نەبوون
بە ئاستەم فەنەرەکانی بەسەر منارەکانی بابلەوە

ێمای سووتانی کتێبخانەکانیان دەدا
لەوێ بەدەنگی بەرز هاواریان دەکرد
ئەی پیر، پیری حیکمەت و ڕێبازی ڕووناهی
فێرمان بکە چۆن لە بەندەرەکەی دالانپەڕ
بەکەشتییە سەرخۆشەکەی رامبۆ
نوقمی شیعر بووین
هاواریان دەکر
ئەی پیر ئەوە چ سەمایێ بوو
منالەکانت پێگەورە کرد
گەورەکانت پێ کردەوە منال؟
ئەو هەموو زۆربایەت دا بە وجوود
ئەو کات من لە قەراغ ڕووبارە خەمگینەکانی سیوەیلدا
کە غیلمانەکانی لە کاغەز بوون و کچەکانیشی لە پەری
لەناو چرپە پڕ لە گەلا پرتەقالەکانی مەستوورەدا
کە ئەردەلانی لەناو عەشقدا
شەلالی مەستی دەکرد
خەریکی سەفەر بووم
بەسەر ئاوازەکانی داود بۆ ستانبۆل
تا لە ئاستانەی کەشیدە پڕ لەجادووەکانی سوولتاندا
تەلەسمی هەزار سالەی خۆمان بکەمەوە
هاوارم دەکرد
ئەی پیر تۆزێ سەبرکە هێشتاکە
کتێبە جوانەکانی خۆم تەواو نەکردووە
کە بێنازترین منالن لەناو باراندا
ئەی پیر هێشتا زووە دوا پێکم هەلنەداوە
دونیا نوقمی حەقیقەت کا

لێگەڕێ با چرایێ داگیرسێنم
دەرگا ببەخشێتەوە قەڵاکان
ئەو قەڵایانەی لەوەتەی هەین
لێیان دادەبەزین و بۆ هەرگیر ناگەڕێینەوە
تۆ نوورێکی لە مسك
شەوقێکی لە شمشێر
یاقووتێکی لە بێداری
قەدەرێکی لە سیحر و تەم
بەم هەموو گەرمی و سەرمەستییە مەلە
لەنێو باخی گومان مەکە ژەهری هەلایە
بچۆرە ناو ئاوێنەی سەما
سەمایێ لە شەونم و شەونمێ لە شەوبۆ
تۆ پەیکەرێکی لە نیگەرانی
تەمەنێکی لە ڕامان
بگەڕێوە لیرەی یادەکانت دەبریسکێنەوە
تۆ دەفڕەنی ئومێد و
فلوتڕێژی خەمباری
تاوێکی لە باران
ڕێژنەیێکی لە عەتر
بیرم دێ کە یەکەم جار
لەگەڵ مانگ سەفەرمان کرد
لەناو گەڵایێ ئاهەنگمان گێڕا
قەدی درەخت دەگریا
ئەوسا تۆ لکە گیایێ بووی لە خوناو
دڵۆپە فرمێسکێ بووی بەسەر پەڕی تاووس
ئێستا پەنجەرەیێکی لە دیوانە شیعری ئاوابوون

چەند دڵۆپە حەسرەتێکی
بەسەر کڵپەی زەمەنەوە
لەو دەمانەی کە نەواییێکی حەزین دێ
لە موناجاتی سەحەردا
شەوێکی لە مەیخانەکانی ئەندەلووس
لە قەتارەی مەولەویدا سەرخۆش دەبی
هەستەوە سەرپێیەکانت
تا دونیا ببینی ئەیدۆست
ئەوەکا ناڵەی نەوایێ ببیستی و تا ئەبەد ژێر نەبیتەوە
کە عەتری ئەشق پرژا تازە کۆناکرێتەوە
مەرۆ تەمە با لە چاو ون نەبیت،
ئۆدیسە تا ئێستاش نەگەڕاوەتەوە
یادستان گۆڕێکی دژوارە ئەگەر بەدوای حیکمەتەوەی
کە سەرزەمین خاڵی بووە لە حیکمەت
دوورە هێجگار دوورە ئەو شارەی بۆ دەگەڕێی
دیارە و دیار نییە
لەو شارە کە باخ و باخاتی زۆرترە لە حەسرەت

## لەوانم چاوپێکەوتن

لێرە ڕەتبوون
جووتێ گەوهەر، سەفەریان بۆ ناو قەدەر بوو
شکان لەنێو شیری سەفا
جووتێ ئەڵماس، مرازیان مەرقەدی ڕۆح بوو
لەنێو گۆڕەکاندا ون بوون
جووتێ جەستە، ئومێدیان یۆتۆپیا بوو
ئاگری زیوەس قووتی دان
جووتێ بەللوری ئەشکەوتان
ترووسکیان لەپی زەردەشت بوو
زناری کەمەریان سووتا
نوقم بوون لەناو ئاماژە
جووتێ شمشێر، تینووی جەستەی حەقیقەت بوون
سوور هەڵگەڕان لە تریفە
بێرە ڕەتبوون
جووتێ برین، دەگەڕانەوە ناو چەقۆ
ئازاریان تا سەر تابووت بوو
جووتێ مەرهەم، هەڵدەپڕژانە سەر مێژوو
کە تۆزێ غوربەت ڕماندی
جووتێ خەون، دەچوونەوە بۆ لای بوزا
لە مەرکانەکەی هیندۆسا بخۆنەوە
جووتێ مێژوو، یەکیان سپی ئەوی تر ڕەش
دوو ئەتڵەسی نامرادی
جووتێ دیوانی مەولەوی، پڕبوون لە قەتارەی حوزن
دایانە شەققەی باڵ فڕین
لێرە ڕەتبوون

جووتێ شەپۆل، لە ڕووبار هەڵگەڕانەوە
لە تەك گوڵی بۆتان مردن
جووتێ کانی، بۆ لای دەریا وەکو هەڵم بوون بەباران
جووتێ شاعیر، یەکیان ڕیا یەکیان تابان
جووتێ عاشق، دەچوونەوە ناو نیرڤانا
بێرە ڕەت بوون
جووتێ پێڵاو، دوو جەستە لە بەها شۆراو
کوورەی ڕقیان دەبەشییەوە
جووتێ شەریك، چەند ڤێڵێك و سەبەتێ خوێن
دونیا سوور سوور هەڵدەگەڕا
جووتێ باز، قەنناسێك لە تەم
لە شەختەی گومانی گرتن
جووتێ شەیتان، قەدەری کەونیان دەسووڕان
جووتێ ویژدان، باوەشێ میهر
بوون بەحیکمەتی بێ میسال
لێرە ونبوون
جووتێ  پاکی، بوون بەپەیکەری یادگار
شکان لە ترۆپکی بابان
جووتێ لە زات و لە جورئەت، دەستەمۆیی ڕایتەکاندن
چوونەوە ناو باخی مەرگ
جووتێ لە بەها و لە پایە، ڕۆژگار هاڕینی وەك بەرداش
بوون بە یادگاری چوار چرا
جووتێ لە ئەشقی پەرستگا، ئارمووشی ئامون داپۆشین
تۆپەکەی میریان کردەوە
لێرە ونبوون
جووتێ لە تریقانەوەی مناڵی، پیری دەستی پێ شلکردن

پێکی ئاسۆ دەخۆنەوە
جووتێ لە دەرسیمی تازە، کەوتنەوە ناو زمانی لاڵ
لەناو تابووتی ئاماژە
جووتێ لە ڕەندی و پیاوەتی، شەکەتی وێرانی کردن
وا کتێبی بێ هوودەیی دەنووسنەوە
جووتێ باوەش، پڕبوون لە خەنجەر و شەوبۆ
نامۆبوون لە شارستانی
لێرە ونبوون جووتێ لە میهری ئاسمانی
لە دووکەڵی گوناهاندا توانەوە
ئێستا لە مەداری باشوور با مەزاریان دەشواتەوە
جووتێ لە زانستی باڵابەرز،نوقمبوون لە زەین کوێری
ئێستا لە حوجرەی سەرەتان
جووتێ سەدای هەنگویناوی، کەوتنەوە سەر ژەهری هەلا
جەستەیان بوو بەنیلۆفەر
جووتێ لە تەونی ئایندە
لە دەریالووشی ئێستا ئاسێ بوون
هەلەکە سەما ڕایگرتوون
جووتێ لە نەخشەی کیانێ، گۆڕدرایەوە
بەزەمبیلێ لە ترس و سام
لێرە ونبوون
جووتێ لە قافیەکەی نالی، شێوا لەناو تای نەفامی
مەخابن بوو بە ئەزەلیان
جووتێ چیرۆکی دەرسیم، پڕ لە هەڵەی زمانەوانی
غەریبن لە پەڕی مێژوو
جووتێ لە پرووشەی ئاگریداغ
لە شەبەقی خوێندا گوم بوو

کەس بەدادیان ڕانەگەیی
جووتێ لە بەندەکەی سیڤەر، کەوتنە بەر مەقاشی زەمەن
دەیانزانی گەورە دەبن
جووتێ لە درەختی ئەزەل، وەرین لەناو نەهامەتی
تاقە برینی سەر زەمین بوون
لەوانم چاوپێکەوتن

## شەممەکان

شەممە چوومەوە دەشتە مەرجانییەکانی جاران
گۆرانییەکم چڕی لە سیبیریا تەمی مەنفای ڕەواندەوە
یەکشەممە لە بەرهەیوانی ماڵەکەم
لە تەیراوە پشییە خەوێکم کرد
لەسەر دیوارەکانی باستیل قۆڵبەست کرام
دووشەممە چوومەوە سەر گۆڕەپانەکەی ئاوبار
تازە خەڵك لە سەیران دەچوونەوە
لە بن میترۆکانی بەرلین خستمیانە قەفەزی تاوان
سێ شەممە سەرێکی زاهیدەی خوشکم دا
داوام لێکرد چاییکم بۆ چێکات
بۆنی قەڵەمەکەی باوکمی لێ بێ
لە کاتدراڵی فاتیکان فەرشێکیان لێ چنییەوە
چوارشەممە جەژن بوو
هەموو هاوڕێ کۆنەکانم کۆکردەوە
چووینەوە بن لەیلوگەکانی قەبرستانی چراغ
سواری هەمان پەستەکەی بەر لە چل ساڵان بووینەوە
هەریەکە و بەتیلمە دەفلسێ
دەچووینەوە یۆتۆپیای عەنکاوە
لە باخی لێوار شەقامەکانی ڤیەننادا بوو بە فرمێسك
پێنج شەممە: بەدایکمم گوت کە ناوی
عائشە عبدوڵلا کارەسوڵە
توخوا بۆ دواجار دەستم بگرە و
بابچینەوە ماڵی پلکم ڕەحیم

بەڵکو نوقڵەکەی جارانم بداتەوە
لە گەڕەکە میللییەکانی سوریا
بوو بەغەریبی و بەشرایەوە
ڕۆژی جومعە هەر شەش ڕۆژەکەی ڕابردووم خوێندەوە
شەممەیان: نامەیەك بوو
تەمی مەنفای سیبریای تیا
هاتبووە خەونی گۆرانییەکەی من
یەکشەممەیان: تەزووێ بوو
یادگاریم بوون لە ژوورەکانی عومر دیل کرابوون
دووشەممەیان: لەززەتێ بوو
پیری هەوەسی پێ هەڵچنی بووم
سێ شەممەیان: خەونێ بوو
مەیدانێك ئایدیای تیادا پیر دەبوو
چوارشەممەیان: لەرزینێ بوو منداڵیم فرمێسکی پێ باراندم
پێنج شەممەیان: تریفەیێکی وێڵ بوو
تەنهایی بوو ڕۆحی لە سێدارە دابووم
جومعەکەشی: کابووسێ بوو
لە دەفتەرێکی خەت شاشی غەمگین دەچوو
شەممەی بەئاگر نووسیبوو
یەکشەممەی بە نوور
دووشەممەی بەشیر نووسیبوو
سێ شەممەی بەتیر
چوارشەممەی بەگوڵ نووسیبوو
پێنج شەممە بە شەڕاب
جومعەکەشی بەدووکەڵێکی سپی غەمگین
لە شەممەم پرسی ئەی کوانووی زەردەشت

دڵم تەنگە چی بەپیری دڵم بڵێم تا نەختێ هێور بێتەوە
بەیەکشەممەم گوت ئەی پەناگای خوداوەندی
عومرم پڕ بووە لە زوڵمەت
ئاسکی پڕووشکێکم پێ ببەخشە
لە دووشەممەم پرسی ئەی پەرستگای منالّی
چاوم تاری بوو سۆماییم داهات
تروسکێ بیناییم پێببەخشە
بەسێ شەممەم گوت ئەی پەیکی کەڵکوژ
کەی هەردوو چاوی ئاسك گڕت تێ بەردەدا
لە چوارشەممەم پرسی ئەی باخی ئیرەم
دڵم لە عیشق چکی کرد تۆزێ دڵنەواییم کە
بەپێنج شەممەم گوت ئەی خەڵوەتگای باخۆسی
وەڕسی گیانی تەنیوم وەرە ئاگاییم وێران کە
لە جومعەم پرسی ئەی لێوارەی دۆزەخ
بریا چەند مانگێ سەفەرت دەکرد
دووبارە کوکوختیەکەم دەستی بەخوێندن کرد
هەموو ڕۆژەکان لە گمەیا توانەوە

## پیاوەکانی جەنگەڵ

لە سپێدەی خوێن و لە یەقینی ژەنگ و ژاری ئایدیاوە
لە پشت شووشەی شەو گرتووی شەوستانەوە بانگم کرد
کە هێشتا کازێوە سەری بوتڵی سەفای نەشکاندبوو
بۆ سەر مێزی چەقۆ
درەختی مەرگ کفنی نەبەخشیبوو بەنەمیری گومان
هێشتا نەفرەتی خێڵ نەتکابووە سەر جەستەی پاکیزەیی
لەوسا یەکەم قەترەی خوێنی براکان
لە ژێر تیشکی خۆرەتاودا
بەسەر ئاگردانی مێژوو دەبریسکایەوە
یەکەم تیلمە نانی لە شەراب هەڵاتووی مەسیح
ڕەمزی تەوقەی جوانی بوو
لەو ڕۆژەوە زەوی داخرا و دەرگای جەنگەڵەکان بوونەوە
لە دوورترین قەڵای ژاڵە و چەمی ژەهرەوە هەڵدەکەن
لە تاریکترین ئەشکەوت و لە سامناکترین
جۆگەلەی خوێن و خیزاو
لە کەڤنارترین جەنگەڵی ڕەشەتای زەین ڕێدەکەن
دەمار دەمار جەستەی سپی نیلۆفەر و
ڕێ ڕێ درەختی ڕۆحی گەش هەڵدەپاچن
لە ناوەختەوە، لە تاریکە شەوانی درەنگ و
لە کازێوان، لە چلەی زستانانەوە ڕادێن
وەك چەند ڕۆحێکی لەبەنووسی و
چەندین هەزار ڕوخساری سارد
لە ناو بەرائەتی منداڵیمانەوەڕا دێن
لە خەرەندی ڕابردوومانەوەڕا دێن

له هەموو ئەشکەوتێکەوەڕا دێن
له دەرگا و پەنجەرەکانەوە، له ڕەفەی کتێبەکانەوە
له درزی قەڵەمەکانەوە، له منارەی مزگەوتەکانەوە
له پەیتوونی کڵێساکانەوە ڕا دێن
پیاوەکانی جەنگەڵ هەمیشە له تەمەوە دێن بۆ تەمتوومان
له کوێ حەرفی کازیوە هەبێ لەوێوە دێن
نایەڵن سپێدە هەڵبێ
که دنیا هەمووی تژی نوور بوو
ئەوان چەپك چەپك دەیانچنی و دەیانخستەوە ناو دۆزەخ
له قووڵایی دیرۆکەوە، که حەرف حەرفیان ئەزبەرە
له ڕەشەبا و ڕەهبەت و ڕمانەوە دێن
که تاڵ تاڵ تاریکییان چنیوە
له دەرگای هەزار دەری گومانەوە دێن
که ڕێ ڕێ شارەزای دەروونن
له شەوەزەنگ و شەبەیخوونی تۆفانەوە دێن
که باوەش باوەش خنکانیان پێیە
پیاوەکانی جەنگەڵ هەمیشە له نێو پاوانی گوناهەوەڕا دێن
له نێو شەوی شەهلا و شەهێن، شڕ و شەپال و شەکەتن
له نێو ڕم و ڕمبازیدا ڕەوت و ڕێباز و ڕەهزەنن
له نێو زریان و زێراب و زەنەکدا زاوزێ دەکەن
له نێو کوشتاری کازێوە و کەزیی کاڵ و
کل و کانیی کامداران
پیاوەکانی جەنگەڵ هەمیشە حەزیان
له بریسکە و زرمەی شمشێرە
له نێو کووچەکانی جەستەدا حەماسیان دادەکەوێ و
شەهوەتیان بەتاڵ دەبێ

لە تاریکی و پشت پەردەکان نەخشەی خۆیان دادەڕێژن
تا چەقۆکان بەسەر پشتی سەدەکانی ناوەڕاستدا
بگوازنەوە ناو ماڵی جوانی
دە دە، بیست بیست، کۆمەڵ کۆمەڵ، لەشکر لەشکر
وڵات وڵات، قارە قارە
لە ژێر تریفەی مانگەشەو کۆدەبنەوە
تا دەمی تەورەکان تیژکەنەوە
بچنەوە سەر تەهارەت و پاکیزەیی
پیاوەکانی جەنگەڵ وەك ڕم وان
هەمیشە لە ڕۆح لانە و
لە ژێر پرووشەی خوێن سەما دەکەن
پیاوەکانی جەنگەڵ شەوانە خۆیان و کەوڵی گورگ
دەچنەوە بێستانی ئاسمان و شەمامەی ستێران دەدزن
داسی ڕق تیژ دەکەنەوە و تریفەی مانگ دادەپاچن
بەڕۆژ دەچنەوە لای ئاسنگەرەکانی زوڵمەت
داو داو دەیانکەن بەشمشێر
لە کەنارەکان هاژەی ڕووبار کۆدەکەنەوە
خوڕ خوڕ دەیانکەن بەئاژێر، ترس و گومان دەبەشنەوە
ورشەی گەڵا و شنەی ماندوو لە بوتڵەکانی شەراب دەکەن
بەڕۆژ دەیانکەن بەژەهر
دابەشی سەر باخچەکانی شاری دەکەن
پیاوەکانی جەنگەڵ هەمیشە لە تاریکترین ئەشکەوتدا
لە بڵندترین بورجی شار، لە ناو قووڵترین چاڵی بیر
لە مەیدانی گەرمترین جەنگی بێهوودە
نەخشەی خۆیان دادەڕێژن
نەخشەیەك بۆ ڕۆحی مرۆڤ

تا سەر زەوی چۆڵ بێ لە خەون
نەخشەیەك بۆ گەردنی گوڵ
تا سەر زەوی چۆڵ بێ لە عەشق
نەخشەیەك بۆ باڵای جوانی
تا سەر زەوی چۆڵ بێ لە ڕووناکی
نەخشەیەك بۆ بۆنی کتێب
تا سەر زەوی چۆڵ بێ لە بەها
پیاوەکانی جەنگەڵ وەکو لەبەنووس وان
هەرگیز لە شەو جیا ناکرێنەوە
پیاوەکانی جەنگەڵ حەربان، حەربا ئەمانی بۆ نییە
پیاوەکانی جەنگەڵ چەند ناشیرینن
دەڵێی لە دۆزەخەوە هاتوون
پیاوەکانی جەنگەڵ کیمیازانن دەڵێی کیمیاگەرن
پیاوەکانی جەنگەڵ هەمیشە تەوتێکیان لەسەر شانە و
لە ژێریشیەوە نارنجۆك
ئای پیاوەکانی جەنگەڵ چەند زۆرن
دەڵێی لەشکری دەجالن
ئای پیاوەکانی جەنگەڵ چەند کەمن دەڵێی هیچن
هەندێ جار لە خۆرهەڵاتەوە دێن
هەندێ جاریش لە خۆراوا
هەندێ جار لە باکوورەوە دێن
هەندێ جاریش لە باشوور
دێن، دێن، دێن
لە سەرەوە، لە بنەوە، لە ناوەندەوە، لە پەڕگەوە
جەستەکانیان هولامین، بەهەموو شوێنێکەوە دەچن
پیاوەکانی جەنگەڵ مایەی گریانن

هەموو شتێکیان لا دەست دەکەوێ
ژەهر، گوللە، چەقۆ، شمشێر
تیر و کەوان، کۆت و زنجیر
بڵندن، نەوین
بەڵام ئەوەی پیاوی جەنگەڵ ڕێی پێ نابا
پاکی و گوڵە، عیشق و ئەوین

## سوندسییەکان

1

کە لێوە جێدێڵم، ڕێبواری ناوەختەم لای ئێوە
هەر بۆیەش دەچمەوە لای گۆڕی دۆستانم
دەزانم ڕۆژێ دێ میوانی ئەبەدی ئەوانم

2

تەواری تاوێر و ناو تەمی ترۆپکان
شەرمنن پەی نابەن بەپاوانی پیریم
کە تافتەی ڕۆحی خۆم لە چاویان شووشتەوە
بوومەوە مناڵەکەی جاران و
تك تك شیر لە گۆپکەی زمانم هەڵڕژا
چوومەوە یۆتۆپیای جارانم

3

تاوێ باران لە تارای تابان بانگ دەکەم
وەرەوە مەرجانی ئاسمانی
بەرامە و بەهمەن و بادام و باقەبێن
داسماڵ و داب و دادی خۆمان
بەینەوە دارستان
لە مەستی مەلەی مانگ و
لە بادی بەهێدا باڵ بگرین
لە جوانی و جیلوەی جامی سەفا بخۆینەوە

4

با لە باڵام لوولدەم

کۆشێ لە کراس و کینواڵی کێوەکان دەلوێنم

بۆ تەرمی تاگرتووی ئازیزێ

هاودەم بوو بۆ ڕۆحی شکاوم

مشتێ ماچ لە ماتابی مارسیس بۆ دڵم دەهێنم

ئەو دڵەی شووشە بوو شاشەوقێ شکاندی

ئەو دڵەی لە زەردێنەی زیبای زەهمان بوو

برینی بازوبەند باڵی کرد

6

چەند چەمێ چەمانە لە چوارینی چاوی چوارشەممە

دەنێرمە لای کچانی بابل

کچانێ بەتەنها دووجاران لە دەرگە ترازان

جارێکیان ئاسۆیی شوو دەکەن

جارێکیان ستوونی کە دەمرن

شای بابل بۆ خاتری ئەمیهیا نائومێدی کردن

کە تووشی تەماشا و تەلاری میدیا بوو

باخی هەڵواسراوی بۆ باڵای دروست کرد

## فریا نەکەوتین ئەی دۆست

1

ئەوە چ قەدەرێکە نەمریمان لە بنی مەحاڵ دۆزییەوە
لەسەر زەویمان فڕێدا
ئەی پرسەدارترین کاژ و پڕ شکۆدارترین زێوانم
ئەوە چ پەندێکە شەڵاڵی شەهد و شەهادەت
لە مەڕمەڕی جەستەکانی خۆمان نووسی و
بەپاچی ڕم و تیری گومان هاتین و ڕەشمان کردەوە

2

چەند حیکمەتە
واز لەو شمشاڵە بێنی و بیخەیتەوە کەمەری خۆت
کە دەبینی ڕۆما گڕی تێ بەربووە و زەنگی کڵێسا گریانە
ئەوە نییە کتێبەکان کڵپەیانە
زەوی خاڵی دەکەن لە حیکمەت

3

چەند حیکمەتە دەست لە گۆرانی هەڵگری و
لە دوورەوە سەیری کۆشکە تاق بەرزەکانی قەڵاکەی
دەڵێی پەیکەرێکن لە سام و قەڕنەفولێکن لە دووکەڵ
ئەوە چ قەدەرێکە ئەو شارە هێندە هەناسەی سوارە
فریا نەکەوتین ئەی دۆست پەنجەرەکان بکەینەوە
تەیری کوێستانیش تێپەڕین

4

چەند حیکمەتە دەست لەو خەونانە هەڵگری کە دەبینی
زولفەقارەکەی دیموکلیس بەسەر تەختی تەوێڵتەوە
ئاهی کۆترە کێویلکەکان ڕایگرتووە
ئەی ماتەمترین ئازیز و ڕەوحانیترین شکۆدار
ئەوە چ قەدەرێکە دەستی ناوەتە نێو دەفەی ئەندێشەمان
ئاوا ڕۆحمان پڕوکاوە

5

ئەی تاقانەترین هاوڕێم و بێهوودەترینی هەمووان
کە سەر و ڕیشت خەم نەبا
عومر هەرگیز نەیدەبردەوە بەفرستان
ئەی قەدەریترین ئینسان

## گەمەی دژەکان

1

بەسەر تەختە شەترەنجەکەی لاتین دا
شێتانە گۆرانی دەچڕی
بێهوودە گەمەکانی خۆی دەکرد
گۆرانییەك بۆ مەرجانی خاك
یەکێك بۆ سەما
گەمەیێك بۆ درەخت و جوانی
یەکێك بۆ دەقێکی جاویدانی
هەموو سەربازەکانی تەیار کرد
سەربازێ بۆ دەرگای قەڵا
سەربازێ بۆ هێنانی ئاو
سەربازێ بۆ پەڕینەوە بەناو تێلدڕ
سەربازێ
سەربا
سەر

2

هەموو فیلەکانی خستە سەریەك
فیلێ بۆ تفاق و تۆفان
فیلێ بۆ گواستنەوەی شازادە
هەموو ئەسپەکانیشی زیندا
ئەسپێ بۆ حیلە و خرۆش
یەکێ بۆ تاودان
خۆشی بەسەر بیرە ئاوەکانی قەڵاوە
هاواری کرد

بەرەو مەیدان
بەڵام ئەژدیها هەر مایەوە
3
ئێستاش پێکەکانی خۆی هەڵدەدا
کشێ نەیتوانی تەخت و تاراجی وێران کات
ئەسپێ نەبوو بە کورژنێ پەلبەستی کات
فیلێ نەبوو بەکەڵبەی عاجی لوولی دات
بەتەنها سەربازەکان
بەسەر خانە سپی و ڕەشەکانەوە
لە خوێنی خۆیان دەگلان
ڕۆخانە دوورەکان
سوور دەبوون لە گەوهەری خوێن
یەکە یەکە دوا ئاوڕیان لە قەڵا دەدایەوە
ئاوڕێ بۆ گوڵە جوانەکانی سەربانی قەڵا
ئاوڕێ بۆ دەروازەی ڕماوی قەڵا
ئاوڕێ بۆ کچە جوانەکانی بەر پەنجەرەی قەڵا
قەڵاش دوای ڕمانی وەزیرە جوانەکەی
دوای سینەی کون کون بووی مەلیك
تەنها، تەنها هەر بەتەنهایی مایەوە

## ئای دڵەکەم

1

ئەگەر ساتێ لە ناو لەپی دەستم دەبووی
هەتا دەمتوانی دەمکوشیت
تاکو دەبووی بە دڵەکەی مناڵیم و
ئازادم دەکردی لە خۆم

2

ئای کە ڕقم چەند لە خۆمە
کە زیندانی ئەبەدی تۆم

3

مەل بوون پڕاوپڕی باڵەکانیان
فڕینیان بۆ دەهێنام
کۆمەڵێ سەوسەنی ڕۆح بوون
بۆنی چیا و کێوی دووریان بۆ دەهێنام
ڕەفێ کتێبی خەمگین بوون
گەوهەری مانایان پێ دەبەخشیم

4

دەنگی دەف و دەفژەنی وان
هەڵدەڕژایە ناو ناخی من
ڕەنگی تێوارەئاسایان، تێکەڵ بەڕەنگی من دەبوو
ڕەوێ نەیژەن دەتگوت پەرین
لە ئاسمانەوە هاتوونە، سەدایان کەونی دەگۆڕێ
مەستیی حوکمی دونیای دەکرد

5
وامدەزانی کەنیزە جوانەکانی باخچەی سەما
پارچەی مەرجانی شکاون
یا گەڵای زیوینی پاییز
بە سەر ئەرشی خوا ڕماون
6
تا دەهات تەم خەستتر دەبوو
بەفر بوو لە ناو شووشەی کەون
کۆمەڵێ تاووسی ڕێ بوون
وەك ئاگر
نەء وەکو شمشێری ئەردەڵان
لە ناو لەعلی ئەنگوستیلەکەی میدیاخان
وەك ئالی دەبریسکانەوە
7
بەپەلە وەك تاوێ بارانێ لە ناکاو
چوومەوە ناو خەڵوەتی کتێب
یەکەم ئاگردانی من بوو لە ناو دڵی وشەکاندا
دوا چرە دووکەڵیان لێ هەڵدەسا
دوا ڕەوە مەلی مێژووی من بوو
تازە زمانی گریانیان لە گومانی هاملێت دەپژا

8

چوومەوە بەر ئاوێنە

بەهەناسەی سارد، بەدەنگێکی کز و ماتەم

گوتم خەمبار مەبە دڵەکەم

تیشکێ لە ئاوێنەی کتێب هەڵسا

کەون یەکپارچە بوو بە زیو

زیو هەمووی ئاگری گرت

وەکو ڕۆحی من توایەوە

بوو بەشمشێر، بوو بەئاگر

9

زەردەشت لە دەخمە هەڵساوە

ئاگردانی گەش کردەوە

یەکەم پێکی خۆی هەڵقوڕاند

مەلەکان هەمووی بوونەوە

دەفڕەن دەتگوت ئاڵەکۆکە

لە ژێر بەفر هەڵدەستەوە

کەنیزە جوانەکانی ڕۆح کەوتنە سەما

نەیژەن لە فیراق هاتەوە

هاوارم کرد هێی دڵەکەم

دەرگای زیندانم والایە

دڵ لە شەققەی باڵیدا فڕی

10

ئێستا تەنهاترین کەسم لەم زیندانە

دوا پێکی خۆم دەخۆمەوە

هاکا بەرەو دوا نیشتمان شۆڕ بوومەوە

## ئەو ئاگرە داگیرسێنەوە مێرێ

هەمیشە لە باخە دوورەکانی دڵ ئاگرێ هەیە
ناهێڵێ جوانی بمانکوژێ
هەمیشە لە نێو خەرمانە شینەکانی دەنگ گڕێ هەیە
ناهێڵێ کپی وەك مەرگ هەڵمانمژێ
کە ئاگرەکانمان کز دەبێ، ئەوە خوێنمانە وشکەبێ
کە ئاگرەکانمان گەش دەبێ
ئەوە دڵمانە لە ناو ئەویندا دەپشکوێ
ئاگرەکە مەکوژێنەوە مێرێ
کێ ئەوەندەی ئێمە لە کڵپەی ئاگر دەگا
ئێمە بەو کڵپەوە ماوین
یەکەم جار باپیرە دوورەکانمان خۆیان پێ دارشت
کە بەئێمە گەیشت نەوەیێکی پەرتەوازە بووین
یەکتریمان نەدەناسییەوە
ئاگر بوو هەندێکی وەك پەمۆ لە باکوورەوە هێناوە
هەندێکیشی لە باشوور
باڵێکی لە خۆرهەڵاتەوە هێنا
باڵێکیشی لە خۆرئاوا
ئێستا هەموو جەستەمان ئاگرە، ئاگر
کە دەست بەرز دەکەینەوە
هەموو کوورە ئاگرەکانی کەونار دەبینین
کە گۆرانی دەڵێین
هەموو پەرییەکانی میدیا سەما دەکەن
کە شین دەگێڕین
مردووەکان زیندوو دەبنەوە

وەرنەوە شەوقە جوانەکانی نەرگز
بۆ کەنارەکان بەرنەوە
وەلێ هاوارەکانم لەزمانم رەت نەدەبوون
وردە وردە جوانییەکان هەڵدەپرووکان
کەون رەش هەڵدەگەڕا
ئاگرەکان دەکوژانەوە
بوون دەتوایەوە
دڵۆپ دڵۆپ وردوخاش دەبوو
ئەمە ئەفسانەی دوای نەمانی جوانییەکان بوو
ئەفسانەی دوای کوژانەوەی ئاگرە جوانەکان بوو

## کتێبی خوڵقان

پەنجەرەی تاقبەرزی دڵی خۆم کردەوە
هەر دەڵێی لەو دیوی دونیایە
دونیایێ لە تەمی خوڵقان و شووشەی تەنایی
لە پڕووشەی غوربەت و تەنهایی
لەچرای شکاوی چاوی مار
فریشتەی جەستەی با وەك کچێ چل کەزی
کە باڵای لە ئاسمان تا زەوی درێژ بوو
شەو ئاسا هەڵدەخزی
وەك فەنەر، چل چرا و شەوبۆی نوور
وەك ئاسك، کراوە وەك تاووس
هەمایۆن و هەوری هومایی
بێ پەروا لە پەردە هاتەدەر فریشتەی خودایی
لە پەڕی مراوی و لە جەستەی ئاهودا
با بوو با هەڵیکرد، باران بوو دەباری
گزنگ بوو هەڵدەهات
شمشێر بوو بروسکەی هەڵدەچوو
نەغمە بوو ئەو ناوەی پڕ دەکرد
خەیاڵ و تارمایی
هەم خەون و ئاگایی تێکەڵبوون پێی گوتم
عومرێکی درێژە لەم تەلانە ڕکە وەستاوی
هەزاران هەزار جار بۆ خەرەندی مەرگ ڕماوی
بەڵکو جارێ پەنجەرەت کەیتەوە
منی بای هەڵوەدا بێمە ناو دڵتەوە

تا فێر بم چۆن چۆنی ئەوەندە پڕ مەیل و فراوانی
پێی وتم چەند ساڵە تۆ لە پشت
کێوی سپی کتێبان چی دەکەی؟
هەر ڕۆژە سەرت لە کتێبێ سپی بوو
هەر شەوە دڵت لە ئەوینێ تەڕ دەکەی
عومرێکی درێژە نووری ئەو یەقینە
لە ڕۆحت هەڵدەچێ؟ چی دەکەی ؟

## مارکۆپۆلۆ

خەزنەیێ بوو لە ئاگر
سەبەتەیێك بوو لە سێوی ئارەزوو
بەسەر هەموو عاشقەکانی دەبەشیەوە
خۆی و دەفتەرێ
بەقەد ناو لەپی قەڵەمێ لە مەرەکەبی چینی
چاویلکەیێ لە شووشەی سەمەرقەند
بەسەر تابلۆکانەوە دادەگیرسا
کاتێ لە یەمەن هاتەوە بۆنی قاوەی لێ دەهات
لە دوورەوە سڵاوێکی کرد و شەبقەکەی نایەوە
باوەشێ ئارمووشی بەختەوەری لە ئامێز نابوو
سەرانسەری دونیا گەڕا
ئەو بەختەوەرییەی هەر تەواو نەبوو
نیشتمانی ئەو دۆڵێ بوو یا ئەشکەوتێ
یا دێرێکی کۆنینەی سەدەکانی ناوەڕاست
یا دەروازەی ڕماوی قەڵایێ
یا کتێبخانەیێکی دێرینی بابلییەکان
یا بازێکی گەرمی هیندۆسەکان
مارکۆ هەمیشە وەك مەلێ
دەچۆوە سەر هەموو درەختێ
وەك خۆرێ دەچۆوە سەر هەموو سپێدان
وەك ڕەنگێ دەچۆوە سەر هەموو تابلۆکان
نهێنییەك بوو لە ناو قوتی ئاشکرایی
ئاشکراییەك بوو لە ناولەپی نهێنیدا

## قاپێ مەحاڵ

دوای ئەو تۆفانە تووشەی
هەمووومانی لە ڵم خنکان
دوای ئەو ڕەشەبایەی گوڵەکانی گەنجی بردین
بمگۆڕە ئەو دڵەم پڕ بووە لە یادەوەری تاڵ
یادەوەری شکست و مەینەتی
ورد و خاشبوونی ئێسقان
دڵێکی ترم پێ بەخشە لە گوڵ و ئاو بێ
شەوان خەون و چل چرا بێ
تا بتوانم بەرگەی ئەو زەمانە بگرم
نهێنییەکان بە دەست بگرم
بمگۆڕە لەی جوانترین تابۆ بمگۆڕە
چاوێکی ترم پێ بەخشە
تا قووڵاییەکان ببینم
دەستێکی ترم پێ بەخشە
تا گوڵێکی دیکە بچنم
چاوێ تەنها جوانی ببینێ
دەستێ تەنها بۆ تەوقە بێ
قاچێ تەنیا بۆ سەفەر بێ

## زەمزەمە

بەستەیەك ژەهر بوو دەیچڕی
مسۆگەر دەیزانی بۆ مەرگە
کەوتە سەر زەمین و لەت لەت بوو
دونیا پڕ بوو لەترووسکەی لەشکرو
برووسکەی شمشێران
هەر سوار بوون لە تۆزی شەڕی تووش
خڵتانی خوێن دەبوون
تەرم بوون گەردنیان وەك کوانووی
زستانی قەیسەریان سوور دەچوون
مەولانا هێند بە کوڵ دەگریا
ئەو ناوە پڕبوو لە کۆتر
مێژووی خۆم دەبینی وەك زۆرانبازێکی
هەموو لەش بریندار

## ئاوێنە

ئاوێنەیێك بۆ تۆ
تا قووڵایی جوانییەکانی خۆت ببینی
پەڵە بارانێ بۆ خاك
تا بۆن و بەرامەی نەمری بدا بە ئێمە
ئاوێنەیێك بۆ من
تا لە تەمتوومانی گیانم وەك مانگت ببینم
کانیێ لەگەوهەر تا تریفەڕێژمان کات
گوتم دەشتی پەنجا ساڵ کەم نییە
تۆ لە بەردەم دڵۆپەی شیعردا وەستاوی
پەنجا ساڵ کەم نییە
تۆ بەدوای ئاگرێ دەگەڕێی
نە تیشکی دیارە و نە سووتووی جێماوی
هەمیشە عەوداڵی ئەو ئاسکەی ڕادەکا و ڕادەکا
تا تێکەڵی سەوزەگیای شاخ دەبێ و وندەبێ
بۆ ئەبەد بەدوایدا گڕ دەگری
هەمیشە بۆ دەنگێ گوێ دەگری
نازانی لە کوێوە هاتووە و چی دەڵێ
پەنجا ساڵ کەم نییە
تۆ هەموو ئاوێنە جوانەکانی ڕۆحت بەشییەوە
ئەوێستاش بێ ئاوێنە ماوی
ئەو دەنگە هاواری سێوێ بوو لە دەستی کچێکا
بێ دەنگی هێشوێ ترێ بوو
بەسەر پەلکی گەشتی مێوێکا
تۆ کێی ئا تۆ کێی؟

ئەمەیان دەنگێ بوو وەك گلە و گازاندە
کە پرس لە باخی نەی دەکا
قسەی ئەو نەخشی سەر بەردان بوو
تەونە جوانەکانی کاشان بوو
من هێندە سەیری ئاوێنەم کرد
تا لە ئاوێنەدا ئاسێ بووم
ئیدی بۆ ئەبەد نەمتوانی
لە ناو جیوەی ئاوێنە قوتار بم
ئێستاکە من خەمگینترین ڕوخساری سەر زەویم

## ورتە ورت

ئەسپەکەم تاپۆی بوون و مانم ڕێکەوە
ئەم هەورە تووڕەیە ڕێیداوە
تاسەیێ دەروونم دەسمێ
ئاگری چیایان لە پێدەشتی دڵم بەردەدا
دڵیشت بۆ هەوای کوێستانان
هەناسەی ئاگرین سەردەدا
ئەو ڕۆژە بەفر بوو
سواریش ئەسپیان بەستەوە
دەچووم و ئەسپی خۆم تاو دەدا
پێم دەگوت ماڵەکەم ڕێکەوە
پێم دەگوت ئەسپەکەم لە بیرتە
بەسەر پشتی تۆوە گەردەنم ماچ دەکردی
کریڤ و سامانم لە بیرتە
سەفەرمان ئەودیوی چیا بوو
زریانیش تا دەهات دایدەکرد
ئەسپەکەم زیندەگیم
کریڤ و عاشق و بنەچە و باوانم
سەری خۆم داوەتە پرووشە و
دەزانم دوو مێوانی تەنهای زریانین
سەیر کە دڵۆپی فرمێسکی چەند وردە؟
ئەسپەکەم باوکەکەم ڕێکەوە

## تاووس

1

تاووسخان قەفتەی خەنجەری
شیرڕێژکراوی مەبەست بوو
لە ژەهری دڵێکا خەم ئامێز و مەست بوو
لە هەوری گومانا پەرچەمی دادێنا
لە ئاوێنەی بارانا
سینە و مەمکی سرکی خۆی دەشووشت
لە چرای شەبەنگی تێواران خۆی دەکوشت

2

تاووسخان
لە قووڵایی کانی پەیکەرم بۆ کردی
پەنجەرەم لە مینای یۆنانێ بۆ ساز کردی
ئوڤیلیام، بەگەڵای سەوزی ژێر ئاوانم چواندی
ئەوەتا ترازاین پێکەوەش هەر بەندین

4

تاووسخان
پەریستان خەونێکی بچووکە بێ دەرگا و پەنجەرە
نە دەریا دەروونی دەسمێ و نە تاقی بەرز و دوور
نە لوتکەی دیارە و نە تەمی سەر باڵای کۆساران
زەویشی بێ بەشە لە عەتری خەمکوژی دوای باران
ئەوەتا سەبەتەی گوڵفرۆشەکانیش
لە بەردەم کڵێسا نوقمی تەمتوومانن
لە شەبەنگی چاوی زێدی تۆ
گیرۆدەی دووپشکی گومانن

5

شەو ڕابرد بەیانی هاتمەوە

وامزانی مەلی بەر بارانم

دەرزی لەش ترازا خەونێکی سەد ساڵ بوو

هاتمەوە سروشتی جارانم

## مەیلێکی درەنگ وەخت

ئەوین پێویستی بە تازە بوونەوە هەیە
ئەو دەنگە هی هەنارێ بوو
بەدیار شەونمەوە شەقی برد
هی تەوارێ بوو لەسەر فەرشی بەفرێکا
پەڕووپۆ دەبوو
تۆ تەوتەمێکی لە شووشە
ناتوانم بتکوشمە باوەش
دەترسم وردوخاش ببیت
خەونێکی نادیاری ناتوانم تەفسیرت بکەم
دەترسم ئاشکرا ببی
چۆن چەپکەنەت کەم ئەی با
بای ئەزەل و جاویدانی؟
تاوێ هەڵمگرە و پەرش و بڵاوی دونیام بکە
وەك چۆن گۆڵ گۆڵ بۆنی نەرگزەکان
هەڵدەگریت و بە سەر دونیای دەبەشییەوە
وەك چۆن نهێنی عاشقان، جانتا جانتا
هەڵدەگریت و دەیکەی بە کتێبی گۆرانی
تاوێك هەڵمگرە ئەی با، بای ئەزەل و جاویدانی
تۆی بەتەنها تۆی کە بتوانی ڕزگارم کەیت
هەر تۆی تەنها کە بتوانی
لە وەڕەسی حەشارم دەی
تۆزێ لە سووڕانەوەی ئەبەدیم بەدەوری قەڵا
رزگارم کەی

قەڵا من لە تۆ وەڕەس نیم
من کەڤنارترین عاشقی تۆم
بەڵام ئەوین پێویستی بەتازەبوونەوە هەیە
قسەکردن لەگەڵ با تۆزێ ئەفسانەی پێدەوێ
بەیەکەوە ژیان نەفەسێکی تری داوایە
ماسی پێویستی بە ئاو گۆڕین هەیە
مرۆڤیش تا دەمرێ مەیلی هەواگۆڕی دەکا
من قسەم لەگەڵ بەهێ کردووە
مۆڵەت لە درەخت وەرگرێ
قسەم داوە بەڕووبار
شەپۆلەکانیم پێببەخشێ
ئەی با ڕێگاکانم دوورن دوور
دەچنەوە ناو گەڕەکەکانی مێژوو

## دۆستێ هەمیشە چاوەڕوانمانە

بەو دڵۆپە برۆنزییانەی لە زمانییەوە هەڵدەڕژان
من نوقمی ناو ئەبەد دەبووم
بەو عەترە جاویدانییەی لە دیدگای ئەودا دەپژان
بۆ تا هەتا نوقمی خەزەڵی درەنگ وەخت دەبووم
هەست دەکەم لوورێکم لە تەوق و ئەشقبەند
چەهچەیەکم لە خڕخاڵی نەمری و
لە شەوقی بازووبەند
وەك هەنارێ لە لقێ داگیرسێ و
دنیا سوور سوور هەڵگەڕێنێ
بانگم دەکا، ئەو بانگە شمشێرێکە لە شیر
شیرێکە لە شا، شاێکە لە شێر و شەونم
دڵۆپ دڵۆپ دەڕژێتە سەر ڕۆحی شکاوم
دڵنیام هەرگیز نایبینم
ئەو کاتە نەبێ کە چاوانم کز بووە و
سەریشم پرووشەی بەفر
هانا بۆ کێ بەرم ئەیدۆست
ئەی دەنگی شکاو، عومری بە سەرچوو
ڕەونەقی ئاقیقی خوێنین
تەمی بە ناو لوتکە ڕژاو، باڵ شکستە
شەونمی سەر پەلکی برین
خەمی بەناو دڵان پژاو، داڵی کەمین
تەوتەمی پەرستگای ڕماو
من لە پانتایی بادا ڕاکشاوم هاوار دەکەم

ئەی با ئەی با ئەی با بوەستە
ئەوە چ خەندەیەکە ئێمە لە ناویا دەگرین؟
ئەوە چ گریەیەکە ئێمە لە ناویا دەخەنین؟
بە حەسرەتەوە بانگم دەکا
بانگێ لە بەشینەوەی کوڵیکی سێو دەچێ
شکا شکا دڵنیام لە ورد و خاشبوونی
ڕما ڕما دڵنیام لە وێران بوونی
وەری وەری دڵنیام لە زەرد هەڵگەڕانی
دەرگا بوو بۆ ئەبەد داخرا
درزێ بوو لە ڕۆحم
تا پای مەرگ بەو درزە دەناڵم
سەما بوو، سەما بوو، قەفقاسی
مناڵی لێ سەندم

## ئەفسووس دڵەکەم

وەك کتێبێکی کۆنینە
کەسێ نەبوو تاقە جارێ بتکاتەوە
کە لاپەڕەکانت پڕن لە گەوهەر و حیکمەت
ئەفسووس جارێ نەبوو پێم بڵێی
چۆن ئەم هەموو تەنهاییەت لەم تاریکستانە بەسەربرد
کە سپێدەیێك بەیانی باشی لێنەکردی
پەنجەرەیەك بۆنی نانی گەرمی بۆ نەهێنای
کەسێ نەبوو دڵی خۆیت بۆ بکاتەوە
پۆستەچیێ نەهات نامەیێکی تۆ بهێنێ
چۆن دیەکانت کوێر نەبوون کە کۆترێ لە بانێژەوە
کاسەیێ گمەی خۆشی بۆ نەڕژتی
ڕیشۆڵەیێ بەسەرتا ڕانەبرد
کەسێ خەونێکی بۆ لێك نەدایتەوە
ئەی تەنهاترین عاشق
چۆن نەسووتای لە تەنهایی
کە شنەیێك نەبوو بۆنی چیات بۆ بهێنێ
کچێ نەبوو تەونێکت بۆ بنەخشێنێ
چۆن شەوقی ئەو هەموو فرمێسکەت چەپك کرد

که نەرگزێ قژی خۆی بۆ نەکردیەوە
وەی درێغا جارێ نەبوو پێم بڵێی
ئەی کێویترین عاشق
چۆن جێی ئەو هەموو ئازارەت
لە ناو دڵی خۆت کردەوە
کە بەقەد تیلمە گۆزەیێکی شکاوە
قەترەیێ مەی خوشی نەکرد

## دوور و دێرینترین هاوار

تۆ ئەی تۆ، ئەی شیرینترین ئەفسووس
کە نە سنوورێکت هەیە و نە نەبوونێ
تۆ ئەی تۆ، ئەی ئەفسانەترین ئەفسوون
کە نە سیمایێکت هەیە و نە هەبوونێ
تۆ هاوارێکی دوور و دێرینی
لە نادیارترین تەونی دەروونمەوە هەڵدەستێ
ئەشق تەنها بەجەشتەی ئازارەوە مانای هەیە
هەر ئەوەندەشی دەتوانێ دونیا بگۆڕێ
تۆ هەر ئەوەندە دەتوانی لە ناو سینەم
حوکمڕانێتی بکەی هەتا دووری
دوورەکان ئاواتخواستەی مرۆڤن
تۆ هەر ئەوەندە دەتوانی
کوانووی جوانی ناو دڵم بیت هەتا ونی
هەموو شتە ونەکان ئارەزوویستەی مرۆڤن
شێتانە چوومەتە پاڵ ئەو کێوانە
لەگەڵ ئارەزووم پەیڤیوم
مەستانە چوومەتە سەر کەنارەکان و
لەگەڵ شەپۆلان خەملیوم
تۆ ئەی منێکی دوور
دوورتر لە سنووری خەیاڵ
من ئەی تۆیێکی نزیك
نزیکتر لە خورپەی مەحاڵ.

## تێوارەی کۆترێ لە نووسینەوەی فڕیندا

فڕینێ لە ژێر باران، فڕینێ لەبەر سامالّ
فڕینێ لەسەر بەفر، فڕینێ لە ژێر گوللە
فڕینێ بەسەر سەری منالّێکەوە بۆ تەقلّە
فڕینێ لە ناو سەبەتەی شامینۆك فرۆش
فڕینێ لە دوای دەربازبوون لە گەراجی کۆتر
دوا فڕینیش لە ناو قەفەزی کچە بچکۆلانەکەی پاشا
درەختەکانیش بەڕووتی باوەشیان بۆ دەکردمەوە

***

کراسە تەنکەکانی خۆیان
بەئەمانەت لە لای با دانابوو
باش بێ پەروا هەر لەبەر خاتری جوانییەکان
دەستی بەسەفەرە درێژەکانی خۆی دەکردەوە
هەر کراسێکی دەدا بەمەلێك و
ناونیشانی درەختەکەشی بۆ دەنووسی
هەر سوخمەیێکی دەدا بەعاشقێ و
باسی ڕەنگی پرچیشی بۆ دەکرد
هەر ستیانێکیشی دەدا بەڕووبارێك و
تەمەنیشی بۆ دەنووسی
ئەوە بوو باران باری منیش غەرقی تەنهایی بووم
ئای چەند تەنها بووم
تەنهاتر لە باخچە بێ کۆترەکان
منیش چوومەوە ناو
قودداسە خەمگینەکانی خۆمەوە

## مەرگی بخوور

1

گریانێ بوو، گریانێ دوور
ئاڤی گلەیی و گازاندە و گەرم وگوڕی ئازارێ بوو
رائی ڕەو و ڕازی ڕەوەزێ بوو
یائی یاس و یەك و یار و یاوەرێ بوو
نونی نەوا و نەست و نان و نەناسێ بوو
یائی بەور و بۆن و بەرامەی بابان بوو
ویزە و وێرانی وارێ بوو
گریانێ بوو، گریانێ دوور
گریانی کۆتایی بخوور

2

کە بۆن و بەرامەت دەڕژێ
ئەی گوڵ، تازە بۆت کۆناکرێتەوە
کە ساماڵ دونیا لە زیو وەردەدا
ئەی ئاسمان تازە بۆ لات نایەتەوە
کە تێکەڵی جلوەی ئەبەدی گیا دەبی
تازە نابیەوە مرۆڤەکەی جاری جاران

3

دەنگێ لە ئاسمان هەڵوەری
ئەم کەونە سپی هەڵگەڕا
دەشت و دەر پڕ بوون لە ئاو
چیا لە ڕەنگان نوقم بوو
ڕەز هەموو بوونە مەیخانە
چاو پڕ بوو لە حۆری و پەری
پیر هەموو جحێڵ بوونەوە

شەو نەما، بوو بە چل چرا
هەموو پێکەوە تێکەڵ بووین
لە سیما و لە نەخشی ڕەها
4
تۆ ئەی پیر پیری ناو بەفر و تەمتوومان
پێی تۆ لەسەر لێوی گۆڕە
یای تۆ کفنێکی سپییە
ڕای تۆ مەرگی ئەبەدیە
ئەی پیر وەرە جامێ هەڵقوڕێنە
مەستی بەهەشتی ئەزەلییە
گوناهت دەکا بەپەپوولە و
بۆ یەکجاری دارستانی ڕۆحت چۆڵ دەکەن
دەبی بە هاودەمی جوانی
ئەی پیر تۆ ئەی ئەزەل و جاویدانی
5
لە کوێ هاتبوو ئەو شەوقە
گەدا بووم کردمییە شالیر
ڕەندی مەیخانە و ساقی بووم
ئێستا بوزاییکم پیر
دێ بووم و منی کردە شار
شار بووم و کردمییە وڵات
وڵات بووم، بووم بەکیشوەر
کیشوەر بووم کردمییە دونیا
دونیا بووم کردمی بە کەون
کەون بووم کردمییە سەدا
ئێستا حوکمی گەردوون دەکەم

لە کوێ هاتبوو ئەو شەوقە
عاقیبەت منی کردە گیا
6
کچێك لە دوورترین شوێنی دونیا
لە سێبەری تاوێرە بەردێ
بەدیار ڕەوە پۆڕێکی سەرما
بەتەك ڕووبارێکی خەمگین
نزیك درەختێکی ڕووتەڵە
لە ناو کۆشێ گەڵای ڕژاو
بەسەر شەپۆلێ لە حەسرەت
بەمشتێ فرمێسکی ئاقیقی
بەجلێکی ڕەش و دڵێکی سپی
بەخەونی گەڕانەوەی عاشق
بەجیازێکی سادە
کە بریتییە لە ئاوێنەییێکی بەرباخەڵ و
شووشەیێ عەتر
وەستاوە سەیری دوور دەکا
بەڵکو یەکێ" ئاخ بۆ یەکێ چەشنی زۆربا
یا شێتێ عاشق و شەیدا
یا تەمێ گەرم گەرم وەك شنەبا
دەستی بگرێ و سواری ئەسپە شێکەی خۆی بکا
بۆ تا ئەبەد لە کچێنی و مەراقی ئەو ڕزگاری کا

7

مەستیم وەك عەشق وایە

یا ڕووی لە زینی شامە

یاخود ڕووی لە خودایە

خوا پارچێکە لە زین و

زین پارچێ لەخودایە

لە میانی من و زیندا

من شەلاڵی مەحاڵم، توانەوەم لەودایە

8

تەم بوو هات لە دوورەوە

وەك پیاوێکی نوورانی

ڕیشی لە زەوی دەخشا

کاتێ کە دونیای داگرت

مەمك پڕ شیربوونەوە

چرا هەموو داگیرسان

شەهید بەکراسی خوێنین

هەمووی زیندووبوونەوە

کاتێ کە تەم ڕەویەوە

خوا لە ناویا بەدیار کەوت

بەدەستی پڕ لە بازی

بەکەمەند و بە ڕازی

ئێمەی بۆ خۆی بردەوە

9

جارێك نەبوو پێکەوە ئەو پیر و من مورید بم

جارێك نەبوو پێکەوە ئەو لوتکە و من بنار بم

کاتێ کە ئەو دەبووە پیر

لە توانەوەم لە ئەودا هیچ وجودم نەدەما
کاتێ دەبووە موریدم
پیریم لەودا نەدەما
کاتێ کە بنار بووایە
لوتکەم غەرقی نوور دەبوو
کاتێکیش ئەو لوتکە بوو
بنار پڕ بخور دەبوو
مەدەدی پیری بوخارا
کاتێك کە دەتوێینەوە لە نێو یەك قەترە مەیدا
بۆ ئەو لوتکە و بنارە

10

من بەندەم و ئەو ڕەها
من ڕەهام و ئەو بەندە
کێشەیێکی ئاڵۆزە
بریا بە بریاداران
ئەو هەر لێرانە بووایە
دەمێك من لە دڵیابام
دەمێك ئەو لە دڵ بووایە
دەمێك من بوومایە خوا
دەمێك ئەو خودا بووایە
ئێمە یەك چرا و تیشکین
جارێ ئەو فەیزی نوورە
جارێ من فەیزی نوورم
هێندە لەوم ڕوانیوە تا بینای هەڵمژیوم
ئێستا ئێمە یەك دەورەین
لە سووڕانەوەی کەونا

یەك ئەشق و یەك ڕوخسارین
یەك بوون و یەك پرسیارین
11
سەرەتا هەورێکی سپی بوو
لە سینەی سامالێکی زیویین
بایێ هات ڕایمالّی
چی نهێنی هەبوو لەبەریا دایمالّی
ئێستێکەش دلۆپەی بارانی
لە شوێنێ هەڵناکا
دەیەوێ پیریی خۆی جێهێڵێ و
بچێتەوە ئاسمانی جارانی
12
سەرەتا پەڕی نەرمی زمان
شەکر بوو ئەیشکان
هەنگوین بوو بەڕووتا ئەیڕژان
زمان بوو گۆرانی و باڵۆرەی دەچڕی
ئەوێستاش زمانە
بەگیزانی قسەی ژەهراوی
کەمەران لەت دەکا و گەردنان دەدڕی
13
سەرەتا دڵ هەوێنی خورپە و
هەڵگری خەمان بوو
لە میانی من و تۆ دڵ ئاوێنەی دڵ بوو
ئەوێستاش ئەو دڵە جاڕسی ژەهری بەردەبانە
بۆ تاوێ تروسکە نابینێ و هەر مەکۆی خەمانە

14

سەرەتا زریکەی چەمان بوو

یا پشکۆی نێو گەرووی کەمان بوو

وەلێ ئێستا ژەهری دەبانە

پەنجەران لە سینەی ئاسکان وا دەکا

چیایان لە تەمی لوتکە دەورووژێنێ

دەرەنجام هاواران لە لێوی زۆر ناسك دەسێنێ

15

سەرەتا هەر دەست بوو سۆی سارێژ دەکردن

هەر زەبری پەنجە بوو بەدکار پێی دەمردن

سەرەتا هەر دەست بوو کە پرچی کیژانی

لوولدەکرد

سەرەتا هەر دەست بوو

بۆ منالی بێشکە درەختی نیایی

ئێستێکەش هەر دەستە

دەچێتە بینەقاقای گەرمی چیایی

یا دەکرێتە پردی کۆدێتا و ڕیایی

16

سەرەتا هەر گەردن ڕووگەی شیعر و

مەزاری دڵان بوو

هی خەناوکەی دیاری و ڕیسەگیای بۆندار بوو

یا ترێ خورابا لە گەردن دیار بوو

ئێستێکەش بۆ تیری شمشێری زەمانە

گەردەنە کە بۆتە نیشانە

17

سەرەتا شەپۆل بوو

پەڕیە سەر کەناری ئەم هەرد و کێوانە

کەڤر بوو بروسکێ لەتی کرد

لە قژی چەمێکا داگیرسا

بووێنکە ژنی تەنبور

لە پەنجەی زۆربادا داییسا

18

سەرەتا بریقەی ڕوومەت بوو،ڕووناهی دەدایە ئەم کەونە

سەرەتا هێلانەی مراز بوو،مرازێ ئێستێکەش هەر خەونە

زەمانە لێچیری تەوێڵی دۆزیەوە و

خەرەندی هەڵکەنی

19

سەرەتا چاو تەنها جوانی بوو دەیبینی

بە نیگا نەرگزی دامێنی ئاو دەدا

سەرەتا چاو تەنها بۆ تولاز و شۆخان دەترووکا

وەلێ ئێستا ڕەشی ئەو چاوە

هەر دەڵێی بۆ گریان خوڵقاوە

## پۆرترێت

دۆستەکانم، باوەشە گەڵایێکی جوان بوون
لەنێو مەرکانەکانی بوون
سپێدەیەك بایێ لە باکووری ئاگرەوە
ئاگرێ لە تەنووری ڕقەوە هەڵگیرسابوو
زریانێ لە زەمهەریرەوە هات
زەمهەریرێ لە بەفرا داییسابوو
هەموویانی خستە ناو لەپی خۆیەوە
هەریەکەی لە کەنارێ فڕێدا

* * *

دۆستەکانم، کۆمەڵە گەنجێکی جوان بوون
ئێوارەیەك لەشکری پیری هات
سەری هەموویانی سپی کرد
ددانی هەموویانی وەراند
یادەوەری هەموویانی کوشت
هەریەکەی بەرەو گۆڕێ بەڕێکرد

* * *

دۆستەکانم کۆمەڵە عاشقێکی ناسك بوون
نیوەڕۆیێ تای ئەشقێکی لەبەدی
هەموویانی بووراندەوە
هەندێکی دایە خۆکۆشتن
هەندێکی دایە دەست شێتی
لە دەشتاییەکانی قەدەردا بەرهەڵای کردن

دۆستەکانم هەموویان بەم حاڵەوە
یەك یەك مردن
دۆستەکانم، کۆمەڵە شاعیرێکی شێت بوون
جگە لە خەیاڵ هیچی تریان نەدەزانی
ئێوارەیەکیان کتێبێ، خۆی هاوێشتە ناو زەینیان
منالی لەبیر بردنەوە، قەڵەمی لێ وشك کردن
سەریان بوو بە پێ، پێیان بوو بەسەر
ئێستا هەموو شتەکان بە بەرەواژی دەنووسنەوە

* * *

دۆستەکانم کۆمەڵە خەونێکی خۆش بوون
خەونی سەفەر بۆ ئەوبەری دەریایان
خەونی دروستکردنی شەقامەکان
خەونی بنیاتنانی دەوڵەت
خەونی چاپکردنی کتێبی جوان
سپێدەیەك ئافات هات
هەمووی کردن بە دروشم

* * *

دۆستەکانم، کۆمەڵە مانگێکی بە شەوق بوون
بەسەر کانیاوەکان هەڵدەهاتن
دنیا بەوانەوە جوان بوو
شەوێ دووکەڵێکی ڕەش سواخی دان
بەدیار نەکەوتنەوە
ئێستا هەموو ئێوارەیەك، دەچینەوە سەر گردەکان
نێ بەڵکو تیشکێ دەرکەوێ لە سیمایان

دۆستەکانم، کۆمەڵە دزێکی ناقۆڵا بوون
سپێدەیەك شای دزان هات
هەرچییەك کۆیان کردبۆوە هەمووی لوولدان
ئێستا هەندێکیان بوونەتە ڕێگر
ڕێی نێوان شارەو شار دەبڕن
هەندێ گەدا، شەقامەکانیان گرتووە
هەندێ جەردە ویژدان لە ناخیان مردووە

* * *

دۆستەکانم، کۆمەڵە شمشێربازێکی سیحراوی بوون
دەنگی نەعرەتە و بریسکەی شمشێرەکانیان
وڵاتیان دەهێنایە جۆش
ئێوارەیەك شمشێربازێکی بیانی سادە
هات سیحری هەموویانی بەتاڵ کردەوە
ڕەنجی گشتیانی بە بادا

* * *

دۆستەکانم، کۆمەڵە ئەشقیایێکی زۆر بوون
بەنێو کێوەکان وەرببوون
شەوێکیان دوای شەڕێکی سەخت
هەموویان یەك یەك ئاوابوون
بۆ ئەبەد نەگەڕانەوە
دۆستەکانم، وەك تاوێ بارانێ تووڕە
خۆیان دەکرد بەجۆگەلەو کانیاوەکان
دونیایان پڕ لە ئاو دەکرد
ئاوێك بخوورو بوخارا

له ناو پەردەی هەزاران جام
سپێدەیەك ڕەشەبایێ هەمووی بردنەوە دارستان
لەو ڕۆژەوە منیش تەنهام
دۆستەکانم، کۆمەڵە کچێکی قەفقاسی بوون
سنووره دوورەکان تووڕی هەڵدابوون
من دڵم بۆ کردبوونە ماڵ
ڕۆژێ غوربەت سەری پێ هەڵگرتن
منیان دایەوە دەست مەحاڵ

****

دۆستەکانم له تاولی قەرەجان هێنابوو
هەمیشە خورجینەکانیان پڕ له ترێ و
چەفیەی ئاڵ بوو
سپێدەیەك باروبارگەی خۆیان تێکنا
منیان بە تەنها بەجێهێشت
لەو ڕۆژەوە هەر کاروانەو ڕادەبووری
دڵم بەخورپە لێدەدا

* * *

دۆستەکانم، سادەوساکار فێڵی شاریان نەدەزانی
بەیەك هێما ئاگری ئەشقیان لێدەباری
ڕۆژێ شارینیەکی شێت، وەکو بورکان
هەمووی بەفیتێ دامرکان

* * *

دۆستەکانم بەپەلکی لیمۆ و قەنەفر

سەرو قژی خۆیان جوان دەکرد
کەتووڕە دەبوون سوور هەڵدەگەڕان
کەدڵیشیان خۆش بوایە
خۆیان لەمەزاران دەپەڕاند

## ناشتنی جوانێك

ئەو ئێوارەیە ئاسمان سپی بوو
درەختەکان سپی بوونەوە
دڵەکان سپی بوونەوە
هەر لە دوای شۆڕین و ناشتنی
تەرمەکەی مەلەك خان
دوای ئەوەی هەریەکەو مشتێ خۆڵی تەڕی
بەر فرمێسکی خۆی هاوێشتە سەر گۆڕو
دووبارە لە سرووتێکی سپیدا، کەوتنە گریان
بە چاوێکی تەڕ و دڵێکی شکاو
ماڵاوایی خۆیان لە خاتوو مەلەك کرد
گۆڕی سپیان بە تەنها بەجێ هێشت
لە باکووری دوورو زێدی خۆی
لە کانی بن تەمی چیایان
نووڕێ هات وەك شوورە دەوری دا
درەختێ لە گەوهەر بەگەڵا داپۆشی
گیایێ پڕ شەونم لوولیدا
کە نێژرا جوانییەکەی لە دەوری گۆڕەوە
وەك کراسێکی سپی و گێلاسێ لە بخوور
کە ڕەنگی لە تاولی قەرەجان هێنابوو
سوورفڵی ڕوومەتی
لە باخی ئیرەما هێنابوو
وەك خەونێکی سپی

بە ڕەزمی سەمایێ دەجووڵا
سەمایێ مرۆڤی لە ئەوین دەسووتان
گۆڕستانی تەژی ئاوازی مەی دەکرد
بۆی دەچوون لە چاوان وندەبوو
کە دەگەڕانەوە بە دیار دەکەوتەوە

## ڕژانی شیر

که پیری حەکیمیان
چواردەستە هەڵگرت و هێنایانە سەر گۆڕ
دەستێکی بەریشی سپی خۆی داهێناو
بە ئاستەم ورتەی کرد
کەی وایە جوانی نانێژرێ
جوانی دەبێتە تەمی سەر دەریایان
یا خوناوەی سپی ناولەپی گیایان
نابێتە خواردنی مردنێ
پێکەوە لە مەمکی تازە شیر تێکەوتووی هەر ژنێ
هەر یەکەو کاسەیێ شیریان برد
فڕینە ناو ئاسمانن
تا بگەنە سەر گۆڕی مەلەك خان
لەڕێگە هەر دڵۆپە شیر بوو هەڵدەڕژا
دەبوو بەتیشك و تاو، لە جەستەی ئەو زنێرە
حەوت دڵۆپ، حەوت شەوق و شەباقە
تێکەڵی یەك بووینە
ئێواران لە ئاسمان دیارە چۆن بووینە ئەستێرە
حەوت کاسە شیری نیوە لێڕژاو
حەوت دەستی ماندووی ڕێی بەر هەتاو
حەوت سینە و هەناسە، حەوت پەری
گەیشتنە سەر وادەی مەرگ و ژان
یەك یەکە بوونە کێلێ لە شیر
بە سەر گۆڕی سپی مەلەك خان

مەلەك خان ئێستاكە كاسەیێ جوانییە
هەركەسێ ڕادەبرێ قومێ دەخواتەوە
مەلەك خان ئێستاكە كانیێ لە ئاوی پیرۆزە
هەركەسێ ڕادەبرێ دڵی لێ دەشواتەوە
مەلەك خان كراسێكی سپییە
ئێواران سەمادەكا
سەمایێ لە جوانی، سەمایێ لەشیر
جوانی نانێژرێ نابێتە خواردنی مردنێ
جوانی شیرێكە، دڵۆپ دڵۆپ ڕژاوە
هەر دڵۆپەی هی مەمكی
تازە شیر تێزاوی ژنێكە
لە زاری ئەویندارەكاندا پژاوە
بەدەستی حەوت تولاز هێنراوە
حەوت دڵۆپ،حەوت بەهێ لە باخی سینەیان
حەوت ڕووبار لە مسكی ئاسكان

## زمان بگرە ئەی لاڵ

1

مەگەڕێ بۆ چرا
چرای ناو دەروونت گەش کەوە
کە شەوقی دەچێتەوە سەر ئەزەل
هێشتاکەش هەندێ شوێن هەر ماوە
بگەیتە تەك درەختی پڕ ئەجەل
مەگەڕێ بۆ چرا
هێشتاکەش چرایێ لەخوێنتا
وەك گڕی بن جەستەی خۆڵەمێش
بریقەی هەرماوە
جارجارە دەتروسکێ
وەك بریسکەی دەبان
بەتەنیا شنەیێ لەدڵت هەڵبکا
بریقەی بەچەشنێ هەڵدەستێ
کە شەقکا سینەی شینی ئاسمان

2

تۆ وەرە ناو سینەم، دڵە جێی داخورپان
دەترسم بترێژێتە ناو
دەریای بێ بن و پڕ گومان
تۆ وەرە ناو دڵم
سینەیە جێی تەنیا شەوق و نوورە
دەترسم شەرەرێ لێت بدات
سورفڵی ڕوخسارت دابخات
بۆ ئەبەد لەپەلوپۆت بخات

3

هەستەوە هێشتاکە زۆر زوو بوو

پەیکی زەرفامی سپێدە

لەو دیوی پڕ پەنای کەڵ دابوو

زانیبام هەوارو تاولیم لێ چۆل دەکەی

فەلەکم ڕادەگرت

زانیبام وەها زوو دوا تیشکی خۆت داوێی

سینەی خۆم شەق دەکرد

بۆ ئەبەد دەوەستای لەخوێنما ڕادەمای

4

تۆ تەمێکی سپی بنارو هەڵدێری

لەوەتەی کەمەندت بۆ داوێم

ناکەوتە سەر مل و گەردنت

بەندت کەم بە خۆما

تۆ خەونی شەوێکی درێژی، تا ئەبەد دەمێنێ

بەڵام ئاخ، لەوەتەی پێکت بۆ هەڵدەدەم

هەمیشە سپێدە وەئاگام دەهێنی

5

مەگەڕێ بۆ ئاگر

دڵت پڕ لەپشکۆی ئاگرە

بەتەنها دڵۆپە شەونمێ بکەوێ بەسەرتا

بلێسە ئەم کەونەکەڕ دەکا

مەگەڕێ بۆ شەونم بەتەنها تەڵەزمە ئاگرێ

سپێدەت نقومی بای تەڕ دەکا

بۆ ئەبەد تەمەنت لەگەڵ بوون

لەگەڵ کێوی تەنها شەڕ دەکا

6

مەنووسە، هەتا خوێن ناچارت نەکاتن هەڵڕژێی

ئەوکاتە هەر حەرفێ دەبێتە دارستان

لەناو تاشەبەردا دەڕسکێ

مەنووسە هەتا شەو لەدەستت

هاواری سپێدەی خۆی دەکا

ئەوکاتە هەرحەرفێ

شاکارێ لە ڕۆحتا خەڵقەکا

شیعر مەرگێکە هەمیشە مرۆ عەوداڵی

هاتنی خۆی دەکا

مەرگێکە هەمیشە شەبەیخوونێ

بەسەر پایتەختی سەردەکا

7

لەسەر ڕێ لاکەوە ئەی ڕەقیب

مانەوەت لەمیاندا مەحاڵە

ناتوانی نەوای نەی هەڵپاچی

لەسەر ڕێ لاکەوە ئەی ڕەقیب

نەوای نەی شەوبۆیە

چەند دەستت بە ناویا بگێڕی

هێندەی تر عەتری خۆی دەڕێژێ

8

تا هەبین خاچی ئازارو ئەشکەنجەمان

هەر دەبێ لەدەست بێ

تاهەبین دەبێ بەرد هەڵکۆڵین

بۆ ئەوەی لەخۆشی ساتێکی جوانیدا مەست ببین

هەرمەرگە و لەناومان سەردارو ڕەهایە

## با کەس ناناسێ

با دۆستێکی سادەو کەونارە
هەمیشە خۆی دێ
قەت نامە بۆ ئێمە نانووسێ
دەڕواو خواحافیزیمان لێناکا
کە هەڵدەکا، سیحرە نەوەکا فریومان دا
خۆمان دەشارینەوە
کە کپ دەبێ، نەوەکا گێژەن ونمان کا
بەدوایدا دەگەڕێین
هەندێ جار دەڵێی مناڵەو لەچەقی ڕێ گڕوو دەگرێ
سووڕی خوێنمان زەحمەت دەکا
هەندێ جاریش وەك حەکیمێ
دەروونمان پڕ لەئەڤین و خوێنیشمان پڕ لە جۆش دەکا
با چڵە گیاکان ناناسێ، هەمیشە سەمایان پێدەکا
با کتێبەکان نانووسێ و بەڵام دەیانخوێنێتەوە
هەندێ جار پەڕپەڕیان دەکاو بەناو شارانیان دەگێڕێ
هەندێ جاریش بۆ ئەبەد دایان دەخا
هەموو سپێدەیەك شتە جوانەکانمان دەبا
ناشیرینەکانمان بۆ جێدێڵێ
نهێنییەکانمان ئاشکرا دەکاو
ئاشکراکانیش دەفڕێنێ
هەندێجار دڵی درەختەکان دەباتە باکوور
چاوی پۆڕەکانیش بەسەر دەریا جێ دەهێڵێ
ستیانەکانی دارستان بەسەر ڕێگاکان هەڵدەواسێ

نهێنییەکانمان هەڵدەگرێ

لە هەر شوێنێ گوڵمێکی لێ دەبەشێتەوە

با بێ یادەوەریترین زیندووی سەر زەوییە

بە سەر یادەوەرییەکانی ئێمە دەژی

با پەڕی هەموو ئەتڵەسەکان هەڵدەداتەوە

بەڵام سەر بە هیچ نەخشەیێ نییە

دێرەکان هەمووی دەڕفێنێ

بەڵام شتێ ناخوێنێتەوە

با هەرگیز ئاوڕ لە دواوە ناداتەوە

هەموو ئێوارەیەك،بەسەر ڕێگاکانەوە دەوەستم

بەڵام با بێ پەروا ڕێ دەبڕێ

گوێ لە هاواری کەسێ ناگرێ

با هەمیشە بەو شتانەوە دەبریقێتەوە

پارچەیێ لە ڕازی من، باوەشێ لە جوانی

مشتێ لە خوێن، کە هەڵدەڕژێتە سەر زەوی

دنیا پڕ دەکا لە نوور

ئەی با، ئەی با

ئەی ڕوونتر لە سیمای ئاوو

جوانتر لە کەروێشکەی گیا

هەڵمگرە من نەوەی تۆم

## عەتری جێماوی دۆستێ

1

دەزانم لە نزیکمەوەی
ئاوێنەی ڕۆحم دەشکێنی
منیش تەنها لە گۆشە دوورەکانەوە
هەست بە نزیکی تۆدەکەم
تەنها لە بەرزاییەکانەوە
هەست بە نەوی بوونت دەکەم

2

لەگەڵتام کە هەزار ساڵ لێت دوورم
لێت دوورم کە دەزانم
هێندەی دەماری گەردنت لێت نزیکم
لە گێژاوی ئەم مەحاڵەدا
تەنها منم دەکەوم

3

زۆر جاران دەتبینم
ورد ورد ڕۆحم کلۆر دەکەی
زۆر جارانیش ون دەبی
ڕێ ڕێ دڵم تێراو دەکەی
تۆچیت؟
ئەگەر بایت بۆ لە خوێنم دەئاڵێیت؟
تا ئەبەد ڕۆحم دادەگری
ئەگەر بارانی بۆ لە وشکایی دامدەڕێژی
گەر ئاگری بۆ ڕۆحم لە سەرمان دەکوژی؟

4

سپێدەیەك نەبوو من نێمە لاڕێکانەوە

باوەشێ گوڵەگەنم و دونیایێ خەمم پێ نەبێ

سپێدەیەك نەبوو من نێمە لاڕێکانەوە

بەدیار شوێن پێکانتەوە نەگریم

سەدەیێ نەبوو تۆ وەڵامم دەیتەوە

ئەی با

کە ڕۆیشتی هەرگیز ئاوڕ نادەیتەوە

5

جۆگەلەیێ فرمێسکم هەڵڕژت

جارێ قومێ ئاوی نیگاتم بەرنەکەوت

دەریایێ بێداریم بۆ سەردای

جارێ ڕۆحت هەڵینەکرد

ئەی ئاگر، چاوەڕوانی سووتانی یەکجاری خۆمم

6

تۆ چ ئەڤینێکی گەرمی

گیانی من دەکەی بە بەفر

تۆ چ فیراقێکی ساردی

ڕۆحی من دەکەی بە ئاگر

7

بوەستە تا بۆساتێ

بگەم بەدوورترین خاڵی جوانیت

بەڕێ کەوە تا بۆ ساتێ

هەزاران ساڵ بوەستم

8

تۆ بێدەنگی، بەڵام لەخوڕڕەت دەترسم

9

لە پەنا تاوێرو دەم ڕووبارەکان
لەگەڵ پڕووشە قسەم کردووە
لەگەڵ گەڵا ڕاز و نیازم ئاشکرا کردووە
ئەی خاك، کەی بۆ یەکجاری تێکەڵ دەبین
کە هێشتا پێکی ئارەزووم نەچەشتووە

10

تۆ ئاگرێکی زۆر بچووکی
بەڵام ئاخ توانای سووتاندنی
هەموو دارستانەکانی دونیات هەیە

11

بڕیارم دەدا زانیبام، دڵت بڕیاران هەڵدەگرێ
خۆم لە فڕینە گەورەکان دەدا
بمتوانیایە بگەم بەتۆ

## بریقەی زیوێك

هێشتاکە زارم بۆن شیری خاوی لێ دەهات
وامدەزانی ئەستێرە چەند هێشووە مەرجانێکی زەردن
بە ئاسمانەوە لکێنراون
هاکا ئەستێرەیەك وەری و کەوتە نێو کۆشی منەوە
شەوان کە تینوومان دەبوو
لە گەردەنی باریکی ساردی شەربەیێ
قوم قوم ئاوی
جۆگەلەکانی بەهەشتمان دەخواردەوە
کاتێ کە بانیشمان دەڕشاند
بۆنی خاك مەستی دەکردین
کە ئاسمان هۆن هۆن دەگریا
پێمان وابوو ئاسمانە کون کون بووە
ئاوی چاوی خوداوەندە کە هەڵدەڕژێ
سەدای هەڵڕژانی ئاو لە سوولاوکە ژەنگینەکان
فێری گوێگرتنی کردین
نەوا بوو هەڵدەڕژا، بۆمان کۆ نەدەکرایەوە
ئێوارانیش کە خۆر ئاوا دەبوو
پێمان وابوو دەچێتەوە ناو هەناوی خاك
ئاسمانیش کڵاوێکی شینە لەسەر زەوی چەسپیوە

## گەنجینەی ون

کە چوومە پۆل تۆف و زریانێکی تووش
سروشتی سپی کردبوو
هێشتاکە سپێدە بۆنی عەتری
ناولەپی شەوی لێدەهات
کەوێ لە ڕەنگی تاوێری چیاو
دەنووکی لە جوانی، شەبەنگی سەد ڕەنگی هەتاو
باڵی لە هەیبەتی ڕەندێ
تووکی لە شەوقی هەزار چەشنی خوناو
ڕێی کەوتبووە ناو پۆلەکەم
چی کتێبی دەستم هەبوو لە چەمکی زانست بەتاڵ بوو
کتێبی چی، تا کەو هەبێ
ڕەبی ئاگری گشت دونیا
لە جەستەی کتێب بەرببێ
دەرگام داخست
من پێم وابوو تاجی هەرچی مەملەکەتی دونیایە
هەمووی لەسەر شانی منی تەنها دایە
دڵم هێندە بە خورپە لێی دەدا
دەتگوت دەیەوێ دەرپەڕێ
هێندە بەدوای کەودا ڕامکرد
ئێستاش بە هیلاکی ئەو ڕاکردنەیە دەژیم
کە گرتم دڵی کەوەکەش
هێندە بە خورپە لێیدەدا
دەتگوت دەیەوێ دەرپەڕێ
ئێمە لەو نەخشە دوودڵ بووین

دڵی من و دڵی تەتەرێکی چیا
کە لەو سپێدە ساردەدا
قەدەر بەیەکی هێنابووین
کتێبی چی، قەڵەمی چی، مامۆستای چی
کە کەوم لە باخەڵدا بێ
ڕەبی هەرچی قەڵەم هەیە
لە دەستان کوێرایی دابێ
کە کەو وەك کەوکەوی سارا
بۆ من هاتبێتە ژوان
ڕەبی هەرچی مامۆستایە
هیچی لەبیر نەمینێت و بێتەوە ژوان
من ئێستاکە ئایندەم بەدەست کەوتووە
ڕامکرد، ڕامکرد، ئێستاش
بە هیلاکی ئەو ڕاکردنەوەیە دەژیم
دەتگوت بەرەو بەهەشت دەچووم
کە گەیشتم دەرگام لەسەر خۆم و ئایندەم کلیلدا
من و کەو تەنهاترین
دوو دۆستی یەکتر نەناسی دونیا بووین
بەرهەڵای فەزای ژوورم کرد
ئاخر منی مناڵ
کە هێشتا بۆنی شیری خاو لە زارم دێ
چوزانم کەو باڵی هەیە، باڵ
ئەو هەمیشە جێگەی دامێنی چیایە
منیش پەروەردەی باخی شار
نەمدەزانی بەتەنها کڵاوڕۆژنەیێ
بەسە بۆ ئەو لە دەستی من نەجاتی بێ

رزگاری بێ لە تەنهایی و ساردو سڕی
تێر نەبوو بووم، لە جوانی ئەو
کەو وەك فریشتەیێ سپی
لە شەققەی باڵیدا فڕی
ڕامکرد، ڕامکرد، ڕامکرد
ئێستاش بە هیلاکی ئەو ڕاکردنەوەیە دەژیم
ڕوو لەچیا، تۆف و باران
ڕوو لە بەفری باریوی کۆساران
فڕی، فڕی، هەتا لە چاوانم ون بوو
ئێستاش من هەر سەیری
ئەو کەوەی خۆم دەکەم
دوای چل ساڵان، هێشتا سەدای خورپەی دڵی
لەناو سینەم لێدەدات و نابڕێتەوە
ئێستاش ئاسەواری پێیە چکۆڵەکانی
لەسەر پێستی زاکیرەما
هەرماوەو ناسڕێتەوە
هەرکات سەیری چیا بکەم
من ئەوم بەبیر دێتەوە
ئەی فریشتەی خودا ئێستا لە کوێی؟
وەرە، دەی جارێکی دی ڕامچەڵەکێنە
تەپ و تۆزی تەمەنم لێ بتەکێنە

## حەکایەتی من و دێوەکە

ئەوە بوو سەری سندووقەکەم هەڵدایەوە
سندووقێکی تری تیا بوو
ئەویشم کردووە
یەکێکی بچووکتری تیا بوو
ناچار ئەویشم کردەوە
سندووقێکی دیکەی تیا بوو
هەمدیس ئەویشم کردەوە
دیسان سندووقێکی تری تیا بوو
هەوەس هانی دام و ئەویشم کردەوە
سندووقێکی دیکەی تیا بوو
سەری چل و چوارەمین سندووقم کردەوە
دیسان یەکێکی تری تیا بوو
ئەوە چل و پێنج ساڵە
سەری ئەو سندووقانە دەکەمەوەو
هەمیشە سندووقێکی دیکە هەیە
سندووقێ خەم
سندووقێ گریان
سندووقی ئازار
تا گەیشتمە میکرۆ سندووقی دوایی
ئەویشم کردەوە
دێوێکی هێگجار گەورەی تیا بوو
وتی: ها ئەحمەد پاڵەوان، زەمەنی پاڵەوانییەتی نەماوە
منی گرت و خستمیە شوێنی خۆی



میکرۆ سندووقەکەی خستەوە ناو سندووقی خۆی
ئەویشی خستەوە ناو سندووقەکەی گەورەتر
دیسان ئەویشی خستەوە ناو سندووقی خۆی
هەموو سندووقەکانی خستەوە ناو یەك
ئێستا من وام لەناو، هەزاران سندووق
دێوە زلەش بەسەر زەویدا دەسووڕێتەوە

## ئەوان کە گێڕایانەوە گریان

مەریەم هەمیشەو بێ وچان
ئەڤینی کەنارە دوورەکان شێتی دەکا
خۆی لە زیوی لیم وەردەدا
جاروبار یاری بە کەزییەکانی دەکا
پەنجە لە سەر گۆی مەمکەکانی دادەنێ
ئاهی حەسرەت بەبا دەکا
گەڵا دڵی خۆی دەداتێ
ڕووبار شەپۆلی لەمل دەکا
مەریەم کە ئەڤین دایدەگرێ
چاوی پڕ دەبێ لە ساماڵ
نە مەجدەل دەناسێتەوە
نە ئاوڕی لێ دەداتەوە
مەریەم لە گێڕانەوەیا ڕاستی نەدرکاند
هەمووی لە سەرسامی کوشتین
پەرشی ناو دۆڵ و ڕێگا خەوناوییەکانی کردین
کەسمان کەسی نەدەناسیەوە
باش بێ ڕەحمانە گوزەری کرد
ئەوەی بینی بووی، بەزمان نەدەگوترا
بە قەڵەم نەدەنووسرا، بەچاو نەدەبینرا
کە ئەوان هاتن
زانیم مەریەم و جوانییەکانی
لە دوور دوورەوە دێن باڵیان شلە
چاویان کولە، کرێوە دیلی کردبوون

زۆرانیش وەسیەتەکانی خۆیان دابووە مەریەم
مەریەمیش بێ پەروا
وەك بخوور دایگیرساندبوون
باش بێ ڕەحمانە گوزەری کرد
هیچی بۆ نەگێڕاینەوە
هاوارمان کرد ئەی مەریەم
مەریەم، شەومان بەسەر داهات
ساتێ بۆ شەو زۆرە، لە خۆیمان بشارێتەوە
زەمانێك بۆ ڕۆژ کەمە، ئاشکرامان بکات
ئەوسا بەیەکەوە لەمیانی گەڵا وەریوەکانی مەجدەل
خۆمان بە درەختەکانەوە هەڵدەواسی
تا سەیری ئەو دڵۆپە ئاوانە بکەین
کە هەڵدەڕژێنە سەر تاوێرەکانەوە
ئێمە پێویستمان بە وچانێ هەیە، مەریەم، وچان
وچانێ کورت، بەیەکەوە ڕازێ بدرکێنین
پێویستیمان بەسەدەیێ هەیە، مەریەم، سەدەیێ
بەیەکەوە پرتەقاڵێ سپی بکەین
دیشلەمەیێ بخۆینەوە
بەڵام شەو هەمیشە دەمانشارێتەوەو
ڕووناهی ڕۆژیش هەمیشە ئاشکرامان دەکات
پێویستیمان بەچەپکێ بای خێرا هەیە
مەریەم مەریەم ، با هەڵمانگرێ
وەك لیماوی
کەنار بەناوباخەکانی دونیا بمانسووڕێنێتەوە

پێویستیمان بە کتێبێ هەیە مەریەم
بیکەینەوەو لەناو دێڕەکانیا ون بین
ون بوون هەمیشە ون بوون، لەتەمی کتێب
ون بوون هەمیشە ون بوون، لە باوەشی بادا
مەریەم ئەودەم سەرخۆش بە گوڵەپونگ
دڵنیا بە ڕەونەقی ئەشق
ئێوارەی ناو باخە خەمگینەکانی
مەجدەلیەی تەی کرد
شوێن پێیەکانی شەوقیان لێ هەڵدەستا
ئەوە مەریەم نەبوو، کزەبایەکی بۆنخۆش بوو
قسەی بۆ ئەو تاوێرانە دەکرد
کەس نەیدەزانی بە چ چپەیەکەوە دەدوێن
گۆرانی بۆ سوارێ دەچڕی
لەناو بەڕیای پڕ تەمتوومان
منداڵی خۆی وەك بوتلە شیرێ
سپاردبووە دەستی ئەشق
خۆی و تاقە چرایەك دەچووە سەر بەردێکی دێ
چاوەڕوانی سوارە ئەفسووناوییەکەی خۆی دەکرد
لە بەرزاییەکانی تەبەرییەو
کۆڵانە تەسکەکانی سەراییل
کە ئێستا نا ئێستاکە دێ
هەڵیدەگرێ و دەیهاوێتە سەر پشتی زین
دوور دوور، دوورتر لە ئاسمانی دەبات
بەیانیان خۆی و باقەیێ گوڵەگەنم
دەگەڕایەوە سەر تاقەگردی دێ

چاوەڕوانی میوانێکی دووری دەکرد
میوانێ لە هیچ کەس ناچێ
کە لەگەڵ تیشکی نیوەڕۆی
کەمڕەنگی زەیتوونستان
بگاتە جێ
باقە گوڵەگەنمەکەی پێ بداو بکەونە ڕێ
زاکیرەی پڕ بێ لە مەستی
هەر مەل بوون
تاڵەتیشکی ناوچاوی مەریەمیان دەبرد
دەیانبەشیەوە درەختان
مەریەمیش وەك هەمیشە
تیشکی مانگی لە شەپۆلان دەردەهێنا

## دوا ڕۆژەکانی تاووس

بڕۆن لەئاوان بپرسن
کە تاووسیش چەند تەنهایە
تەنهایی تاووس لەوەوەدێ
کە هەرگیز جوانییەکانی خۆی نابینێ
ئاوڕ لەجەستەی سەد ڕەنگی ناداتەوە
بۆیە بێ پەروا زەوی تەی دەکا
تاووس هەست بە ڕەنگەکانی خۆی ناکا
بۆیە باڵی فڕینی نییە
هەمیشە گۆرانییەکانی ڕابردوو دەچڕێتەوە
ئەگەر زیوی باڵەکانی خۆی بدیبا
ئێستە شەبەنگی ئاسمان بوو
چرایێ هەیە زۆر خەمگین
لەسینەی شووشەی لێ دەدا
نهێنییەك هەیە زۆر قایم
مرۆڤ لە کارتەی گومان دەدا
وەك سێوی ناو سیپی ئەبەدی
وەك دیلێ تا دوا تەمەنی
هەر سەیری پەنجەرەی بڵندی
ناو ژووری زیندان دەکات
تاووس هەرگیز جوانییەکانی خۆی نابینێ
شەوێکیان

خەونی بە ئەفسانەی جوانییەکانی خۆیەوە بینی
پەڕو باڵی غەرقی شەونمی سپێدەی سارابوو بوو
تەنها تر لەدیلی زیندانی سەر زەوی
لەژێر باڵی کەسك و کنێریا هەڵکورما
لەپڕێکا کەوت و جوانییەکانی ڕماو
خەونی لێ هەڵبزرکا
مشتێ لەمەرجانی فرمێسکی ڕژایە سەر زەوی
زۆر گریا، زۆر گریا
بۆنی گریان شەوبۆئاسا دەپڕژایە ناو دڵی شەو
گریانێ وەك خەنجەر لە گیانیا دەچەقی
باڵێکی لە گۆمی ئاوی ساردی چیا
باڵێکی لە هەوری زۆر سپی ئاسمان بوو
من بینیم چۆن چۆنی خۆی بەبا هەڵواسی
چۆن چۆنی دەگریا
لەو ڕۆژە بەدواوە کە تاووس
ئەو خەونەی وا دیبوو
هەمیشە هەرسەیری ئاسمان و هەوری دووری دەکرد
باڵی خۆی لەفڕین ڕادێنا
بێزار بوو وەك بێزاری پەڵکی هەڵەکۆك
لەژێر ڕەنووی بەفردا
دەیزانی زەوی جێی ئەو نییە
بەدەنووکی نوقرەیی، شانەی باڵی دەکرد
تووکی خۆی بەو خەونە دادێنا
ڕۆژێکیان ئەو خەونەی بۆ بێچووی گێڕاوە
دوا لوقمەی نایە ناو دەمیەوە

گەردەنی نایە سەر گەردەنی هاوسەری
دوا نیگای کردە سەر بەندیخانەی زەوی
هێند باڵی لێکدابوو
بۆ فڕین ئۆقرەی تیا نەمابوو
سەیرێکی بەفراوی ئاسمانی دووری کرد
تا توانی باڵی خۆی هێناو برد
جوانییەکانی خۆی کەوتەوە بەرچاوی
لەشەقەی باڵیدا هەڵفڕی
هەڵفڕی، هەڵفڕی، تا توانی هەڵفڕی
هەر بۆیە ئێستاکە زەوی خاڵی بووە
لە بروسکەی شین و لەچەمکی جوانی

## قسەی عاشقان

1

هێندێ خەم هەن لە سینەمدا
زەمەن پەرش و بڵاوی کردوون
تازە بۆم کۆناکرێنەوە
کاتێکیش دەیاندۆزمەوە
لەناو خوێن دەیانشارمەوە
دووبارە لێم ون دەبنەوە
هێندێ ئاماژەی ئەوینم لە دڵدایە
مانام بۆ لێك نادرێتەوە
بەڵام هەرگیز لە زەینمدا ناسڕێنەوە
وەك شووشەی مانگ
لە شادەماری ڕۆحمدا دەدرەوشێنەوە
ئەو جۆگەلە خەمگینانەن
کە جارجارە دەگمەنترین مەل
ئاویان تیا خواردۆتەوە
جوانترین ئاسك
مسکی خوێنیان تیا ڕشتووە

2

لەبەرزترین دەنگەوە، کپیتان بۆ دەهێنمەوە
لە ئاسێترین جەنگەوە، نامەی ئایندە دەهێنم
لە نزمایییەکاندا گوزەر دەکەم
تا لە بەرزایی ببینن

3

هەزاران جار کانییەکانم

بەناو لەپم گواستۆتەوە

بە لەشکری هێمنی، ڕەشەبام دیل کردووە

بە گەلێ شوێندا ڕابردووم

سروشت پەی پێ نەبردووە

لە ناکۆکیەکاندا چەپکەنەی کۆکیم کردووە

قسەم لەگەڵ بەرد کردووە

4

خوێنێ بەلەشما دێ و دەچێ

تێکەڵی خوێنی باز بووە

من بەلاغەتێکم پێیە

کە پڕی جیلوەو ناز بووە

5

درەنگ هاتی لەمێژە خۆر

لە ڕۆخانەی ئەوینی من ئاوا بووە

تاقە شەوقێ لە سینەی مندا نەماوە

ئەوەندە بەدواتا تیشکی چاوم هاوێشت

زۆر لە مێژە شووشەی ڕوانینم شکاوە

هاکا ڕووناییی چاوانم لێ داڕژاو

دڵم لە جەستە ئاوابوو

6

بەر لە هاتنت هەمیشە
من لە ناوپەڕی کتێبان
زەینم تژی خەون بوو بوو
لە ئەفسانەی هات و نەهات
قەڵەمم گیری خواردبوو
لە تەنهایی ئەویندارān
لێکدانەوەم ون کردبوو
بەر لە هاتنت زۆر شارو دێم بڕی بوو
کە لە کەڵی کێو دەرکەوتی
تەمەنی من ئاوا ببوو
لە مێژ بوو پاییز میوانی ماڵەکەم بوو
بیناییم زەرد
باخچەم پڕ تەرمی گەڵا بوو

## فێرژیل لە تەمتووماندا

دەمەوێ زیندووت کەمەوە لە ڕامانم
تا نەمر بی، لەناو پەڕی تەڕی نارنجی زمانم
یا لە شیعرێ، ترووسکەیێ
یا لە دەریای بێ ئامانم
شانەکان پڕ دەبوون لە ئاڵتوونی خەیاڵ
پیاتریس دەهات
لە تارای ڤومێکا وەك مەستی هەستی دادەگرتم
پەلکێشی نێو گەمەی میعراجی ئەبەدی دەکردم
ئەو ساتە هێندەی تر لە مەستی جوانیدا دەمردم
نوورێك بوو لەکانی شەبەق
ئەو کاتە لە خەیاڵی شەوێکی تەمبارا
لە ڕۆحێکی تەنهاو بە باچووی زێمارا
باوەش باوەش، مەلۆی لەڤینم دەچنی
ڕووبار ڕووبار مەستیم دەبەشیەوە
مەلەکان، لە خەوی ئاڵی فڕین بوون
مەستەکانیش لە ترۆپکی هەڵچوون و چڕین بوون
خانەقاو خەراباد، مەیخانەو مەیکەدە
تەنها بووم تەنها
تەنهاتر لە دڵێ لەژێر تارای تیشکی لاهووتا
گۆرانی بۆ دۆستی خۆی بڵێ
کە ناڵەی جودایی ڕماندی
تەنهاتر لە شەونم کە دەتکێ و لە دەریا ون دەبێ
دەنگێ دوور، هێجگار دوور
وەك ئەوەی

لە ئەشکەوتی بەردینی چاخەکان هەڵبچێ
ئاوەها بانگی نێو شەوق و نووری دەکردم
من ورد ورد لە مەستی ئەو بانگە دەمردم
کە مەستی منی بردبووە قووڵایی هێجگار دوور
ئەو بانگە دوورە بوو سەراپای لێگۆڕیم
ئاوازێکی تری پێ بەخشیم
لە ئاوازی سپی نەی دەچوو
زمانێکی تری پێ بەخشیم
لە زمانی مەستی مەی دەچوو
بینینێکی دیکەی دایە چاو، گلێنەی نەخشاندم
تا دەهات غەرقی تەمتوومانی ڕێ دەبووم
غەرقی سپیاتی نێو چەوانی فەرژیلی ڕێبەرو
پیاتریسی جوان دەبووم
وەك ئەوەی دەوڵەتی مەستی بم لەو ئاڵا
بەسەر ڕۆحی ترسباری منا دەشەکایەوە
وەرە ئەی فێرژیلی سپیتر لەو تەمە
وەفادارتر لە دوا دڵۆپی مەستی
دەستم بگرە با بە ناو ئەو نوورە ڕەت ببـین
لە ژەنگی وجوودی سەر زەوی بەدەربین
تێکەڵی دوا ئومێدی قەزاو قەدەر بین
نەبادا دووبارە
تێکەڵی ناو ئاگری دۆزەخی سەفەر بین

## غـۆمــــا

غۆما، ئاخ تۆ بریقەییێکی چەند دووری
لەنێو زەین و زیوانی خوێن
پارچە مەرجانێکی چەند ونی
لەناو لیتاوی زەمەندا
کە جارجارە لەناو باخی دیدگاما دەتروسکێیتەوە
خۆمم پێ دەبەخشیتەوە
تۆ چ تەوقێکی دڵنیایی بەسەر ڕۆحی شکاوی منا
هەمیشە دەزرنگێیتەوە
جارجار بێ تۆ گەورە دەبووین
تەمەنێکی چەند خەساربوو
بیرتە لە ژێر تریفەی مانگی سەر گەڵاکان
بابۆڵەکانمان پڕ لە شەوق و شەباقە دەبوو
باوەشمان پڕ لە پەری
زۆر بووین زۆر
هێندێکمان گەڵای ڕۆحی هەڵوەری
ئێستا وا لەناو خاکدایە
هێندێکمان لەژێر تۆزی غوربەتا
گۆرانییەکانی منالّی دەڵێینەوە
هێندێکیشمان تا ئێستا ڕادەکەین و ناگەینە جێ
غۆما، ئەوە نەبێ تۆ پاك وەکو گوڵێکی سپی
ئێمەش پڕ لە گوناه وەکو دڵێکی ڕەش
کە ئێمە جارجار دەگریاین تۆ هەمیشە پێدەکەنی
ژیان بۆ تۆ ئەوەندە بوو کە مانگەشەوێکت هەبێ

له ژێریا سەیری ئاسمان بکەیت
بیر له باوانه دوورەکانت بکەیتەوه
بەیەکەوه گەوره دەبووین
ئێستا تەنها، تەنها
تەنهاتر له کێڵی ئەو گۆڕستانەی
که ژینمان لێ بەڕێ دەکرد
تەنهاتر له درەختی گومەزەکه
که ئێمه به هۆی باڵندەکانی سەریانەوه
فێری گۆرانی چڕین بووین
بەڵام که فێره فڕین بووین
هەرگیز یەکترمان نەبینییەوه
منداڵەکان هەموو پیربوون
بێ ئەوەی گەنجێتی ببینن
هەمووی وەرین بێ ئەوەی شین بن
بوونه ئەو گیایه سەوزو جوانانەی
که بەسەر گۆڕەکانەوه شین دەبوون
بوونەته فەرشی ژێر پێمان
غۆما ئێستاش جێ پەنجەی منداڵان و
جێ چڕنووکەکانی تۆ بەسەر شوورەی
گەڕەك هەرماون
ئێستاش سەدای [illegible]رەی تۆو
گۆرانی مانگه ش[illegible]انی ئێمه
له گوێی ڕێبوا[illegible] هەرماون
غۆما ئێمه ب[illegible]ەرفی سەر ئەو کێلانەوه
فێری نوو[illegible] بووین

به شیعری سەر ئەو کێلانەوە
فێری حەماس و فڕین بووین
لە کوێی لە کوێی؟
تۆ بەشت هەبوو لە شینمان، لە گرینمان
تۆ بەشت هەبوو لە قاقای پێکەنینمان
غۆما، ئاخ تۆ بریقەیێکی چەند دووری
پارچە مەرجانێکی چەند ونی
جارجارە لەناو باخی دیدگاما دەترووسکێیتەوە
خۆمم پێ دەبەخشیتەوە
تۆ چ تەوقێکی دڵنیایی بەسەرڕۆحی منا
هەمیشە دەزرنگێیتەوە.

* غۆما: سەگێکی گەڕەکەکەی ئێمە بوو، منداڵێتیمان لەگەڵ ئەو سەگە بەسەر بردو بەیەکەوە گەورە بووین

بورجی بەلەك

دەستێکی لەناو بوون بوو
دەستکێشی لەنێو عەدەم
باڵێکی لە نێو یاقووتی سپی تەمتوومان
باڵێکیشی لەنێو تۆڕی دەریای گومان
بەڵام هەمیشە ترووسکێ لە شەوق و نوور
تەمێ لە چەشنی بەللور
بەسەر بورجەوە هەڵدەچوو
خەونی ئێمەی هەڵدەوەشاندەوە



## کتێبی هەمووان

عاشقەکان سادەن لە نزمییەکاندا دەژین
بەڵام لە بەرزاییەکانەوە دەمرن
هەمیشە بێدەنگ ، هەمیشەخەمگین
بەڵام لە دوورترین شوێن دەبینرێن
عاشقەکان تەواو وەك شەرابی ترێن

* * *

بە هەموومان کتێبێکمان هەبوو
هەریەکەو بە جۆرێ لێکیدەدایەوە
هەبوو لە دوای خوێندنەوەیا بوو بە عاشق
هەبوو شێت بوو، هەبوو سەرخۆش
هەندێکیشیان شۆڕشگێڕ
بە هەموومان کتێبێکمان هەبوو
کتێبی نیشتمان

* * *

ئەوەی لە باڵی فڕینی دەزانی
سەرخۆش بوو گۆرانی خۆی چڕی
دوای خوێندنەوەی دڵی یەکتری
ئەوسا زانیمان ئەوە ناڵەی ئەبەدی مرۆڤە
لەناو کتێبی سەر زەوی
ئێمە بۆ ئەوە دەچووین
بگەینە بەردی ترۆپك
بەڵام هەمیشە نیوەڕێ قووتی دەداین

بۆ ئەوە کتێبمان دەکردەوە
تا پەلی ئاگاهی بگرین
بەڵام هەمیشە سەرخۆش دەبووین
گەرەکمان بوو بفڕین
بەڵام پێمان لە زەوی نەدەبۆوە
ئەو کاتە گەیشتینە ترۆپك
چاومان بەرپێی خۆمانی نەدەبینی
ئەو کاتە توانیمان بفڕین
کە زەوی بۆ ئێمە باشتر بوو

## ماندووم دەشتی گیان ماندووم

درەنگەشەوێ شنەیێ کەوتە خوێنمەوە
هەست و خوستی خۆم دایە دڵ
ئەو دڵەی چەند رەشەخەم و تاڵی ڕۆژگاری نۆشیوە
سەدان هەزار گوڵەخەندەو بڕکی فرمێسکی ڕنیوە
هەورازو نشێوی دڕ، ملیۆنان خورپەی شیرین
پەمۆی نامۆیمی چنیوە
بینیم کزکز لێدەدات، رۆژگار پرزەی لێ بڕیوە
گوتم ئەی دڵ ئەی شاهینی ناو سینەی من
بۆ وا ماتی باڵی جارانت نەماوە
ئەتۆ نەبووی
خوێنت دەڕشتە ناو جەستەو
دونیات دەکردە گۆرانی؟
ئەتۆ نەبووی ئەستەمی ژینت ڕادەداو
کێوت دەکردە ڕاستەقان
ئەتۆ نەبووی سەدای خورپەت
دەگەیشتە سێرەی ئاسمان؟
چاوێکی هەڵبڕی و گوتی:
ماندووم دەشتی گیان ماندووم
ڕۆژگار هەر چاوەڕوانی بوو
شاخ و دەشت و چۆڵ و گیا
تەم و بەفرو باقەی چیا
ماندووم دەشتی گیان ماندووم

ئێستا کزومات بە ئاستەم خوێن دەگێڕم
هاکا دواخورپەی خەمگینم
بۆ ناو جەستەی تۆ بنێرم
لێم ببوورە ئەی دۆستی ئەبەدی خورپەم
قەدەر ئەوەندە ڕێی پێدام
ڕەنگە لەیەك جیا بینەوە
تۆ بۆ ناو گڵ و تاوێرە بەردو ڕێگەوبان
منیش وەك بازێکی باڵ شکاو
بۆ ناو مەلەکووتی ئاسمان

## سرووتی شکاو

1

کە بینیم کەوتۆتە ناو گۆمی خەمگینی
هەر سەیری من دەکا
پارچەیێ لە بۆن و بەرامەی درەختم
لە زەرفی گەڵایێ بۆ هەنارد
کە نامەی ناردەوە ئەو مانگی دڵشکاو
تەڕتەڕ بوو
کە باخچە هات سەرێ لە نەمامی دڵ بدا
نامەکەم نیشانداو نایە ناو باخەڵی
لەو ڕۆژەوە
هەر باخەو مانگێکی لە دڵی خۆی ناوە
هەر چڵە و خونچەیێ فرمێسکی
لە بەرۆکی تەڕو خەمگینی خۆی داوە

2

نەدەبوو ڕازی خۆم بدەمە باو باران
تا ئاوا بیگێڕن بە شاران
نەدەبوو من نامەی ئەو مانگی دڵشکاو
بدەمە دەست باخچەو
بیخاتە ناو تیشکی نارنجە جوانەکانی هەتاو

3

دەچمەوە دارستان
شووشەیێ لە عەتری جاویدان
نەوارێ لە گمەی کۆترو
کاسەیێ لە ورشەی درەختی گێلاس و

جۆگەیێ لە خەونی عاشقان
دەبەم بۆ جوانێ
جوانێ لە ڕێگەی وەرینی گەڵاوە
بە چاوی ئاوێنەی هێشوێ
لە ئاقیقی شکاوی دڵم ئاڵاوە
زیوی سەر گوڵە گەنمەکان
لە دوورەوە لە پشت پەردەی تەمتووماندا
وەك قەندە شەکرێکی شکاو
لەدەمی بادا دیاربوو
نوقمی نەشئەی پڕ سەما بوو
سەیری شووشەی شکاوی خۆری دەکرد
4
ئەسپە کێویەکان
هەمیشە ڕایاندەکردو ڕایاندەکرد
کە هیلاکی لیکی دەمی دەکردن بە ئاگر
بەسەر گردێکەوە
وەك کۆمەڵە عاشقێ گرد دەبوونەوە
ئەوانیش بۆ ئەبەد هەر سەیری خۆریان دەکرد
گیانی پڕ تاسوق دەکردن
پاشان دەگەڕانەوە سەر ئەو گردانەی
بە ئاستەم خۆریان لێ دیاربوو
خۆرئاوابوو، هەرچی شەوق و شەباقە بوو
لەبەر چاو نەما
بە یەکەوە بە دوای ئەو ئەسپانە کەوتن
کە هێشتا چاویان پڕ لە تیشکی خۆر بوو
شیری ئەو مایننانەیان دەخواردەوە

**که نووریان لێدەپڕژا**
**هێندە بە دوایانا ڕایاندەکردو ڕایاندەکرد**
**کەشەنگ دەبوون ئاگایان لە دونیا نەدەما**
**تا لە ناوەندی جەزبەو ئەوین و گریان**
**دەستمان لە دامێنی خۆر گیر دەبوو**
**بە تیشکی داغی ئەو خۆرە مەست دەبووین**
**تا بووین بە زوخاڵ**
**بووین بە پارچەیێ لە گەمەی**
**چارەنووسی دەستی مەحاڵ**
**ئێستاش نەگەیشتینە شەوقی ئەو چڵەی**
**کە بەسەر گردەکانەوە**
**لەناو تارای تەمتوومانەوە**
**هەمیشە سەیری خۆرەتاوی دەکرد**
**ئێمەشی بەرەو زوخاڵی ئەبەدی دەبرد.**

## کتێبی ڕووناکی

تۆزێ لە ئەندازەی خۆت وردبەرەوە
خەریکە ڕووناکیت دونیام لێ وندەکا
دەمەوێ ڕوخسارت ببینم
دەشزانم ڕوخسارت ئاشکرا بکەی
من کۆتایی خۆم دەبینم
بەیەکەوە هەڵناکەین
بێ یەکتریش ژەهری هەلایە
بوونی من لە ئەزەلەوە
لە مەچەکی تۆ ئاڵاوە
بوونی تۆش لە ئەزەلەوە
لە درەختی ڕۆحما پژاوە
ئەمە گەمەی قەدەرە
من بۆ سپێدە رادەداو تۆش بۆ ئاسۆ
چەند لێم نزیك دەبیتەوە
ئەوەندە ڕووناکیت دەمباتەوە ناو مەحاڵ
ئەڤینی من و تۆ بەو قەدەرەوە جوانە
نەپێت بگەم نە پێم بگەی

## باکوور هەمیشە باکوور

بەسەر قایغە شکاوەکانی قوڵایی تەمی دەریایان
بەدیار ئەو ئاگرانەوە
کە ترۆپکیان نوورباران دەکرد
باکوور هەمیشە باکوور
لەوێ جوانترین یادو یادەوەری
جوانترین گۆڕ
جوانترین کێل
باکوور هەمیشە باکوور
خەونی سپی و نوورو ئەفسانە
شەوقێك بوو لە باخی بەهەشت
دڵێك بوو لە سیمای ئاو
باکوور هەمیشە وەك وێنەیەکی درەوشاوە
لە دێر زەمانەوە
لە نێو زەینم ورد ورد کاڵ دەبووەوە
من عاشقی باکوور بووم
ئەو نە کچێك بوو
نە ژنێك،نە ژوانێك
خۆم بووم خۆم هەمیشە عاشق
ئەوەی خەوی بە باکوورەوە دەبینی
عاشقێکی تەنها
تەنهایێکی عاشق
کە تا ئێستاش هەر بەو عەشقەوە ماوم

## به یەکەوە پیربووین قەڵا

سەیرکە قەڵا هەموو شتەکان بەیەکەوە
بە تەنهایی پیر دەبن
من و تۆ نەبێ وەك دوو عاشق
وەك دوو چڵەگیای کەناران
وەك دوو هەڵۆی ترۆپك و دەمی بناران
بە یەکەوە پیر دەبین
درەختەکان، بۆنی پایز دەکەن و پیر دەبن
رووبارەکان، لەناو گەرمایی قەدەرا پیر دەبن
تەنها من و تۆین وەك دوو نوور
وەك دوو عاشقێ ئەوەندەی خوداو سۆفی
لەیەك دوور
بەیەکەوە پیر دەبین
تۆ دیوار دیوار لە گیان و
تەلار تەلار لە جەستەت دەڕمی و دەکەوێ
منیش دەمار دەمار لە ڕۆحماو
بزە بزە لە لێوما سپی دەبێ
تەنها من و تۆین وەکو دوو تینو کە هەرگیز
تینوێتیان نەشکێ
لە یەکتری دەخۆینەوە
وەك دوو پەیکی بەیەك گەییوو
لە خوێنی ڕوانینی یەکتر
رۆژانە ڕۆح دەشۆینەوە
تەنها من و تۆین
نە لەیەك تێر دەبین و

نە بێ یەکتری هەڵدەکەین
ئەوەتا تۆ لە گزنگەوە تا گزنگ
بەسەر تاقە بەرزەکانتەوە
سەیری بەژن و باڵام دەکەی
هەنگاوەکانم دەژمێری
گوێ لە گۆرانیە خەمگینەکانم دەگری
کە بۆنی ئەڤین و گریانیان لێدێ
سەیری پیاسەی ئێوارانم دەکەی
منیش لە سپێدەوە تا سپێدە
سەیری تاقە بەرزەکان و
نەخشە دێرینەکانت دەکەم
کە پڕن لە نووسینی مناڵی
پڕن لە یادگاری تفت و تاڵی
سەیری کۆڵانە تەنگەکانت دەکەم
کە کۆنترین پووشیان بەسەرەوە
قەڵا من و تۆ، بەیەکەوە پیر بووین
نە چیرۆکی تۆ،لە مندا تەواو دەبێ
نە چیرۆکی من،لە تۆداکۆتایی دێ
چیرۆکی ئەو شەڕانەی
کە بە بەردەقانی داود تەواو دەبوو
بە خوێنی ڕژاوی سەری مناڵان ڕەنگین دەبوو
بە یەکەوە پیر بووین قەڵا

## مردن له سه‌ما

من به‌و سه‌مایه ده‌ژیم
له باڵی فڕنده پێده‌کرێ
تا ئه‌به‌د ئاگری فرمێسك و خه‌م ده‌گرێ
گه‌ڵا وه‌ك ته‌می دوور، وه‌ك ئاڵتوون
ته‌ك ته‌كی دره‌ختی دارستان داده‌گرێ
ئه‌وان به‌و سه‌مایه ده‌ژین و ڕاده‌برن
كه مرۆڤ ده‌بوایه له‌و سه‌مایه بمرێ

## سه‌مای شه‌وق

پیرۆزه‌ی ئاسمانیش له تاوان پیر ده‌بێ
په‌رییه‌كانیش قژیان
له ئاگری ئه‌به‌دی گیر ده‌بێ
ئه‌ی مرۆڤ، ئه‌ی مه‌لی به تیران پێكراو
ئه‌و دڵه بچكۆڵه
وه‌ك مه‌ركانه‌یێكی پڕ تیشك پژایه سه‌ر زه‌وی
دونیا پڕ بوو له زیو، له بریسكه‌ی هه‌تاو
زیوێ هه‌ر بریقه‌ی له دڵۆپه ئاویه‌رێ
هه‌ر له‌نجه‌ی له ڕه‌گێ
له پارچه‌ی شكاوی گه‌وهه‌رێ

## سەمای شەراب

دابەزە، دابەزە، دابەزە
ئەی مەلی تازە وادەی فڕین بەسەر لەوحی بوونا
ئەی داو داو لە ڕۆحی درەخت و
دوا قەترە لە پێکی هەبوونا
من لە تۆ باس لە گریانی قووڵی خۆم دەکەم
باس لە ونبوونی ئینسانیی خۆم دەکەم
باس لەو دڵۆپ دڵۆپ خوێنە سپییەی تۆ دەکەم
کەوەکان دەنووکیان لێدەنا
هەناویان دەکردە دامێنی ئارانێ
کە سەرخۆشیش دەبوون
عاشقانە دەفڕین
لە ترۆپکی چیا بۆ زەوی دەهاتنە خوارەوەو
دەکەوتنە بەر ماشەی ڕاوچییان

## سەمای سەمایان

سەمای تۆ، سەمای من
سەمای گەڵا، سەمای مەلان
سەمای کەوان
یەك کەوتن، یەك مەرگی بێ ئامان
یەك پێکی لێوان لێوی جامان
با سەما بەردەوام هەر هەبێ

## سەمای خاك

سەمایێ لە ئاگر
بمانباتەوە نێو دیرۆکی دێرینە
سەمایێ لە ئاو
لووڵماندا بۆ شەپۆل
شەپۆلێ لە مەستی
دیدگا و خەونت داگیرسێنێ مەستیمان بکاتە خەیاڵێ
سەمایێ لە بۆنی گەرمی خاك
ڕامانکێشێتەوە ناخی خۆی

## دوا سەما

سەمای خۆتان بکەن
کەس نییە لە شاعیر زیاتر
شارەزای تەرزێکی ئاوەهای سەما بێ
ئێوە بەو سەمایە هەرگیز نابڕێنەوە
کە جوانی هەڵڕژا وەك مەرگی ئێوەیە
تازە کۆ ناکرێتەوە
با هەبێ نارینی ئەم گەرمە سەمایە

## تار تەنها تار

ئەوەتا پەیکێکە دەیبینم ڕێ ڕێ بۆنی دەڕوا و
گوڵە پەمۆکان دەخاتە سەما
سەمایێ کاتێ کە هەڵدەکا
ئاگرە دوورەکانی دڵمان گەش دەکاتەوە
کە خامۆشیش دەبێ
یادەوەریمان بیر دەباتەوە
خۆی و قاپە شەڕابێکی هەنگوینی
کە تازە ئاسکێ چەند قومێکی گەرمی لێدابوو
وەك شێت بە ناو دەشتاییەکاندا دەسووڕایەوە
دەگەڕایەوە ئەشکەوتە دوورەکانی تەباری خۆی
شەرابێ ئەو کاتە گوڵی مەستی دابوو
کە کچەکان لە ئورۆکەوە
لەبەردەم جوانیدا شل بوو بوون
من ئەو دەمە لە باخێکی ئیرەمدا
فڕینم لە باڵی تاوسێ هێنا بوو
خەمگینیم لە ڕوخساری ئاسکێ
کە لە بنارێکی قووڵەوە
دادی خۆی بە خودا دەسپێرێ

## گەڕانەوەی تارژەن

لەوێ کە سەدای تار
دەمار دەمارلە گیانی کەون دەگەڕا
بڕیارم دا ئەو نەوایە ڕژاوانە کۆکەمەوە
باقەیێکی بدەم بە قوڵینگەکان
بە دونیای بگێڕن
بڕیارم دا ئەو نەوایە کۆکەمەوە
باوەشێکی بدەم بە با
بە ناو کۆڕەوی کچە جوانەکانی تەبەسی دابەشکەم
ئەوان کە لە لێواری کاستێلیا
گوڵە شەبەقی خۆیان بۆن دەکەن
خۆیان بە ڕۆنی تازە فەریکی جەنجەفیل
چەور دەکرد

## تروسکێ لە تاریکی

با هەڵرژێ ئەو نەوایە
کە لە تاریکییەکی زۆر زۆر دوور
دەمی کۆنە برینەکانم دەکاتەوە
پیاوان دەباتەوە سەر زێیە دوورەکان
گەڕان بە دوای ئاوی جاویدانی
ژنان دەباتەوە مەیخانە
مردووەکان هەڵدەستێنێتەوە
دوای پارچەیێ سەما
دووبارە هەڵدەوەرێنەوە

## هەڵەكۆك

ئێستاش لە هەر شوێنێ درەخت چرۆ بكا
لەهەر شوێنێ قومە ئاوێ
تێكەڵ بە بەژنی گیا ببێ
كە گوێم لە دەنگی تار دەبێ
چریكەی خۆم دەناسمەوە
سەراپا ئەو جەستە تار و مار دەبێ
خۆم دەبینم ورد ورد تێكەڵی خۆڵ دەبم
دەبمەوە خاكی سەرەڕێ
خۆم دەبینم هەموو وەرزێ
گیا لە سەرم شین دەبێ

## دوا سنوور

که پێی گوتم ئیدی تەواو
تازە هەرگیز لیمۆکان ئاو نادەینەوە
ناچینەوە ئەو ڕەزانەی
لە ژێر نووری مانگە شەوا
لانەمان بۆ تەوارەکان لە تابانی ڕۆح چێدەکرد
ئەو کاتە ڕێگایێکی دوور دوورمان بڕیبوو
پێمان وابوو لە دەرەوەی مەملەکەتی خوداین
لە دەرەوەی خەون و خەیاڵ

## تای ئەوین

جوانییەك لە ئاسمانەوە هاتبوو
جوانییەك لە شەوقی نێرسیس هەڵدەچوو
وەك کەوسەری ئاڵ، ڕۆحی هەڵتەکاندبووین
گۆرانییە دێرینەکانی ئەویننداری
لە کارتەی سۆزی دەداین و زمانی دەشکاندین
وەك دوو مامزی ماندوو
وەك دوو تروسکەی چاوی مەل
وەك دوو پەڕی تاووسی ناو چاوی هەتاو
بە خەمگینی، خەمگینتر لەو دڵانەی
وەکو شووشەی عەتر شکان
دەگەڕاینەوە ناو ڕەحمی خاك
ئۆف ئۆف بۆنی خاك
ئێمەی دەبردەوە کوێ
بۆنی خاك
چۆن وەك گەڵا وەریوەکانی شەوبۆ
لوولیدەداین

## بۆ ناو ماڵی یەکەم

دەچووینەوە ناو باخچەکانی منالّی
حاجیلەکانمان دەچنی
بۆ سەر گۆڕی ئەوینداران
پۆل پۆل مەلەکان دەهاتن
سواری سەرپشتی کەڵە کێوییەکان دەبووین
خودایە بمانکەیتەوە خۆڵ
تا لە مانای ئەڤین بگەین
شارەزای زمانی چرین بین
ئۆف بۆنی خاك، بۆنی خاك
ئۆف ئۆف ئۆف ئۆف لۆف، بۆنی خاك
خودایە تا ئێستا لە زمانی ئاسمان ناگەین
دەمانەوێ فێری فڕین بین

## بێریا لە تەمتوومان

بێریا، پەلکە ڕێحانەی سەر سینەم بێریا
بێریا: ئەی پیرۆزەی ئاسمان، بێریا
کراسی گیایی، ماتەمینیم، بێریا
مەگری مەگری کە تۆ دەگری
ئاگر لە گیانم بەر دەبێ
مەگری مەگری دوای کەمێکی تر
دوای تەواو بوونی فرمێسك و کوژانەوەی یادەوەری
دوای ئەوەی خامۆشی ئەو ناوە دادەگرێ
ئەستێرەکان هەڵدێنەوە و ڕەوە مەلی شەوان دێنەوە
بەری ئاسمانێ دەگرن و جریوەیان کەون پڕ دەکات

تابان لە دوورەوە

بانگم دە کەی
منیش گۆرانییەکەی جارانت بۆ دەڵێمەوە
کەزی درێژی خودایی
خوایە نەکەویە جودایی
گەورە بی دوڕو گەوهەری تاجی شات دەکەنە سەری
مەمکەکانت پڕ دەبن لە شیری شێر و
زمانت پڕ دەبێ لە بالۆرە و گفتی جوانی

## نەواژەنە خەمگینەکە

ئەوسا بەیەکەوە دەچینەوە سەر گردەکەی جاران
لە وێوە سەیری باخاتی ترێ دەکەین
کە تریسکی هێشووەکانیان ئاگر لە جوانی بەردەدا
ئەو دەم دونیا لە خۆراوابوونێکی ئەبەدی دەچوو
کە ئیدی نەگەڕێینەوە ناو ماڵی گیا
نەچینەوە سەر ئاوەکان
چاوەڕوانی قەتارەی قوڵینگان بکەین
نەگەڕێینەوە ناو ماڵی شمشاڵژەنە خەمگینەکان
گوێ لە نەوای ڕۆحمان بگرین

## شەڕە پرتەقاڵ

ئێمە لە باێنکی گەرمی بێ ڕەحمدا ئاسێ بوو بووین
بەیەکەوە هاوارمان دەکرد
بەڵام ئاخ بە تەنها سەدای خۆمان بوو
لە دوور دوورەوە دەگەڕایەوە ناو زەینمان
لەناو شەڕێکی سەختی زەردە پەڕا
دونیا نوقمی پرتەقاڵ بوو بوو
بێریا لەناو بێزارییەکانی خۆی
نامەکانی یەکیەك دەدڕان دەتلایەوە
ئەو نامانەی تەڕ بوو بوون بە فرمێسك و
شین هەڵگەڕا بوون لە خەمان

## ئۆف ئۆف

ئەی خودا ئێوارەییێکی چەند سەخت بوو
هاوارمان دەکرد ئیدی تازە تەواو
نەیەکتری دەبینین و نە چاو بە چاو دەکەوینەوە
تەمتوومانێ دایگرتبووین
کەسمان کەسی نە دەبینی
هەموو بەیەکەوە هاوارمان دەکرد
هەیداد هەیبێداد ئەی فریاد ڕەسی خودایی
کەی دەگەینەوە ئەو بنارانەی
جۆگەلەکانی ئاویان لە بەهەشتەوە دێ
خوڕڕەیان لە ماڵی ڕەهایی
پلوسکەی بەردەکانیان
لە گەردنی کچەکانی ئاوایی

## کتێبی مەلەکان

ئێستا تەنیاین تەنیاتر لە کەسێ پیاسە بکا
بەسەر گەڵا زەردەکانی باخی گومان
دوای کوژانەوەو سیس بووغان
لەژێر تریفەی تەمەن و
دوای نوقم بوون لە زێی پڕ لە ژەهری زەمان
دوای ئاوابوون لەنێو کۆچێکی بێ ئەمان
هێلانەمان بۆ دەکردن
لەنێو تەمی یادەوەری پەیکەرمان بۆ دادەتاشین
کە لە ناو خانەی خەیاڵمان ئەبەدی بوون
بچووك بچووك بەنێو شینایی ئاسمان و
هەندێ جاریش بەسەر پەڵە هەوری سپی
دەگەڕانەوە ناو کوختە و ژێر سایبتەی ماڵەکانمان
جێی خۆیان لە دەفتەر و ڕحلەی شکاوی
منالیمان دەکردەوە
دەهاتنە سەر تاخچکەکانی ناو ژوور و
بەسەر بالیف و قەڵەم و قۆغەکانمان هەڵدەنیشتن
دەهاتنە ناو جانتاکانمان

بەیەکەوە شیرمان دەخوارد
دەهاتنە ناو پۆلی ساردی قوتابخانە
شەوانیش لەگەڵ ئێمەدا
ئەستێرەکانیان دەژمارد
ئەو ئەمانەتەی لەلایان جێ هێشتبووین
کە بریتی بوون لە کۆمەڵێ جریوە و باوەشێ پەڕ
قەیرێ چیلکەی سوور و سافی داروپەردوو
هەندێ ڕەنگی سەر دەنووك و سپی زمان
لێیان وەردەگرتینەوە
دەیانبردەوە بۆ ئاسمان

## سڵاوی باڵندان

بە باڵە ڕەش و ئەبەنووسە جوانەکانیان
سڵاویان دەکرد
سڵاو ئەی بێگوناهە جوانەکان
سڵاو ئەی قژ زەرد و باسك سپی
زمان پاك و دڵاویەکان
سڵاو کە هێشتا خەونی سپێدە
بەدەوری چاوتان دەسووڕێ
هێشتا بۆنی عەتری سینەی دایك
لە سورفلی ڕوومەتتان دەتکێ
سڵاو گوڵە باخەکانی زەوی تەنگ و وێران

## دیارییەکان

هاتووینەوە باڵمان پڕ لە تیشووی سێو
دڵمان پڕ لە باق و بریقی شاران
زمان پڕ لە حەکایەتی ئەشکەوتە دوورەکان
بەڵام ئێمە بۆ هەر بریقەیێ لە چاویان
تیغێکمان لە نێو پەنجەدا حەشار دابوو
بۆ هەر لەپێ لە ئەڤینیان
قومێ تووڕەییمان پێ بوو
بۆ هەر دەمێکی پڕ لە نەوایان
مشتێ ئاوی ژەهراویمان پێ بوو
ئای خودایە ئەوە چ لەززەتێك بوو
ئێستا لە گوناهی لوولداوین
لە شەرمێکی ئەبەدیدا ڕاوی ناوین
ئێستاش بەدوای ئەو چەمە ئاوە
دوور دوورانەوە عەوداڵین
پاکمان کاتەوە
دەچینەوە ناو خەڵوەتی ئەشکەوتەکان
خوارو خێچیمان چاکەنەوە
ئێمە بارانبرەکانمان دەکوشت
پێمان وابوو کتێبەکانیان دەبردین
تا زیندووێتی خۆمان ببینین
بەڵام ئاخ لەگەڵ هەر بەردێکی
کە لە جەستەی ئەوانمان دەدا و دەمردین

## زرینگەی شووشەکانت

ژیان بە بێ هوودەییەوە جوانە
هەمیشە بەسەر لەپی پەنجەرەوە
وەك پارچە مەرجانێکی شکاو
سەیری ڕێبوارانی دەکرد
ڕێبوارێ خۆی و باوەشێ وەڕسی
ڕێبوارێ نوقمی ئەندێشەی فڕینێ
ڕێبوارێ تەنکە تەمێکی خەم
بەسەر گەڵایێ لە ماتەم دایگرتووە
ڕێبوارێ دوای تەڕبوون لە بارانی سارا
بالۆرەییێکی سپی لە دەمی قوڵینگ وەرگرتووە
وەك شێت دەیبەشێتەوە
وەك شەختە دەیبەستێ
ڕێبوارێ بە پەلە وادەزانی ژیان تەواو دەبی
ڕێبوارێ پێیوایە
ئەو نەمێنی ئیدی زەمان ڕادەوەستی
هەموو ئەو ڕێبوارانە بۆ شیری ژیان دەچن
ژیانیش خۆی و جانتای پڕ لە ئاڵۆزیی
ئەوانی لە دامێنێکی تژی نیگەرانی جێ هێشتووە

## لەبەر پەنجەرەوە

هەمیشە بەسەر لەپی پەنجەرەوە
جار جار پێکێ ئاودیو دەکا
جگەرەیێ دادەگیرسێنێ
یا لە کەناری پیرۆزەیی ڕووبارێکا
لە وێنەی دوێنێی رادەمێنی
شەراب دابەش دەکا
دەیدایە دەست ڕەشتاڵەیێکی ڕووتەڵە
کە ئاشقترین مرۆی دڵۆپەی مەی بوو
دەیگوت:
وەرە ئەی جوانترین دۆستی هەموو ڕۆژێم
ژیان بە بێهوودەییەوە جوانە
بینۆشە ئێمە سەفەریین
بەیانی کە هاتیتەوە لام
مشتێ مەرجانی قسەی خۆش و
قاپێ عەتری پێکەنینم بۆ بێنەوە
وێرانمکە لە ناو لەپی فڕیندا
بەیانی کە هاتیتەوە
چەمی چاوت بەسەر منا بەرهەڵلاکە
ئەی جوانترین هاودەمم
هێندە بەلەز چاوی عەشقت
بەسەر منەوە هەڵمەگرە
من بەو ڕوانینەی تۆوە دەژیم
باڵا دەگرم

## ڕابرد، وەرەوە

ها ئەوە نامبینی چۆن چۆنی دەفڕم
ژیان بە بێهوودەییەوە جوانە
دەنا لە سورفڵی ڕوومەتی کچێ دەچی
لە سەرە مەرگا گۆرانی بۆ عەشق بڵێ
ئەی دڵشکاوترین دڵ
چاوە خەمبارەکانت بەسەر من دامەخە

## خەیاڵ

دووبارە گۆرانییە خەمبارەکەی خۆی دەڵێتەوە :
ژیان تۆ ئەوەندە خێرا نیت
تا بەدواتا ڕابکەم
ئەوەندەش لەسەرخۆ نیت
تا بتوانم پێت ڕابگەم

## نووسراوی سەر قاپەکان

زینەتی مەیفرۆش جار جارە یادگارییەکانی خۆی
لەسەر کاغەزی قاپەکان دەنووسێتەوە:
یەکەم ڕۆژ کە تای عەشق وەك ئاگرێ گرتمی
وامزانی لە فڕینام
سەرێك چوومەوە ناو کۆڕی باڵندەکان
سەرێك چوومەوە ناو تاوڵی قەرەجەکان
بەرز دەبوومەوە بەرز
زەوی وەك تۆپێکی سپی
لەژێر باڵەکانما دەترووسکایەوە
دووبارە پێکی جارانی هەڵدەدایەوە
ژیان بە بێهوودەییەوە خۆشە
ئەگینا لە تەواوبوونی شووشەیێ شەڕاب دەچێ
کە مەیخۆرێکی سەد ساڵە
لە نیوە شەوێکی سەختدا لەبەری دەبڕێ

## بۆ ئەبەد

من بە تیشکی چاوەکانی تۆ
ژیان دەخەمە ناو قوتووی ئەبەدی
تووڕی هەڵدەدەمە دەریاو
سەیرکە ئەوانە چەند بە پەلەن
پێیان وایە ژیان تەواو دەبی
کە لەمێژە ئەوانی تەواو کردووە

## باخەوانەکان

1

باخەوانەکان لەگەڵ باخدا لە یەك تیرەن

بەڕەچەڵەك دەچنەوە سەر خوداوەند

کە دەمرن دەبنەوە درەخت

کە زیندوو دەبنەوە بە گیا دەست پێدەکەن

2

باخەوانەکان گیا لە ناو لەپیان دەڕسکێ

سینەیان تژی ئاقیقی ئەرخەوانە و

ئەوان بۆ هەمیشە تەنیان

تەنیاتر لە کەسێ پیاسە بکا

بە سەر گەڵا زەردەکانی باخی گوماندا

3

دوای کوژانەوە و سیس بوونیان

دوای نوقمبوون لە زێی پڕ لە ژەهری زەمان

هێلانەیان لەنێو پەلکی زەردی لەیمون بۆ دەکردین

پەیکەریان لە گیا بۆ دادەتاشین

4

جێی خۆیان لە دەفتەری چنار و

داسۆسی شکاوی منالیمان دەکردەوە

دەهاتنە سەر تاخچکە تاقبەرزەکانی

نارینی ناو دارستانان

بەسەر بالیفی گەڵا و چڵی پڕ لە شیری

ڕۆنیاس هەڵدەنیشتن

بەیەکەوە قەندی گوڵمان هەڵدەمژی

دەبووینە ماهوتی تابان

5

دەمێ پڕ لە چریکەی غوربەتمان بۆ هێناون لەسەر گەڵا
وێنەی ئێوەمان لەناو ئاوی قەزوانی شین شووشتۆتەوە
ئێمەین باخەوانی جوانی، لە بوخارا دەسکی شبیت و
لە هیندستان بۆن و بەرامەی بەهاراتمان هێناوە
هاتووینەوە قومێ ئاوی ترێی سەد ساڵەمان هێناوە
ئەستێرەیێ لە شەوبۆمان لە ئاسمانی نیپاڵ هێناوە
باڵمان پڕە لە تیشووی باران و گیانەفەرە
دڵمان پڕە لە باق و بریقی خۆخی شاران
زمانمان پڕە لە حەکایەتی گوڵە زیوان

6

باخەوانەکان لەپ لەپ
مسی ڕۆحیان دەتاوێننەوە و دەیکەن بە ئاو
ئاوێك لە گەوهەری جاویدانی
تك تك هەڵڕژێتە ناو درەختی هەتاو
بۆیە هەمیشە باخەوانەکان
بچووك دەبنەوە و لەنێو گیادا وندەبن
شەڕی ئەوان لەگەڵ سیسبوون و قەدەرە
شەڕی ئەوان لەگەڵ دیوارە بەرزەکانە
کە جوانی دەشارنەوە
تا دێ ئەوان بچووك دەبنەوەو دیوارەکان بەرز هەڵدەگەڕێن
تا دێ ئەوان ڕەنگی بنەوشە دەگرن و ئەوان کفنی گوناە
شوێنی باخەوانەکان لەدوا پەڕی دەفتەری جوانیدا
گوڵ دەگرێ

7

باخەوانەکان لە بینایی ڕوونی گیا

ڕوخساری خوداوەندیان دەدی

بەو زمانەش ڕۆحی سووکی ئاویان دەدوان

بەو زمانە بانگی مەلەکانیان دەکرد و

پەنجەرەکانیان بەسەر جوانییەکان دەکردەوە و

جامی تەمتوومانیان دەشکان

8

ئەو ڕۆژانەی بە دیار جۆگەلەوە سەیری

ئەو هەموو باخ و باخاتانەیان دەکرد

کە ڕۆژانە دەبوا کار بۆ جوانییان بکەن

جوانکردنی گەڵا چۆن بەسەر پۆپەوە ببریقێتەوە

جوانکردنی ئەندێشەی مرۆڤ چۆن شیرینی زەینیان

بەناو تولفە و چیمەنەکان دابەش بکا

9

تازە ئەستێرە بەدیار جەستەی ڕووتی نەمام

تای ئەڤینی دایگرتبوو

لەبیری چوو پەردەی تریفە ڕابدا

خۆی لەبەر ئاوێنە بادا

دەستی باخەوانی گرت و بەسەر جەستەی ڕووتی دادا

10

باخەوانەکان شەوانە بەسەر تاوێرەکانەوە ڕادەکشان

بەبۆنی مێخەك سەیری ئاسمانیان دەکرد و

بیریان لەوە دەکردەوە

چۆن بتوانن ئەو هەموو شیناییانە شۆدەنەوە و

هەڵاڵە پرژێنی کەن

سەیری هەورەکانیان دەکرد چۆن هەموویان کۆکەنەوە
ڕێ ڕێ ئەو درەختانە ئاو دەن
کە بەرچاوی پڕ کردبوون لە گێلاس
هەستی پڕ کردبوون
لە بۆنی پوونگ و شەباقەی گوڵی کێوی
11
جارجارە بۆنی لێلاق
هەموویانی دەبردەوە ناو باخەکانی منالّی
حەسرەتیان بۆ ئەوە دەخوارد
کە ئەو هەموو گێلاسانەیان دەوەراند
چۆن چۆنی بەسەر زەوی گلۆر دەبوونەوە
چۆن وەکو جەستەی مرۆڤ لەژێر پێکان دەپلیشانەوە
21
ئاخ ئەو باخەوانانە چەند ماندوو بوون
بیریان لەوە دەکردەوە ئاو بۆ تاقی ئاسمان بەرن
ئەو هەموو بۆشاییە دوورانە
بە کەوەر و چنار پڕ کەنەوە
چۆن ئەو هەموو بۆشاییە
لەژێر باڵی مەلەکان بکەن بە عەتر
شەوانە زەینیان پڕدەبوو لە ورشەی گەڵا و دەنگی مەل
دڵیان پڕ دەبوو لە خوڕەی ئاو و
لە خەمگینی تاوێرە بێدەنگەکانی ئەزەل
31
تا بەیانی بە پێوە ئەندێشەی کەونیان دەکرد
تا بەیانی با لێی دەدان و چەمی ئاو دەیشووشتنەوە
ورشەی زەنوێر و کەروێشکەی گیا مەستی دەکردن

14

باخەوانەکان ئەڤیندارترین مرۆڤی سەرزەوین

بە زمانی ئاو ئەوینیان لەگەڵ خۆڵ دەکرد

بە کێڵان تۆوی نەوەکانی خۆیان

لەناو ڕەحمی خۆڵ دادەنا

یەکەم نۆبەرەی هەموو باخەوانێك

بە سەوزی دەهاتە دونیا

15

کەس ئەوەندەی باخەوان لە زمانی مەعشوقی ئاگا

ئەوان بە هێمای دەست گەمە لەگەڵ

سینە و مەمی ئەو دەکەن

بە دڵۆپێ ئاو تووڕەبوونیان دەشۆنەوە

تەڵێ گیا دەکەن بە دیاری لە سینە و بەرۆکیان دەدەن

16

شەوان لەژێر تریفەی مانگ، بەدیار هێمنی ئاو کۆدەبنەوە

باس لە بۆن و بەرامەی شەوبۆ دەکەن چۆن چۆنی

ڕێبوارەکان مەست دەکەن و  تا بەیانی

لە ناو مینا ڕژاوەکان ئاگر دەگرن

هێندە بەدیار هەڵوەرینی گەڵا دەگرین

تا شەڵاڵی ماتەم دەبوون

17

ئەو باخەوانانە خەیاڵ و خۆڵ تێکەڵ بەیەك دەکەن

لەناو سەبەتەی تاباندا

زەوییان دەکردە حاجیلە و باوەشیان

پڕ دەبوو لە فریشتەی کاژ

ئاویان بۆ ئاسمان دەبرد و وردورد

هەریەکەو ڕستێ چەمکی لە چەشنی گروان
بەسەر ئەژنۆکان دادەنا، خەریکی گفتوگۆ دەبوون
18
باخەوانەکان کۆڵەباری خۆیان
بەسەر چڵ و پۆپی درەخت هەڵواسی
چووبوونەوە قووڵایی دارستان
بەدوای مەلی برووسك دەگەڕان
بەڵام هەرگیز نەدۆزرایەوە
19
باخەوانەکان مەیل و هەوەسیان ئاگری گرتبوو
ژنان لە خوا پاڕابوونەوە کە گیا بە باڵادا بچێ
کەس کەس نەبینێ
لە چاوەڕوانی ئەواندا، سەیری دوورترین سیوەیل بکەن
لە لیمۆ پاڕابوونەوە تۆزێ، لە ڕەنگی خۆیان کەم کەنەوە
تا لیمۆی باخەڵی ئەوان بدرەوشێتەوە
لە شۆڕەبی پاڕابوونەوە تۆزێ کەزی خۆی لوول بدا
تا کەزی ئەوان ببێتە سێدارەی ڕۆحی ئەوان
بەڵام باخەوانەکان بێهوودە چووبوونە هێلانەی هودهود
هەرگیز هەواڵی ژنەکانیان نەزانی
ئەوە نەبێ کۆمەڵە درەختێکی ڕووت
لە باخەکان زیاد بووبوو
20
باخەوانەکان شەو و ڕۆژ ئاگری بازوویان
بەسەر خۆڵدا دەگیرساند
لوولەی زەینیان بە زەیتوونی چیا پاك دەکردەوە
ئاوێنەی چاویان بە دەسماڵی نەرجیل دەسڕییەوە

داسی دەستیان بە بەڵاڵووك تیژ دەكردەوە
لوولاقیان بە رۆنی جەنجەفیل چەور دەكرد
باخەكانیش تا دەهات گەورەترو گەورەتر دەبوون
21
جار جار هەموو باخەوانەكان
بەیەكەوە سەیری مەملەكەتی خۆیان دەكرد
هەناسەی شادییان هەڵدەكێشا و
بەیەكەوە هاواریان دەكرد
ئای ئەوە تا دێت ئیمپراتۆریەتی قەدیفە فراوان دەبێ
تا دێت درەختەكان لقیان بە ئاسمان هەڵدەگەڕێ
تادێت ڕەگمان بە زەویدا دەچێتە قووڵایی
تا دێت هەرمێكان گەورە دەبن و دەبن بە شار
تا دێت فەرشی جۆلیا ڕووپەڕی زەمین دادەپۆشی
ئای باخەوانەكان چ خەونێكی خۆشیان دەدی
22
باخەوانەكان ئەو كاتە خەمگین دەبوون كە پاییز دەهات
تەرمی ئەو هەموو حاجیلانەیان دەبینی
سەرەوژێر دەبوونەوە قووڵایی
خەمگینی باخەوانەكان لەوە دابوو هەرگیز
لە گریان نەدەكەوتن
بێقەراری ئەوان لەوە دابوو
توانای ڕەشەبایان نەبوو
23
هەمیشە بیریان لەوە دەكردەوە، ئاسمان بكەن بە باخ
بەڵام لوولاقیان لە زەوی گیر ببوو
پێیان وابوو ئەو ڕەزانەی لە ساماڵی چێ دەكەن

وەکو بەهەشت جاویدانییە و دەستی وەرین نایانگاتێ
باخەوانەکان ئایدیاییێکی جوانیان هەبوو
لە باخەکان کورت دەبۆوە
ئەوان لە خەونیشدا هەر باسی باخیان دەکرد
24
باخ باخ باخ باخ
ناوی هەموو باخەکانی دنیایان دەزانی
هەموو باخەوانەکانیان دەناسی
ناویان لە هەموو درەختەکان نابوو
بە باخ ئاو و هەوایان شی دەکردەوە
ئای باخەوانەکان چ ئایدیاییێکی جوانیان هەبوو
25
ئەوان دەیانزانی نیوتن
لەناو رێگا باریك و توولی باخەکانەوە
سێوی کردە پاشای زەمین
دەیانزانی ئەگەر نێرگزەجاڕ نەبووا و
گاگرۆ چاوی هەڵنەهێنابا
زەوی لەبەر بۆنی شەڕەکان جێی مرۆڤی لێ نەدەبۆوە
دەیانزانی درەخت نەبێ ڕەشەبا هەنجن هەنجنیان دەکا
بۆیە هەمیشە نەخشەی زەوییان بە باخ دەپێوا
26
کە تەنها دەبوون بە باخ مەعشوقەکانی خۆیان دەلاواندەوە
باخێکت بۆ دەکەم گەڵا و گوڵی لە دارستانی چیایان دێنم
جۆگەڵەیێکت بۆ ڕادەکێشم ئاوی لە بنی دەریا بێت
فەرشێکت بۆ دەچنم دەزووی، لە لاولاوی بوخارا چنرابێ

27
دەیانزانی ئەگەر لالەنگی نەپەڕێتە ناو چاوی ڕووبار
دونیا تامی نامینێ و خوێی ژیان دەمانکوژی
هەر بۆیەش باخەوانەکان بە چاوی پەلکی گوێز
سەیری موعادەلەکانی ژیانیان دەکرد
28
باخەوانەکان ساڵانە یەکجار ڕەبازی شەڕاب دەبوون
هێند مەست دەبوون جیاوازییان
لە بەینی خۆیان و گێلاس نەدەکرد
لەو ئێوارەیە لە جەژنی ڕنینی ترێدا
هەموو ڕەزەوانەکانی دونیا کۆبوونەوە
لە هەر باخێ جۆرێ ترێیان ڕنی بوو
لە هەر وشێ جۆرێ تامیان هێنابوو
لە هەر تامێ جێ دەنووکی مەلەکانیان
بە ئارمووشی ئاڵ چنیبوو
شەرابێکیان لێ دروست کرد کە تەنها گۆرانی
فێری مرۆڤ بکا
29
لەو گۆرانییەی لەو شەوە باخەوانەکان دەیانچڕی
دەتگوت لە ئاسمان دێتە خوارەوە
پۆڵ پۆڵ فریشتە دەبارین
لە هەموو لایەکی سەرزەوی، ڕەوە ڕەوە ئەسپی شاخەکان
شەپۆل شەپۆل رووبارەکان، پۆڵ پۆڵ مەلەکان دەهاتن
جەژنی دامەزراندنی پایتەختی مەریەمە بوو

30

باخەوانەکان کە ئازیزێکیان لێ دەمرد
بە زمانی خوناوەی سەر پەلکی گیا شینیان دەگێڕا
بە گەڵای پانی ترنج فرمێسکیان پاك دەکردەوە
بە دەنگی نەرمی کوکوختی بالۆرەیان دەچڕی
کە تەرمی ئازیزی لە دەستچوویان بە خاك دەسپارد
سەرەتا بە خەنەی ئەرخەوان دەیانشووشتەوە
بە گەڵای پەمۆی زەوییە ئاسێکان کفنیان دەکرد
بە خوورەی ڕووبار ماڵاواییان لێ دەکرد و
بە گوڵە پوونگ دەیانڕشاند

31

کە پیرترین باخەوان ماڵاوایی کرد
چی دەمەشێر هەبوو هەموویان
لە پێشوازی تەرمی ئەوا هەڵڕشتبوو
باخەکانی باکووریان
بە بەفر و گریان و گوڵخەنەوە دەهێنا
دار سنەوبەرەکانیان تێگەیاندبوو بچەمێنەوە
ئاو ڕاوەستا و شنە هەڵیکرد مێخەك گریا
چی کەڵە گیا بوو لەبەر دەمیا چەمانەوە

32

باخەوانەکان لە پاییزدا ئەوەندەی
سەیری ڕووت و قووتی درەخت دەکەن
ئەوەندە سەیری ژنەکانیان ناکەن
ئەوەندە بەدیار قەدی درەختەکانەوە حەکایەت دەگێڕنەوە
ئەوەندە گۆرانی بۆ کۆرپەکانیان ناچڕن

33

ئەوان دەزانن چ مەلێ بە سەریان دەنیشێتەوە و
چ ئەڤینێ لە دڵیان دایە
دەزانن کەی با هەڵدەکا و
کەی قەدی گوڵە خەزێم خوێنی تیا دەگەڕێ

34

هەمیشە مشتێ گەنمیان لەناو لەپدایە
دەوروبەریان پڕ کۆترە
جگە لە کێڵگە و دێراو و قۆپەنی گیا
هیچ شتێکی دیکە نابینن
شەونم لە چاوەکانیان هەڵدەڕژێ و
بۆنی بەیبوونیان لە دەم دێ

35

بەدەم ڕۆخانەی رووبارەکانەوە
دێنە خوارەوە و گۆرانی دەڵێن:
خودایە پێمان بڵێ چۆن زەوی
لە چنوور نوقم کەین ئاسمان لە گیا
پێمان بڵێ چۆن نەمامەکان هەڵدەچن
چاومان پڕ دەکەن لە جوانی
پێمان بڵێ چۆن ئاوریشم گوڵ دەردەکا و با هەڵدەکا؟
پێمان بڵێ ئایا تۆ ڕۆحی لەناو ئەم خۆڵە تەڕە
یا بەرسیلەی ئێوارەکانی بناری
یا خوێنی لەنێو دەماری درەختەکان دێت و دەچی؟

36

ئێوارەیەکیان ئەو درەختەی هەزار ساڵ بوو
نەوە لەوە باخەوانەکان

لە ژێریا ئاهەنگی شەڕابیان دەگێڕا
کەوتە بەر تەوری زریانێ لە ناوقەدەوە بڕایەوە
باخەوانەکان حەوت شەو و حەوت ڕۆژ شینیان گێڕا
گریانی ئەوان گریانێ بوو
لە قووڵاییە دوورەکانەوە کوڵێك دەیهێنا
ئەو ناڵەیەی ئەوان سەریان دەدا
لە ئاسمانەوە دەهات و جاترە دەیپرژاند
هەموویان بەیەکەوە چوونە ناوقەدی درەخت و
بۆ ئەبەد نەگەڕانەوە
37
ئێستاش باخەوانەکان ساڵانە
دەچنەوە سەر ئەو درەختەی دەڵێی چیایە
نوێژی خوێن و فرمێسکاوی لێ دەبەستن
یادەوەرییەکانیان دەگێڕنەوە
لە دوورترین شوێنی دنیا باخەوانەکان دێن و
کتێبی خۆیان لەژێر ئەو درەختەدا
بە قەڵەمی ڕێحان دەنووسنەوە
ئاخر باخەوانەکان لە تەباری نەعناعن
بە ئەسڵ دەچنەوە سەر کاژ و لە تۆوی قاوەیی بەڕوون
38
ئەو کاتەی بایەکان دەسك دەسك
لە قەدی شاخ گیر بووبوون
خوڕڕەی ئاوی بنارەکان چووبوونەوە ماڵی شەپۆل
درەختەکان لە سەردانێکیان بۆ ناو ماڵی پاییز
تەنها چڵەکانیان جێهێشتبوو، مەلان ئارانیان تەنیبوو
باخەوانەکان بە مەلوولی کۆمەڵ کۆمەڵ

وەك ئەسپی سپی شاخەکان
بەسەر گردەکانەوە سەیری
لووتکە دوورەکانیان دەکرد
لەبیری ئەوەدا بوون
تەواوی ئەو لووتکانە بکەن بە چیمەن
ئەوسا جیهان وەك خەونێکی لێ دێ
شیرنتر لە قەندی ئەسفەهان
39
ئەوان دەیانویست وەکو دیواری چین
باخێ بە دەوری دنیا دروست کەن
نیرەمێ لەسەر زەوی ساز بکەن ماڵی مرۆڤ بێ
بەڵام ئاخ باخەوانەکان وردە وردە پیر دەبوون
چاویان کز دەبوو دەست و پلیان شەکەت
باڵایان دەچەمایەوە
ئەوان ڕۆژان هەر زوو خەوێکی قووڵ دایدەگرتن و
دنیا خاڵی دەبوو لە باخەوان
40
باخەوانەکان هەمیشە خەریکی جوانکردنی زەوی بوون
ئێمەش هەمیشە تیغێکمان لە نێو پەنجە حەشاردابوو
بۆ هەر لەپێ لە ئەڤینیان مشتێ تووڕەییمان پێ بوو
بۆ هەر دەمێ پڕ لە نەوایان قومێ
ئاوی ژەهراویمان پێ بوو
41
ئێستا بەدوای ئەو باخەوانانە دەگەڕێین
پاکمان کەنەوە لە گوناح
بەڵام ئاخ ئەوان وەکو ئاسك وان

ناچنەوە ئەو ڕووبارانەی تیریان بەسەردا باریوە
دەچینەوە ژێر ئەو درەختانەی چاندوویانە
خواروخێچیمان ڕاست کەنەوە
بەڵام ئاخ ئەو درەختانە گەوھەری
سێبەری خۆیان شاردۆتەوە
42
باخەوانەکانمان دەکوشت پێمانوابوو
کتێبی زەوییان دەبردین
بەڵام ئاخ لەگەڵ ھەر تیغێکی
لە قەدی درەختمان دەدا دەمردین
وای ژیان بەبێ باخەوانەکانی جوانی چەند تەنگە

## وەك ئاوێكی تەنك سادە

1

عاشقەكان دڵیان ڕێك وەك شووشە وایە

كە شكا یەك ناگرێتەوە

2

تۆ زۆر لە پرووشەی بەفر دەچیت

كە دەباریت سپی سپی دەچیتەوە

كە دەتوێیتەوە دەبیت بە ئاو

كە بوویت بە ئاو

چاوەڕوانی شەوقی مانگ دەكەیت لێت بدا و

بگەڕێیتەوە ناو دڵی گەرمی هەتاو

3

ئەوەندە ئاشكرای هەر دەڵێی ڕۆژی

لێت نزیك ببمەوە دەسووتێم

كە دوور دەكەومەوە دەخنكێم

لە نێوان خنكان و سووتان

چی بكەم باشە ؟

4

تۆ خۆرێكی هێجگار گەشی

منیش چاوێكی هێجگار كز

5

تۆ لە شینایی گەڵا دەچیت، كە هەڵدەوەرێیت

ورد ورد شۆڕدەبیتەوە ناو زەوی

دەچیتە بەر زیوی تابان

كە خاك و خۆڵ لوولت دەدا

چاوەڕوانی بایێ دەكەیت بمانباتەوە بۆ ئاسمان

6

ئەو کاتەی تۆ لە دەمارەکانی خوێنم

کوورەی ئاگر دەکەیتەوە

من وەکو بەفرێکی تەنك دەتوێمەوە

کاتێکیش کە خامۆش دەبی

من وەك ئاگر دادەگیرسێم

7

من و تۆ دوو هاوڕێی جیاوازین

کە تۆ لە بەرزی ئاسمان بیت

من لە قووڵایی زەویم

کە تۆ دەکەویە بەرزایی

من پابەندم بە نزمایی

من و تۆ دوو هاوڕێی مەحاڵین

8

جیاوازی من و تۆ وەك جۆگەلە و دەریا وایە

تۆ بە من گەورە دەبی و

منیش بە تۆوە ون دەبم

9

جەستەی تۆ وەك تەمێکی تەنك وایە

لەدوور دوورەوە

لە نێو درەختی خوێن و ئێسقانت دڵت دەبینم

ئاخ دڵی تۆش وەك ڕۆحی من

لە هەزار شوێندا شکاوە

10

من و تۆ دوو قەفتەی خەنجەرین

بەسەر یەکا هەڵکێشراوین

من و تۆ دوو خوێنی ڕژاوین
بە ناو یەکترا پژاوین
11
تۆ دۆستێکی سەختەندازی
بۆوەی بە باڵات هەڵگەڕێم
پێویستم بە تەمەن هەیە
تەمەنێ درێژتر لە سەدە
12
من و تۆ پەڵە هەورێکی سپی هاوینانین
بە حەسرەتی بارین دەسووتێین
13
تۆ ئەگەر چی لەمێژە لە من ئاوابووی
بەڵام من هەمیشە سپێدان
لەناو زەنوێرە دوورەکان
بۆ تۆ گزنگ دەدەم
14
چیرۆکی ئەڤینی من لەگەڵ تۆدا
گوزارشت لە مەحاڵ دەکا
کە پێت دەگەم دەکوژێیتەوە
کە لێت دوور بم دادەگیرسێی
15
نهێنی تۆم لە دڵما کوشت، تا ئاشکرایی نەبینێ
وامدەزانی شەوقێ لە تۆ خامۆش دەکا
یا مینایێک لە هەیبەتی تۆ دەشکێنێ
یا خوڕڕەیێک لە ڕووبارتا شێلوو دەکا
یا دانەیێک مرواری ڕوحت دەشکێنێ

16

من و تۆ لە وەتەی هەین کتێبێ دەخوێنینەوە

یەکەم پەڕەی ئەوینە و

کۆتاییشی سووتان و برینە

17

لە پەنا پارچە مانگێکی تازە شکاوا

وەك پەڕی تاووس

کە تازە تازە وەریبێ

یا وەك دڵۆپە خوێنێ

لە تەوێڵی ئاسك پەڕیبێ

ئاوا لە بەرزاییێکی دوور دوور

بەرەو بناران دەچمەوە

18

تۆ کێشەییێکی ئاڵۆزی

کە دەتگرم رەها دەبی

ڕەهات دەکەم لە ڕۆحم گیر دەبی

19

ئێمە یەك قومە ئاوی ئەوینمان خواردەوە

یەك دەریا فرمێسکمان هەڵڕشت

20

تۆ چەند دووری

ئەی دڵۆپەی خوێنی باران

کەچی هەموو سپێدەیێك

کە لە خەو ڕادەبم

لە سینەما دێیتە خوارەوە

دەچیتەوە شوێنی جاران

## جانتا

1

من هەمیشە خەون بە جانتای سەفەر دەبینم

سەفەری دوور هێجگار دوور

2

دەمەوێ دەریا ببینم

دەمەوێ بچمە لای تبت سەرێ لە دەلایلاما بدەم

بچم لە ناو دڵی کەشمیر تۆزێ لە سەر پشت ڕاکشێم

لە مۆزەخانەی میلانۆ سیمای دانتی بەدی بکەم

دەڵێن ئێستاش چاوەڕوانە بیاتریس بگەڕێتەوە

3

ڤینیس پڕە لە بازرگان

بەڵام تەنها من یەك بازرگان دەناسم

کە شکسپیر بۆ تاهەتا لە ناو جانتای زەینی ناوە

4

ئەو جانتایەی من دەمەوێ پڕ کتێبە

لەوەتەی هەم کتێبەکان دەکەمەوە

ئەو جانتایە دەڵێی بنی لە دەریایە

قەتاوقەت کۆتایی نایە

5

یەکەم جانتا بینیبێتم جانتایێکی عوسمانی بوو

لە دەستی کابرایێکی باڵا بەرزی دەرسیمی

کۆڵان بە کۆڵان دەگەڕا

منداڵانی شارەکەمی سوننەت دەکرد

ئێستاش هەر جانتایێ کە دەبینم

بۆنی سپرتۆ دەکەم

6

بیرمە یەکەم جار کە چوومە قوتابخانە

دایکم جانتایێکی لە پەڕۆ بۆ دروست کردم

کە بە ملم هەڵدەواسی دەتگوت کۆتە

لەو ڕۆژەوە تاکو ئێستا هەر فلیمێ

پەتی سێدارەی تێدابێ

جانتای پەڕۆم بیردێتەوە

7

زۆر جار کە لەژێر ئاسمانی پڕ ئەستێرە ڕادەکشێم

بیر دەکەمەوە جانتایێکی گەورەم هەبێ

بەقەد داد و خۆزگە و بریا

هەرچی گوللە و شەڕ و زوڵم و زۆری هەیە

هەمووی لەو جانتایە بکەم تووڕی هەڵدەمە ناو دەریا

8

گوڵفرۆشێکم بینی عەتاری دەکرد لە شاران

ڕۆژێ ڕێی کەوتە بەرماڵێ

کاتێ کە جانتای کردەوە

دەتگوت عەتری لێ دەبارێ

شووشه عەتری ئاوای پێ بوو بۆنی دەگەیشتە ئاسمان
ئێستاش کاتێ کە دەچمەوە شوێنی جاران
بۆنی ئەو عەترە هەر ماوە

9

یەکەم جانتا کە بەشانی خۆم دادابێ
ئەو کاتە بوو کە بە قیتار چووم بۆ بەغدا
یەکەم کتاب کە لە ناو جانتام دانابێ
کتێبی ئیسماعیل نامە بوو

10

لە ناوەندی قەیسەری هەولێر
دوو کەسم دی بەشەڕ هاتن،بەجانتا لە یەکتریان دەدا

11

یەکەم شەڕ لەسەر جانتای دەسەڵات بوو
دووەم شەڕ لەسەر جانتای پارە بوو
سێهەم شەڕ لەسەر حیسابی جانتای
مناڵانی قوتابخانە بوو

12

مامۆستا هەمیشە دەیگوت
ئەگەر شتێکتان دۆزییەوە بیدەنەوە بە خاوەنی
بەڵام من جانتایێکم دۆزییەوە ڕوبعێکی تیا بوو
سێ دەبدەبە و قەڵەمێك و
سەموونێکی عەسکەریم پێ کڕی

13

لە لای ئاوباری مەولەوی تەنزیلات فرۆشێ هەبوو
هەمیشە دوو جانتای پێ بوو
پێیان دەگوت عومەر جانتا

14

حەمە شێت پیاوێکی ڕیش سپی نوورانی بوو
کە دەگەیشتە دوکانی ئاسن و تەنەکەی شار
دەوەستا و سەیری دەکردن
بەڵام کە دەگەیشتە دوکانی جانتافرۆشان
ئاوڕی لە دواوە دەدایەوە و لەبەرخۆ قسەی دەکرد

## پەلکی ناو قەدی کتێبان

1

هەمیشە درەختێ هەیە لە تەباری خوداکانە
درەختێ لەو درەختانە دڵنیام دەچێتەوە لای لەو
ئەوێك جارێ لە تەمتووماندا ون دەبێ و
جەستەی دەبێتە بریقە
جارێکیش شەلاڵی باران
ڕوخساری دەبێ بە بەفر
جارێ لە با بەسەر زەویدا هەڵدەکا
جارێ بە شۆق دونیا پڕ لە سەفا دەکا

2

هەمیشە ڕێگەیێ هەیە بە ڕەگەز دەچێتەوە سەر ئاو
ڕێگایێ لەم ڕێگایانە
دەمباتەوە ئەو گردانەی منارەکانی لێ دیارە
ئەو منارانەی دەڵێی درەختی ئەزەلین
هەمیشە سەوز دەبنەوە
هەندێ جاریش دەڵێی ئاشقی ئەبەدین
بەرەو ماڵی دڵ دەچنەوە

3

هەمیشە دەرگایێ هەیە بە سەر جوانی دەبێتەوە
دەرگایێ لەم دەرگایانە
دەمباتەوە بۆ لای قەڵا دێرینەکان
کە هێشتا دەسخەتی لێمەی بە سەریانەوە دیارە
ژەنگی ڕۆژگار هێندێ پیتی لێ بڕیون
پرۆمیتۆسیش ئاگری مانای بەهاداری لێ دزیون

4

هەمیشە نووریٚ هەیە بە ئەسڵ سەر بە پیاتریسە
نووریٚ هەیە لەم نوورانە دەمانباتەوە بۆ ئاسمان

بەدوای مەلیٚ دادەچێتن
ئەندێشەی سەفەری دووری لە بن پەڕ و باڵیدایە
بەدوای پووشی خۆی دەگەڕیٚ
کە لە باخێکی دوور دووری لانەکەی خۆیدا هێناوە
وا گوێم لە چریکە و دادیەتی
بەدەست ئەم هەموو ڕێگایە

5

هەمیشە ناڵەیێ هەیە واگامان دەهێنێتەوە
هەستم جامیٚ دەزرینگێنیٚ لە ڕەچەڵەکی شەڕابە
شەڕابیٚ تك تك هەڵدەڕژیٚ
لە گۆرانی نەواهێنی ئاشقەکانە
شەڕابیٚ لەپ لەپ دەتکیٚ
لە نووسراوی سەر دیوارە کۆنەکانی لەویندااران
کە دڵێك و سیٚ چوار تیری لەژێردایە

6

هەمیشە بناریٚ هەیە پەناگەی ئاشقان بووە
بناریٚ لەو بنارانە تازە مانگ تیشکی دەدایێ
دوو ئاشقی سەمەرقەندی هەر وەکو مار تێك ئاڵا بوون
ئەستێرە و مەل بەسەر سەریانا هەڵدەڕژان
تریفەی مانگ ببووە تەیمانی چوار دەوریان
خواوەند بەسەر سەریانەوە وەستابوو
چاوەڕوانی نەخشەی هەزار ڕەنگی دەکرد

7

هەمیشە خەڵوەتێ هەیە جێی کەفناری شاعیرانە

خەڵوەتێ لەم خەڵوەتانە ناڵەیێکی کزی دەهات

ناڵەی دەروونی کەسێ بوو دەبوو بە باشووکەی زوخاڵ

قسەی لەگەڵ ڕۆحی خەمباری خۆی دەکرد

8

هەمیشە پەڵە گیایێ هەیە لەژێر بەردەکان شین دەبێ

پەڵە گیایێ هی هەموو بارانێ نییە

قەت کزەیێ نایگرێتەوە

بەڵام کە بایێ بۆ تاقە جارێ بەسەریا دەڕژێ

چەند دڵۆپێکی بارانی عەتری وای پێ دەبەخشێ

ئاڵترین خوێن و

خۆشترین بۆن و

جوانترین سیمای لە ڕوو دەنەخشێ

9

هەمیشە ڕێحانێ هەیە بۆنی لە هەمووان خۆشترە

ڕێحانێ لەو ڕێحانانە بە بنەچەك هی عەتارێکە

لە سەد پوونگی ژێر دەریادا

یەك دڵۆپ عەتری ساز دەکرد، لە سەد جامی شەڕابی کۆن

یەك دڵۆپ بادەی دەنۆشی، لە سەد شووشەی دڵی شکاو

یەك پەلکە شەوبۆی بۆن دەکرد

10

جوانێ هەیە باوەشێ مەستی و سەفەرە

دەستم نایە ناو پرچی گوڵە پەمۆیێ

وتی مەڕۆ با شەکری دەم بتوێتەوە

جوانێ باوەشێ لاسکە گەنم و سێ چوار دەنکە هەنارە
هەندێ ورشەی گەڵاو گۆڵمەزێ عەنبەرە
لەپێ ئاوی کانی و
سێ چوار قسەی خۆش و دەمێك خەوتنی زمانە
شووشەیێکی شکاوی
ژێر هەتاوی دوای بارانە

11

هەمیشە ئەوینێ هەیە ئاگر
ئەو ڕۆژە دڵی وەك دەرگای ئاسمانی شین کرایەوە
ئەوین وەك نەوای نەی هەڵدەڕژایە ناو بناران
شمشێرەکان پارچە چارچە دەتوانەوە
سەر لەنوو گیا شین بوونەوە
دونیا بوو بە قاقەزی سپی
هەموو بۆ لای گوڵ چوونەوە

12

کەنارێ هەیە خەمگینیمان دەشواتەوە
ڕۆژ نییە ڕووبار داخی دڵی خۆی نەدا بە کەنار
بۆیە هەمیشە کەنار خەمگینە
ڕۆژ نییە کەنار جامێ تووڕەیی نەدا بە ڕووبار
بۆیە هەمیشە هەر شەپۆل دەدا
هەموو ئاوەکان دەڕژێنە ڕووبار
ڕووباریش ناچار
هەموو خەمی خۆی دەدا بە کەنار

13

هەر لە سەردەمی دروست بوونەوە
شتێ لە سینەی شاعیر ون بووە
جار جار وەك تیشكێ
دێتە بەر چاوی ون دەبێتەوە
بۆیە هەر جارەی شتێ لە جەستەی ئەم ون بووەدا
دەكاتە بەری شیعرەكانی خۆی
پاشان دەزانێ كەوا هەر خۆیتی لە خۆی ون بووە

## گوڵفرۆشەکان

1

پریاسکەی تاتارن لە سێو و لاسکەی گیا

پەیکێکن لە پاکی  و نوورێکن لە ڕوخساری ڕەها

گوڵفرۆشەکانی سەرزەمین هەمیشە تەنیان و هەر تەنیا

2

کۆمەڵە ئەسپێکی کەرەندین لە ڕمی سواران ترازاون

ڕەوە ئاسکی سپین لە داوی ڕاوچییان پەڕیون

لە پەڕیان غوربەت و

لە بڕیان جوانی و

لە شاخیان ئاسەواری جەنگی  سەد ساڵی جودایی

3

شەو دادێ هەموویان دەچنەوە بناران

لە ژێر تریفەی سەد ڕەنگی مانگە شەو

باقەیێ دەچنن و بە دەوریا دەسووڕێن

تا بەیان دەگرییێن

4

نیشتمان بوو بە ئاو

کووچەو کۆڵانەکان خاڵی بوون لە بەیبوون

ئاگری ناو دڵی کچانی گوڵفرۆش لە ئەوین دامرکان

سپێدە بێدەنگ بوو

هەر بۆیە باخەکان پڕ شمشێری جەنگ بوون

5

خودایە باوەشم هەر پڕبێ لە گوڵی ئاشقان

خودایە ئەو دڵەم هەڕ پڕبێ لە تەونی ئەوین و

سەریشم هەر پڕبێ لە خونچەی نێو بەفر
ناولەپم لە گیا
6
پێکەوە ڕێمان گرت ڕووناکیمان گوڵ بوو
پێکەوە چووینەوە بناران فەرشی ڕێ تاوێری چیا بوو
چووینەوە ئەو شوێنەی پەلکە گیا هەر مابوو
شوێن پێی گوڵفرۆش بوو لە سەر بەرد نەخشابوو
خودایە ئەم شوێنە جێ پێی کام شاجوانی دونیا بووم؟
7
ئەوانە لە دەماری گیا و لە خوێنی ڕێواسن
لە جەستەی شەونم و لە هۆزی ئەرخەوانن
ئەوانە نە باوەڕیان هەیە بە سنوور
نە کەس بە خێڵ و هۆز دەناسن
هەیانە و نییانە بەرداخێ مەستییە لەم ژیانە
8
گوڵفرۆشێ دەناسم لە قەفقاس هاتووە
یەکێکیان چاوێکی لە گوڵی پەمۆیە
یەکێکیان دەناسم خوێنی جەستەی عەترە
یەکێکیان تا ئێستا پەنجەکانی لەناو باخەکان جێمایە
هەموو گوڵفرۆشێ ڕەگێکی لە گیا هەر هەیە و
دڵۆپێ لە خوێنی هەڵاڵەی تێدایە
9
هەمیشە لە پاوانەکان دەگەڕێن کە تاکە نیشتمانیانە
ناوی هەموو گوڵەکانی دونیا دەزانن
ئاوی زێ بۆ ناو دۆڵ و چیا دەبەنەوە
لە ڕۆژە باراناوییەکان چەتریان چەپکێ شلێرە

لە تاریکی شەباقە دەکەن بە چرا
لە لافاودا حاجیلە دەکەن بە بەربەست
لە بەفردا خۆیان بە هاڵاوی گوڵە بادەم
گەرم دەکەنەوە
10
ئەوەندەی گوڵفرۆشان لە مانای گیا نازانێ
پێیان وایە هەر بۆن و بەرامەیێکی
ناو ئەو دەشت و بنارانە
ڕەگەزی جەستەی کچێکە لە تای ئەوین و چڕیندا
یا تکاوەی ئاه و ناڵەی عاشقێکە
لە مانگە شەوی سووتان و هەڵپڕووکان لە فڕیندا

## سپی هەمیشە سپی

گیا بۆی گێڕامەوە چۆن سیس بوو
هەموو سپێداتێکی سپی
شاعیرێکی سپی
بە جلێکی سپی
بە دڵێکی سپی
بە کاسکێتێکی سپی
ڕوو لە باکوور بە تەك بازاڕە سپییەکەی چراغ
کە وەك هەورێکی سپی
بەسەر سەدەیەك لە کفنی سپی قیت بۆتەوە
لە تەنیشت فانیلە سپییە هەڵواسراوەکانی
سەر پەرژینی سپی چوار دەوری باغی شار
لەلای ناڵە دڵ سپییە خەمبارەکانی سەر شەقام
وەك کۆترێکی سپی دادەبەزێ
سەیری پاسە سپییەکە دەکا و
هەندێ خەمی سپی و
چەند ڕستەیێ شیعری سپی
ئەنگوستیلەیێکی نقێم سپی
پریاسکەیێ کاغەزی سپی هەڵگرتووە
بەرەو باکوور، باکووری سپی شۆڕ دەبێتەوە
ئاورێکی سپی سپی بەملاو بەملادا دەداتەوە
تۆزێ لە تەك ئاوبارە سپییەکەی قشڵەی کۆن ڕادەوەستێ
هەندێ سەیری هێلانە چۆلە سپییەکەی

لەقلەقە سپییەکەی خانەقا دەکا
هەناسەییێکی ساردی سپی هەڵدەکێشێ
جگەرەییێکی فلتەر سپی دادەگیرسێنێ
ئەوسا خۆی و هەموو سپییەکانی
سپییە سپی سپییەکانی
خۆی و تۆپە ڕیشێکی ڕەش
ڕوو لە باشوور دەکاتەوە باشووری ڕەش
دەگەڕێتەوە بۆ ماڵ، ماڵێك لە خەمێکی رەش
ماڵێك لە شەوێکی ڕەش
ماڵێك لە خەوێکی پڕ خەونی ڕەش
گەڵا بۆی گێڕامەوە چۆن سیس بوو

## باز

### ڕەگەزی باز

بەفر و باران و درەخت و تەمتوومانە
ڕەگەزی باز، هەندێ جار دەڵێی لە بایە
هەندێ جاریش لە بروسك
هەر شتێ بەرز بنوێنێ
ڕەگەزی باز، ئەلەوێدا سەر دەردێنێ

### سەحەرەکانی باز

بیر لەو هەموو ساتانە دەکاتەوە
چەند سەختەندازی بڕیوە
بیر لەو ئاسکانە دەکاتەوە
کە بە شاخەوە هەڵدێران
ڕامانێکی قووڵ دایدەگرێ
گوێبیستی ناخی خۆی دەبێ
لە شەقەی باڵ دەداو دەفڕێ

### فڕینەکانی باز

ئاسمان، بەشی مەودای باڵەکانی ناکا
لەوەوە دێت
کە ئەو دەیەوێ هەمیشە بەرز بفڕێ
بیر لەو ترۆپکانە دەکاتەوە

دیارن و دیارنین
بیر لەو ڕووبارانە دەکاتەوە
کە بەسەریانا ڕەت نەبووە
بیر لەو بارانانە دەکاتەوە
کە جەستەیان نەشووشتووە
باز کە دەفڕێ، ئەوساکە زەوی دەناسێ

سەفەرەکانی باز

کەس نازانێ، سەفەری باز بۆ کام لایە
بۆ کام کێلگەی هەورو بایە
سەفەری باز، هەمیشە بۆ نادیارییە

بەرزبوونەوەکانی باز

کە تێکەڵی هەور دەبێ
جەستەی دەبێتە چلوورە
کە تێکەڵی باران دەبێ
ئەوسا پەڕوپۆ دەردەکا
کە تێکەڵی بەفر دەبێ هاڵەکۆکێکی سپییە
کە تێکەڵی چیا دەبێ
دەبێتەوە بازی جاران
کاتێك قاچی، دەکەوێتەوە سەر زەوی
کۆتایی دێ

### سەراوەکانی باز

کە دەچێتەوە دەبێ بە کۆمەڵە تیشکێ
هەر تیشکێکی ڕەوە مەلێ
کە باز دەچێتە سەراوەکان
جگە لە جوانی هیچی دیکە نییە

### بێچووەکانی باز

باز لە پەنا هەر هەورێ، هێلکەییێکی داناوە
لەژێر هەر پەڵە بارانێ، نەوەیەکی شاردۆتەوە
باز لە پەنا هەر کەڤرێکا، بێچوەکی دروستکردووە
باز لەبن هەر رەوەزێ، پەڕێکی جێ هێشتووە
باز لە نەوەیەکە بڕانەوەی بۆ نییە

### خەمەکانی باز

گەورە خەمی باز ئەوەیە
لە بەرزەفڕینی خۆیا، هەرگیز تەواری لا نییە
چونکە بەرزەفڕی، پێویستی بە تەنهاییە

## نهێنییەکانی باز

نهێنییەکانی باز ئاشکران
بە قەد دەریاکان گەورەیە، کە لە چاو ون دەبێ
ئاشکراییەکانی باز نهێنین
نهێنییەکانی باز، وەك دەفتەری سیحر وایە
کە دەیکەیتەوە باڵ دەگرێ

## تەنهاییەکانی باز

تەنهایی باز لەوەوە دێت
کە ناگاتە دیوە دوورەکانی ئاسمان
لەوەوە دێت جارێکی دی، نەگەڕێتەوە سەر زەوی

لەوەوە دێت کەون بەشی باڵەکانی ناکات
تەنهایی باز کوشندەیە
کە کەسێ وەك خۆی نابینێ
بەو تەنهاییەشەوەیە کە باز، بازە

## گریانەکانی باز

باز لە هێلانەیا دەگریێ
باز کە بەسەر ترۆپکەوەیە دەگریێ
باز کە بە سەراوەکانەوەیە دەگریێ
کە پێی دەگاتە سەر زەوی دەگریێ
هەر کاتێ باز باڵی لە شەقین بکەوێ
گریانی کەون دادەگرێ

### مەعشوقەکانی باز

ئەو رۆژە کە مەعشوقەکانی خۆی
بردە سەفەری بەرزەفڕی
هەموو لە خۆرەتاو سووتان
مەعشووقەکانی باز، باران بوون چوونەوە هەور
مەعشووقەکانی باز، باخچە بوون چوونەوە دارستان
مەعشووقەکانی باز، وێنە بوون چوونەوە ئاوێنە
باز ئێستاکە تەنهاترین عاشقە

### یاداشتەکانی باز

یاداشتی باز بریتی بوو، لە تیشکی چاو
بەسەر زنیە زیوەکان
لەو ڕۆژەوەیە ئەم کەونە
شەوق و شەباقەی ئەزەلە
تاریکی تیادا نەماوە
یاداشتی باز ئاگرێکی ئەزەلییە
لە شریخەی باڵەکانیدا هەڵدەچێ

### پاییزەکانی باز

پاییزی باز، کە بەهار دێ دەست پێدەکا
کە بەهار دێ، گەڵای ڕۆحی ئەو دەوەرێ
چونکە لە بەهاردا، سەفەرە دوورەکانی خۆی دەکاو
ناتوانێ تێری چەمەن بێ

### ڕەنگەکانی باز

که دەچێتە ناو دڵی خۆر
ئەوسا دەبێتە باخچەی ڕەنگ
باز که لە چاوان ون دەبێ
ئەوسا دەبێتەوە شەبەنگ
باز تەنها لە بەرزیدا ڕەنگی هەیە
ئەو کاتەش دونیا خاڵی دەبێ لە ڕەنگ

### بارانەکانی باز

بازی بازان، تەنها دوو باران دەناسێ
بارانێ لە پیری
که چاوی پڕ شەوق‌و گەشی ئەو تەڕ دەکا
بارانێ لە بەرزی، که باڵی شەلاڵی فڕین دەبێ
سەردانی ئاوێنەی خوا دەکا

### سووتانەکانی باز

ئاوازی لە باران، دەنووکی لە زێڕی خۆرەتاو
دووباڵی، لە زیوینی چیاو هەبوونی لە ترۆپك
ئەو شەوە خەمێکی کوشندە، فڕینی دەسووتان
ناڵەیێکی سەردا وەك ناڵەی نەوای نەی
وەك باخی نقووم بوو لە پاییز

ئەو شەوە مانگ ڕما
باز فڕی.. هەر فڕیو هەر فڕی
تا گەیشتە سکڵی خۆرەتاو
لەو سەرەوە
خۆڵەمێشی گەرمی بازی من هاتەوە
زیندووتر لە باخی جاویدان

### ئێوارەکانی باز

باز سپێدەکانی خۆی سپاردە گیا
لە ئێوارەکاندا چاوە گەشەکانی دەکاتەوە
باز سپێدەکانی داوە بە شەهێن
لە ئێوارەکاندا دڵی دەکاتەوە
باز سپێدەکانی خۆی داوە بە چیا
لە ئێوارەکاندا دڵی دەکاتەوە
هەڵدەفڕێتو گیانمان پڕ لە حەنین دەکا

### تووڕەییەکانی باز

باز لە تووڕەبووندا
دەکەوێ و هێزی باڵەکانی دەشکێ
باز لە تووڕەبووندا
چاوە گەشەکانی کز دەبێ
باز لە تووڕەبووندا، بەرزایی لەبیر دەچێ
باز لە تووڕەبووندا ترس دایدەگرێ
باز تەنها بە ڕامانەوە بازە
دەتوانێ بەرز بفڕێ

## کەوتنەکانی باز

کە بوومەلەرزە لوتکەکان ڕادەماڵێ، باز دەکەوێ
ترۆپك و پاڵ ئازیزترین کتێبی بازە
کە لافاو دارستانەکان دادەپۆشێ، باز دەکەوێ
درەخت خۆشترین ماڵی بازە
کە زریان دامێن دادەگرێ، باز دەکەوێ
باز بە دامێنەوە جیاوازی
لە بەرزی و نزمی خۆی دەکا

## غەریبییەکانی باز

ئێوارە بوو باز هەڵفڕی
ئەوە دوا فڕینی بازم بوو
دوا گەشتی بۆ ڕامان
باز لە تاقی دووری ئاسمان
ناکاو زەوی بیر کەوتەوە
لانەو ترۆپکی هاتەوە یاد
هێندە بەرز بووبۆوە
ئەندێشەی زەوی بۆ نەدەکرا
غەریبییەك دایگرت
هێندەی دی بەرزی ئاسمانەکانی کردەوە

## باڵەکانی باز

پەڕی باڵەکانی ئەو بازە
هەندێ لە دەریاو
هەندێکیشیان لە بنی قەڵادا ڕسکاون
لەبای تووش و وەیشوومەی ئاسمانان
بڕستی ئەبەدو ئەزەلیان گرتووە
هەر بۆیەش باز نییە، لە زەوی کەوتبێ
یەکە یەکەیان لە ئاسمان مردووە

## ئەشقێنی باز

دەنووکیان تێکەڵی مەی دەکەن
شاباڵیان لە خەنەی ناوماڵی
ئەرخەوان سووردەکەن
خۆیان بۆ ماچ و مووچ
ئامادەی فڕینی ئەبەدیی، دوور دەکەن

## خەڵوەتەکانی باز

کە بازی ناو بازان
ئێوارە دەسپێرێتە باڵ و شەوانە دێتەوە
دەفتەری کرێشمەو ڕامانی خۆی دەکاتەوە
بە دوای دوورترین شوێن دەگەڕێ
کە هەیەو نایگاتێ
بە دوای کپترین یاڵ دەگەڕێ و دیار نییە
بە دوای توندترین با دەگەڕێ
تێکەڵی ببێت و نایبینێ

کە چاو لە ڕامانی زۆر قووڵی بەردەدا
سپێدە گەیشتۆتە سەرشان و لاباڵی
دووبارە لە شەقەی باڵ دەدا

گۆرانییەکانی باز

باز بە باڵ گۆرانی خۆی دەچڕێ
لە کاتی چڕینا باڵ دەگرێ
تا دەگاتە خۆرو ئاگری ئەزەلی خۆی دەگرێ
تا ئەبەد دەبێتە فەنەرو شەوق و نوور
لە شەوی بەفراوی، ناو فەزای بێ سنوور

زیندانەکانی باز

گەورەترین زیندانی بازان
ئەو ڕێیانەن ئاسمانیان، بە ئاستەم دیارە
ئەو شەوانەن، سپێدەیان بەسەرا نایێ
گەورەترین زیندانی بازان
ئەو نیشتنەوە بێ ئاکامانەن
فڕینیان بەدواوە نایێ

## وەسیەتەکانی باز

پیری هات ئیتر باز پەڕپەڕی باڵانی
بە دەستی زریانێ خستەوە کاڵانێ
بە باران دوا وەسیەت
دوا قسەی بۆ تەوار ناردەوە
ئەوە بوو:
مەنیشن لە نیشتن، لوتکە ڕێزتان ناگرێ
چون ژیان هەر بە فڕینەوە جوانە

## کتێبەکان

### کتێبی ئاو

لە ناوەندی زێ و زێباری خاکی شکاو
پەیکەرێکم بۆ باران، لە گیا دروست کرد
بەدیارییەوە هاوارم کرد، ئەی ئاو ئەی ئاو
تۆ ڕەمزی حیکمەت و پیرۆزەی ئاسمانی
کەچی ئێمە دەتخوێنەوە
بێباکانە چڵکی دەروونمان
بە پاکترین دڵۆپی تۆ دەشۆینەوە

### کتێبی فیراق

قامیشەڵانێکی سەوزی تەژی نەوا
لە غەریبستانێکی دوورو گریانبارا
هەمیشە لەبەربا پەڕپەڕ دەبێ
هەر پەڕێکی، دەچێتەوە نیشتمانێ
هەرحەرفێکی، گریەی ناو سینەی ئینسانێ

### کتێبی ساقی

ئەوەندەی جام نابووە ناو لەپی
لە پشت پەردەی جوانیدا
دەتگوت کاسەیێ کەوکەوە

پڕ لە شەڕاب، پڕ لە بخووری ئاسمانی
کە هەڵدەڕژایە ناو کۆڕی مەی بەدەستان
دونیا یەکپارچە سوور دەبوو
بەڵام ئاخ یادەوەریم
بەسەر گۆڕەکەی خەیامدا
تا دەهات کپ و دوور دەبوو

کتێبی نیتشە

هەموومان زنارەکەی زەردەشتمان، لە کەمەر کردو
لە ئاوبارە پیرۆزەکانەوە
بەرەو کچی خۆرەتاو وەستاین
شەوێکی درێژو تاریکمان
بەسەردا هات غەرقی ئەبەد بووین
تا ئێستاش بە ماڵەکەی خۆمان ناکەوینەوە
لە بەرپای ئەم وجوودەدا
بێهوودە دەسووڕێینەوەو ناگەینەجێ
هەرگیز ناگەینەجێ، هەرگیز

کتێبی مەلەکوت

کە با هەڵدەکاتو ڕێ ڕێ، دەچێتە ناو خوێنمانەوە
هەست بە دێرو پیتی نادیاریت دەکەین
لە کوێی هەمیشە تێکەڵی، هێمنی خاکمان دەکەی
دەمانبەیەوە تەنهایی
دەمانکەیەوە بە گیاو باوەشێ ئێسقانی پەڕپووت
تۆ لە کوێی؟ ئەی جوانترین شاهی مەلەکوت

## کتێبی نەی

ئەو شەوە بایێکی کوشندە
خەم پرژێنی چیای دەکرد
کۆتەرەو کۆنە درەختی
دەبردەوە ناو ماڵی عەدەم
نەوایەك داگیرسا
کە ڕۆحی مرۆڤی دەخستە لەرزەوە
لەو شەوە پڕ سام و شکۆیە بوو
کە نەوای غەریبی پشتاوپشت
نەوە بە نەوە هاتووە
تێکەڵی ڕۆحی ئینسان بووە

## کتێبی شەراب

پەیمانێکی موقەدەس بوو، لەگەڵ شەیتان
وەکو چەند پۆلیە فاوستێ
بۆتە زیوی زەینی ئینسان
بۆتە شەوقی دڵی کەون و سپێدەی بیر
هەزار ساڵە پەڕەی پەمەیی و هەناری
ئەم کتێبە هەڵدەدەینەوە
دێڕێکمان پێ نەخوێندراوە
دەیخۆینەوە ئەویش ئێمە دەخواتەوە
وەك دوو دۆستێ ناکۆك و دژ
نە پێکدەگەین نەتێکدەگەین
لە یەکتریش نابینەوە

## کتێبی زەعیم

هێشتا زەعیم لە ماڵەکەی هەمووmانە
لە هزرمان دێتە دەرێ، دەکەوێتەوە ناو دڵمان
کە لە دڵمان دەریدێنین، دەکەوێتەوە ناو سەرمان
زەعیم وێنەی لە دەفتەری هەموومانە
زەعیم بۆتە ئەبەدی لە شارەکەم
زەحمەتە وا زوو بیر بچێتەوە
زەعیم لە مێژە مردووە
بەڵام ئێمە پێمان وایە
هێشتاکە هەروا زیندووە

## کتێبی مردووان

ئێمە هەمیشە لە قەڵاوە، سەیری مانگ دەکەین
پێمانوایە ئەوێ کۆتایی دونیایەو
ڕووناییی مانگ، لەوێ زیاتر جیلوەی هەیە
لەوێ بەرەو خلود دەچین
نەمانزانی سینەی ئایندە، پڕی مانگی جوانە
ئێستا کار لە کار ترازاوە ،لە قەڵاشەوە دابەزین
ئەو مانگە هەر لە خوێنو بوونمانا دەژی
بۆ ئایندەش بەڕێ کەوین
ئەو مانگە هەر لە گەڵمانە
تا ئێستاش خوانی ڕابردوو
بۆ ئێمە هەر وەك خۆی جوانە

### کتێبی وەسوەسە

نیوە شەوێك سەیری ئاوێنەم کردو
بیری زولەیخا کوشتمی
لە ئاوێنەکەم نزیکتر کەوتمەوە
زولەیخا وەك بەفر توایەوە
نزیکتر کەوتمەوە زولەیخا هەر نەما
کە دیقەتم کرد لەیەك کاتدا
هەم خۆم بوومو هەم زولەیخا
لەو ڕۆژەوە من یوسفی نەرسۆسم

### کتێبی گریان

دەستێکە هەمیشە لە ئەژنۆ
دڵێکە مەکۆی خەمان
سینەییێکە لەکۆست و کوتان
ئای دایە چەند یادت دەکەم

### کتێبی منارە

هەموو تەمەنی
بۆ ڕمان و هەڵوەرین تەرخان کردووە
هەموو خشتەکانی بۆ شکان
هەموو بینایی بۆ ڕمان
وەك کچێکی قەیرە
هەر لە یەکەم عەشقیدا دەژی

نە لە پێ دەکەوێ، نە هەڵیشدەچێ بۆ ئاسمان

کتێبی نەیژەن

کە با هەڵیکرد زۆر گەڕاین
بەدوای قامیشێ، دڵمان ئاسوودە کاتەوە
بەڵام کە نەی، بە جلی پاییز هاتەوە
ئێمە تازە لە ناشتنی
تەرمی نەیژەن بووبووینەوە
کتێبی ئاوی میری
قەڵەمەکەی لە ئاوی میری هەڵدێنا
دەشتایی دەنووسیەوە
دەمی لە دەمی حاجیلەکان دەناو
لەبەردەم باخی شار دەچەمایەوە
دێ دێ و گەڕەك گەڕەك و ماڵەوماڵ
دڵۆپ دڵۆپ، دەڕژایە خوێنی شارەوە
سەری لەشارستانیەت سپی بوو

کتێبی خانمان

کە پڕ دەبێ لە خوێن، دەیپەرستن
دەیکەن بە تەوتەمی خۆیان
هەر بەو خوێنەوە، دەچنەوە باخچەکانی لەپیکۆر
تا گوڵی ئاڵی جەستەیان ئاو بدەن
دەبێ ئەو تەوتەمە
لە ڕۆحیان بەتاڵ بکەن

### کتێبی ئەشکەوت

دەنگێك هەمیشە بانگ دەكا
سەدایەك هەمیشە دێتەوە
كەڤرەكان بانگ دەكەن
سەداكان دێنەوە
گیاكان كەروێشكە دەكەن، سەداكان دێنەوە
ئەمە غەرق بوونێكی قەدەرییە، كە ئینسان
بە تەنها گوێی، لە سەدای خۆی ببێتەوە

### کتێبی سیحر

كە دەكرایەوە هەموویان
بۆدلێر، رامبۆ، بورهان جاهید
یەك یەك لەنێو پەنجەكانیا، دەكەوتنە خوارەوە
دونیا پڕ دەبوو لە جادوو
لە سرووتی جوانی بخوور
كە دادەخرا، گەڵای شەو هەڵدەوەری
بخورێكمان دادەگیرسان
لە ناو ناڵەو دەفی دەروون
لەگەڵیانا رادەبردین
پاشان بەرەو فەنا دەچووین

### کتێبی ڕۆح

بەر لە هەزاران ساڵ بوو شکا
هەر پارچەی کەوتە جەستەیێ
ئێستێش کە مرۆڤ هاواردەکا
شکانێ دەزرینگێتەوە
لەشکانی ئێسقان دەچێ
لەشکانی دەقی گوڵەگەنم دەچێ
کە با بە سەریا هەڵدەکا
بۆیێ کە مروڤ دەگریێ
دەگەڕێتەوە ئەسلی خۆی

## کتێبی مەستی

ئەو مەلەی بەسەر درەختی ڕۆحەوە هەڵنیشت
دەنووک دەنووك
خوێنی ئەو ڕۆحەی هەڵدەمژی
مەست بوو کاتێ دەیچریکان
چریکەیێك پڕ لە گریان
گۆرانی نییە ناڵەیە
شەکەتی ئینسان ساو دەدا
بێهوودە خۆی دەبڕێتەوە
درەختی ئێمە ئاودەدا

کتێبی مانگ

هەر بە تاقی ئاسمانەوە
دەڵێی نقێمی سەرپەنجەی فریشتانە
ئەو ڕۆژەی کە مانگیان دزی
فریشتە پرچیان ڕنیەوە و ئاسمان شکا
بارانێ باری لە قەتران
بێهوودە نییە وەك قەتمیر
ڕەش بۆتەوە سینە و دەروونی زۆر ئینسان

کتێبی کوێران

نزایێ لەقووڵایی خوێندا، بە چرپە سەردەدا
ئاسمانان شەق دەکا
کۆڵەگەی هەبوونمان لەق دەکا
نارەزایی ڕۆحە لەم کەونە
دڵنیان، کێ بینایی ئەوانی نەداوە
هەربۆیەش شەڕی وان، زۆر سەختە
لە بەرامبەر کەسێدا
نە سیمای دیارەو نە بوونی
لایانوایە ئەوان
درەختێکی زڕن، لە کتێبی زەبوونی

کتێبی قەڵا

بروسکێ بوو،لە شمشێری شکاوی ئەسکەندەر
شەوقێکیش، لە خوودەکەی زەینەفۆن

ئاوێنەی خۆرێ بوو، لە باخەڵ
جامێ مەی، لە دەستی شاژنی میدیا
کە ئەوانەی بیرکەوتەوە، تازە بەهار
داوداو لە دامێنی قەڵا
لەژێر خشتە ڕماوەکاندا، سەری دەردێنا
هەناسەیێکی هەڵکێشا، وەك ئاگرو ئاگریداغ
ئەو ڕۆژە ماڵی خۆی
بردەوە گۆڕستانی چراغ

کتێبی قەرەنی جەمیل

بەیەکەوە بەپێی پەتی
شەرواڵێ لە جانگی ماهووت
دەچووینەوە ناو کۆڵانەکانی مێژوو
کە پیسترین کۆڵانی دونیا بوو
مناڵیمان دەدایە دەست قەدەرو
بەدوای ڕیشۆڵان دەکەوتین
شانازیمان بە کوشتنی
بارانبرە قەترانییەکان دەکرد
ئەو بە فرشە و ڕەسمی ئاسمان
من بە شیعرو تەمی چیا
لە شەڕدا بووین، لەگەڵ خۆمان

## کتێبی تەمەن

لە دەرگەیێکی بچووک
کە خەزنەی لەززەت و نەسلە
بۆ دەرگەیێکی دیکەی چۆڵ
بە جلێکی سپی و ساوخۆش، ئاوابوو نەگەڕایەوە
لەمیانی ئەم دوو دەرگایەدا
چەند ماندوو و شەکەتی ئەی مرۆڤ
کە ناتوانی، خۆت بخوێنیتەوە

## کتێبی دانتی

سەفەرێ، بۆ ژێر زەمینەکانی هادیس
سەفەرێ، بۆ گوڵەکانی دۆزەخ
سەفەرێ، بۆ فاتیمەکانی ڕۆژهەڵات
سەفەرێ، بۆ گومەزەکانی
بیاتریس نووری هەموو نوورەکان
کۆی هەموو سەفەرەکانیش
کیسەیێ ئێسقان و گۆڵمێ فرمێسکی بەجێماو
بەسەر حەوت تەبەقەی ئاسمان

## کتێبی گومان

سپێدە هات، گومانمان لە خۆر بوو
ئەوەکا غەرقی ئاگر بین
بەهار هات، گومانمان لە گیا بوو
ئەوەکا ورشە بمانکوژێ
زستان هات، گومانمان لە باران بوو
ئەوەکا گوڵەگەنم هاموون دانەگرێ
پاییز هات، گومانمان لە وەرینی گەڵا بوو
ئەوەکا لە دڵی بگرین
کە کەوتین گومانمان پڕژا
ئێستاش، گومان دەکەین لە یەقین بمرین

## پەرستگای سرووت

### سرووتی غەریبان

چاوێکیان هەمیشە، لە خاك و چاوێکیان لە چیا
شەوێکیان، لە ئەشك و شەوێکیان لە بریا
ئەو کاتەی دوا پێڵوو لێکدەنێن
وەسیەتی ئاگرین، بەرهەڵڵای شار دەکەن
ئەو ساتە بۆ ئەبەد، لە وجود بار دەکەن.

### سرووتی تەنهایی

لە کەنار شەوێکی درەنگا
کە هێشووی ئەستێرە دەوەرین
ئەو بەتەك درەختێ، ناڵەی خۆی سەردەدا
ئەو مانگەی ئەو نیگای بۆ دەکردە نامە
لەمێژ بوو دوا شەوقی
لە ئابڕووی ئاوابوون، تکا بوو
بۆیە ئەو، لە نکال شەوێکی درەنگا
بە ناو ڕۆحی خۆیا ڕما بوو

## سرووتی سووتان

کە فڕی، لە گۆرانی عەشقا مەست بوو بوو
تێکەڵی شەڕابی ساماڵی خەست بوو بوو
هەر بەدەم فڕینا
چاوی خۆی هەڵدەڕشت، لە کلی ئەوینا
ئەو ڕۆژە هێندە بەرز هەڵگەڕا
تا باڵی لە ئاگری خۆر، سوور هەڵگەڕا

## سرووتی بەفر

ئەو بایەی، بە سەرما هەڵدەکا
تام و بۆو ڕەنگی ڕۆح، هەڵدەگرێ
بۆ دوور دووری دەبا
هێندە باو وەیشوومەم، بەسەردا هەڵدەکا
کەچی من هەتا دێ، غەرقەبم لە کپی
دوا جاریش شتێك نیم
جگە لە ساردێکی ئەزەلی و
شاژنێ لە بەرگێکی سپیدا

## سرووتی گریان

ڕۆحی من لە شووشەی پڕ درزو شکاوە
من دەنگێکی دیاری زەمانم

## سرووتی برادەران

برادەرەکانم بەقەد یەك ژوور بوون
لە کانی نوور ئاویان دەخواردەوە
لە ڕووبارێ خۆیان دەشووشت
یەك کتێبیان دەخوێندەوە
لە یەك مانگدا شەوقیان دەچنی
ئێستاکە هەندێکیان
لە باکوور هەندێکیان لە باشوور
هەندێکیان لە خۆرهەڵات
هەندێکیان لە خۆرئاوا
برادەرەکانم، جارێکی دی کۆ نابنەوە

## سرووتی نالّین

هەموو سپێدەیەك، گوێم لە بالۆرەیەك دەبێ
کە بە سەر فرمێسکەوە هەڵدەکات
بە ناو دیرۆکێکدا پەرت دەبێ و سەدا دەنێرێ
ئەمە نالّەی دایکێکە
یان کۆرپەکەی لە دەست داوە
یان لە شینی ئازیزێکدا، شین دەگێڕێ

## سرووتی خەم

دوا کتێبی سەفەرم کردەوە
لە پەڕی خەمگینی یادێکا، گیرم خوارد
چوومەوە ڕابردووی سەر تاق و منارەی کەڤناری
لەو ساتە خەمێکی کوشندە
لە دڵ و دەروونی من باری
یادێکی خەمگین و دڵتەزێن
خوێنی هەڵپڕووکاندم
لە ناو دێڕو وشەی کتێبی چەقاندم

### سرووتی سپێدان

تروسکەی شەونمی سەر گیا
شەوقی خۆی دەداوە ناو چاوم
ئەو ساتە دەمزانی
سپێدە ڕابرد و من نوقمی هەتاوم

### سرووتی زریان

کە خوێنی ناو لەپی ڕژایە سەر بەفر
لە شەوقی هەتاو و بریسکەی سپیاتی
دوا هەناسەی گەرمی هەڵکێشاو
سەبەتەی بینایی هەڵڕژان
مەرگی خۆی بە بادا

### سرووتی هامۆن

دەسکەنەی گوڵەکانی هامۆنم
لە حاجی قادرا وەرگرت و
دامە دەست بای ئەزەل
ئێستاکە سەر زەمین، سەرپاکی بۆتە کۆ

## سرووتی خاك

بایێ هەمیشە بە قورسی و سەنگینی، ڕێ دەبڕێ
هەمیشە گەردەنی هەر لارە و هەر سەیری من دەکا
بایێ هەمیشە تەڕ تەڕ، هەر دەڵێی لە کانی هاتووە
بایێ هەمیشە، کپ کپ، هەر دەڵێی ماتەمە
بایێ لەسەر خۆ، دێتە ناو ماڵەکانمان و رادەبرێ
ئەمە بای خاکێکە، ڕۆڵەکانی نایناسنەوە

## سرووتی ئەشکەوت

هەمیشە ڕەنگێ هەیە
لە ڕەنگی گیای ئەشکەوت دەچێ
دەنگێ هەیە
لە شکستی کەڤرو زناری ئەشکەوت دەچێ
هەمیشەو تا ئەبەد، ئەشکەوتێ هەیە
تەژی سەداو تەژی لە ژان
وەك ئەشکەوتی، تووناوتوونی ڕۆحی ئینسان

## سرووتی ئاگر

له دوورترین ئاگردانی مێژوودا
بریسکەی بۆ ئێمه هاتووه
دەمێ له ژێر خۆڵەمێش و
دەمێ دونیا پڕ نوور دەکا
ئەمه ئاگری خوێنمانه
دەگەڕێتەوه ناو جەسته

## سرووتی تەنهایی

که بەناو ڕێگاکاندا، به تەنها بانگم کرد
سەداشم به باران هاتەوه
که بەناو ڕێگاکاندا
به تەنها له وێنەی ئاوێکا بانگم کرد
ئەوساکه زانیم، چۆڵ بووەو حیکمەتی دەورانه
ناچار بووم، سەر بکەم به ڕەوتی وەستاوی
ئەم بەردو کەڤرانه

### سرووتی مەلان

سپێدە کە دەنگی بای ئەزەل
پەنجەرەو دەرگامی دەهەژاند
مۆسیقای شۆپانم دا بە باڵی مەلێ
تێکەڵی بای کردو ڕفاندی
زوڵمێکی کەون بوو
ستوونی مۆسیقا ڕماندی

### سرووتی سێو

ئەمە سێوێ
ئەمە دوو سێو
ئەمە سێ سێو
تێر نەبووین، لە تامی ئەو سێوەی منداڵی
کە پیری وەك دێوێ
وەك درەنجی کێوێ
بە پەلە هات هەر وەك گەواڵە
نەك هەر سێو
باخی سێوەکانی وجودی ڕاماڵی

### سرووتی مانگ

که شکا
پارچەیەکی مانگم، نایە ناو لەپمەوە
ئەو شەوە، هەر بە دیار ئەو پارچە شکاوەی
مانگی ڕووت دانیشتم
نەخەوتم سپێدە پێی وتم
دەچمەوە بۆ ئاسمان
تۆ چەندە خەمگینی؟ ئەی ئینسان

### سرووتی دڵان

ئاسمانێك لە هەورو کەنارێك لە گیا
شاباڵێ لە فڕین
هەندێ خەم و هەندێ سەما
دڵێکە، هەر هێندەی کاسەیێ
کاسەیێ بە قەدەر گشت دونیا

## سرووتی ئەم

دوا ئاوڕی دایەوە، بە تیشکی ئەو نیگای
کەونی پڕ شەوق کرد
ئەم درەختی لە شوشەی سپی گرت
ئێستاکەش ئەم کەونە
وەك باری نائومێدی و ترسی سەر لێوە
کە ئێمەش هەموومان، دەبینە زوخاڵ و
بە شەوقی نیگای ئەو، دەڕواتن بە ڕێوە

## سرووتی ڕێ

ئەو ڕێیە چەند دوورە
هەر دەڵێی تا ئەبەد دەڕواتن
ئەو ڕێیە چەند نزیکە
هەر دەڵێی تا دۆزەخ دەڕواتن
ئەو ڕێیە سەرێکی
لە زەوی سەرێکی لە ئاسمان
سەرێکی لە هەورو سەرێکی لە باران
ئەو ڕێیە چەند سەخت و دژوارە
مرۆڤی لە خۆدا گرتووە و بەرنادا
کە تازە مەحاڵە
زفڕینیش ئێستاکە بۆ ئێمە دەست نادا

### سرووتی شەو

کە دەنگی بۆقەکان لە کانی و ڕووباران
تێکەڵی زەردایی مانگ دەبێ
دونیا کپ، ڕۆحیشمان پڕ دەبێ
ژیانمان وەك خەونە
ئەوساکە جیاوازی مرۆڤ و بۆقەکان نامێنێ
هەمووومان دەبینە تەونێکی
سەر فەرشی ئەم کەونە

### سرووتی بابان

کە ئاسمان
پیرۆزی دا بە چاوی کەژو کێوەکان
ئەستێرەی دا بە ڕێگاو بانەکان
مانگیشی وەك کچی چواردە ساڵ، دا بە شەو
هەوریشی وەك تەتەر، ناردە لای وەردەکان
بروسکەی دا بە خاك
بەفریشی دا بە شاخ
ئەو شەوە ئاسمانمان، وەك زەوی دیار بوو
زەویشمان وەك ئاسمان

## شـــيوەن

1

دەستم خستە ناو دەستی با

بە دونیای زۆر دووری سووڕاندم

چیم نەدی، یادی تۆی تیا نەبێ و

چیم نەدی، شێوەی تۆ نەبەخشێ

هاوارم کرد ئەی با، ئەی با

هەڵم بگرەو دوورم ببە

2

خوێنێکی زۆر

لەگەڵ تەمی سپێدەکانم تێکەڵ بوو

چیاکان تا ئێستاش سوور دەچنەوە

ئێستاش سینەی درەختەکان

شوێنی سەرە ڕمیان پێوە دیارە

بەڵام هەر نەهات

ئێستاش هەر لەبەر ڕەشەبام

ئێستاش گوڵم لەدەستایە

چاوەڕێم و گۆدۆ هەر نەهات

3

کەس لەگیا بریندار تر نییە

لێی بپرسن خۆی دەزانێ

برینی گیا، لەو گۆڕە بێ کێڵانەوە دەبێتەوە

کە بەهاران، بەسەریانەوە شین دەبێ

4

لاسکی گوڵەگەنمەکانم، نایە سەر لەپ

بەرزم کردنەوە بۆ ئاسمان

دەتگوت تەرمی مرۆڤن، ئاوەها ساردن
گۆڕێکم، بۆ لەناو کۆپەنێ گیا هەڵکەند
یەك یەکم، بە خاك سپاردن
بە دیاریانەوە نووشتامەوە
دروودی خۆمم بۆ ناردن
5
لەناو وەردە دوورەکان و
لە پاوان و لە تەمتومان
شووشەی شکاوی ڕۆحی خۆم
دەدۆزمەوە
بریقەی دەچێتە ئاسمان
6
کە هەبوو دونیا جوان بوو
کۆڵان پڕ ئەستێرە دەبوون
باران زەوی بۆ دەڕشتین
با نامەکانی دەهێناو
بەفر دڵی دەدایەوە
ئێستاش دونیا لە گۆڕ دەچێ
7
ئێمە سێبەرێکمان هەبوو
سپێدان خەوی دەدایێ
نیوەڕۆیانیش ئاوی سارد
ئەوەندە ڕۆژەکانی، عومری خۆمان هێناو ژمارد
کە سەرمان بەرز کردەوە
پرچی خۆمان بینی بەفرە
سێبەریش ڕەویوەتەوە.

8

هێندە بەرزمان کردەوە

بوو بە لوتکە، پێمان لە زەوی کردەوە

هێندە تارای پیرۆزیمان، لە مل ئاڵاند

بوو بە موقەدەسێ، وەك ئاسمان

ئێستاش، نە دەستمان دەیگاتێ، نە هاوارمان

9

سپێدان لەناو زەنوێران

جوانی دەبەشیەوە سەر دونیا

ئێستا پەرییان، نە لە سەر زەویدا ماون

نە لە ئاسمان

بۆیە غەرق بووین لە گومان

10

هەمووما‌ن ڕەوتین و ڕێگەمان کەوتەوە بیابان

لە مەرزی کەون بە دوور بووین

تینوومان بوو، دونیا لە بەرد وشکتر بوو

دایە چاومان، کەسمان کەسی نەناسییەوە

پەرش‌و بڵاوی دونیا بووین

11

ئەو بەهارەش درەختەکە بەری نەدا

بە پاچێکی ژەهراوی، لە قەدەوە هەڵیانپاچی

نەیانزانی مرۆڤیش هەیە

هیچ نەوەیێکی لێناکەوێتەوە

## نهێنییەکانی ناو کتێبی بەرد

1

خەونێك بوو لە شیری ماین و

تەونێك بوو لە ئایین

ماینەکە باڵی گرت بۆ ئاسمان

ئایینیش داڵی گرت

بۆناو سینەی ئینسان

2

ئەو شمشێرەی شکا

لەتێکی بۆ خەون و خەیاڵ بوو

لەتێکی بۆ جەستە

خەونەکان هەڵوەرین

خەیاڵیش بڕایەوە

هەربۆیەش چی جەستەی بەشەر بوو

لە لەوحی بەهادا سڕایەوە

3

بێدەنگی ئەم ناوەی تەنیوە

کە بە دوای حەقیقەت دەگەڕێی

گوتنی لە زمان گەنیوە

وا چاکە هەر کەڕ بی

ئەگینا هەر دەبێ

بێهوودە لە شەڕ بی

4

حیکمەت بوو ڕژایە سەر زەوی

کەس بۆی کۆنەکراوە

ئێستاکەش ژێر پێمان حیکمەتەو
ناو سەرمان بە تاڵە
5
ئەوەندە من سەیری بەرزیم کرد
لە نەویان کەوتمەوە
ئەوەندە تۆ، لە ناو خەڵوەتا نقوم بووی
وای لە ناو ئاسمان و ترۆپکی سەرشاران
منیش بووم بە بەردی بنگۆمی بناران
6
سامی جوانی تۆ، لە سامی پەری دەکا
ئەی شای جوانترین سرروودم
ئێستاکە بۆ کامتان بنێرم درووودم؟
7
لێواری گەردوونم هەڵبژارد
کەوتمە ناو پانتایی
پێکێکی تەنکم هەڵقوڕاند
بوومەوە ئەفسانەی خودایی
8
کە ئێمە لە ئاگر دەڕوانین
پێی دەڵێین
ڕیشەمان لەتۆیە، ئەی هاڵاوی پیرۆز
زمانمان لە ئێڵەت پڕاوە
بەڵام ئاخ ئاگری سەر زەمین
لەو پەڕی مەستیمان کوژاوە
9
ئەوەندە چوومە ناو دڵی تۆ خودایە

تا ئەمام
ئەمێستا کە نیم، تۆم
کە تۆشم ، نیم
من خۆشم نازانم، ئەمێستا ئەمن چیم ؟
10
ئەی نادیار
بۆ یەك ساتێ بەدیار کەوە
من بۆ ئەبەد ئاوا دەبم
11
ئەوەندە گۆرانیم بۆ چڕی و
فرمێسکم بۆ باران
بووم بە داود و گیا لە ئەشکم شین بوو
ئەوەندە لە بەر پەنجەرەیا مامەوە
تا خووس و گەردم گرت
ئەوێستا بەردێکم لەو ناوە
ئەفسانەی کتێبم لە دەوران سڕاوە
12
شەوێ بوو حەسرەتم دادی دام
چوومەوە ناو کتێب
کتێبێ لەشیرو شمشێرو تەم و داو
دونیا کپ خەیاڵ دوور
تا ونبووم لە چاوان
بەیانی کتێبیش پەڕ پەڕ بوو لە تاوان
13
ڕێ ڕێ، بەدوای جوانی نادیاری تۆ گەڕام
لەناو تەمی لوتکان ون بووم

گۆج بوو دەستم، کوێر بوو چاوم
نەمزانی ئەو تەمە تۆ بووی
ئاقیقی رۆحی شکاوم
14
گوڵو دڵ وەك یەکن
یەکیان پەڕ
ئەویان خوێن
هەردووکیان وەك شووشە دەشکێنو
وەك لوتکە دادەڕمێن
15
بە دوای گلگامێش گەڕاوم
پەندی زۆرم هەڵڕشتە گۆمی ئەم ناوە
زۆر کتێبم تەواو کردو
شیعرێکی زۆرم خوێندەوە
ئێستێ کە دوا هەناسەمە
تێگەیشتم گوڵی خلود
کتێبێکە چاپ نەکراوە
16
ئیستێش بۆ من
مایەی گریان و ڕامانی
ئێستاش بۆمن
تۆ جوانترین نیشتمانی
17
چەند ساڵە وەك پشکۆی خۆڵەمێش
بۆ ڕوخساری پاکت دەسووتێم
تۆش ونی

نه شوێنت دیارەو نه سیما
نه دەنگت هەیه و نه ڕەنگێ
تۆ بێ عەرش و تاج و ئەنوای
له نوورو شەوق و جوانیتا
تێگەییم خوای

## نـەی نەی

1

ئەی نەی، گەوهەری ڕۆح

دەزانی بۆ نەوات ئەوەندە غەریبە

چونکە دەنگی فیراق

لەگەڵ خاك و نیشتمانی هاوتەریبە

2

ئای بڕادەرەکان هێندە بەرز هەڵمەفڕن

جێگە نەوییەکان خۆشترە

کە هەموو بچنە بەرزایی

ئەوە خاك دڵی توند دەبێ لە تەنهایی

3

من کە دەبمەوە خۆڵەمێش

چیم بە سەر نەمریی دایە

بۆ ئەو شەرابە شیرینە نەخۆمەوە

کە لەناو گۆزەی ڕۆحتایە

4

هەزاران شەو سەیری تۆم کرد

هەندێ جار ئەستێرە بووی دادەڕژای

هەندێ جاریش شووشە عەترێکی تابان بووی

بە ڕووی منا دادەپژای

5

سەیرکە هەموویان گۆرانی دەچڕن

ژێر پێشیان جەستەی ئینسانە

قەدەر وایە. لە میانی مەرگو ژیاندا

بۆ ئەبەد جەنگە بەرپایە

6

جوانی تۆ وەك شەفەقێکە

بەسەر بەهەشتەوە هەڵێ

کەمن ڕێم بەرەو دۆزەخە

ئای لەو پارسەنگە سەختە

7

ئەو میحرابە جێی تۆ نییە

تۆ فریشتەی نێو مەیخانەی

بە قەترەیێ دەگەیتە خوا

کام رێگە زوو دەتبا بۆلای

ئەو ڕاستەقینەیە بە خوا

8

چەند سەختە شەو، چەند دژوارە

هەموو ساتێکی من شەو بوو

چەند دوورە ڕێ، چەند تەنهایە

هەموو تەمەنم بەسەرچوو

نەگەیمە جێ

9

تۆ چەند ونی من ئاشکرا

تۆ تاریکی و من چل چرا

کاممان ڕاستەقینەین برا؟

10

وا ئەو پێکەش دەخۆمەوە

با تەمەنم هەر با بیبات

سپێدە هەرچی باد ئاباد

11

تۆ وەك بەفری

لەناو لەپم دەتوێیتەوە

منیش وەکو ئاڵەکۆکێ

لەبن تارای سپیت ژینم بەسەر دەچێ

12

چەند حیکمەتی خۆم هەڵڕێژم

بیرم ئەوەندە تیژ دەبێ

چەند کاژی هزرم فڕێ دەم

لەوەندە ئاسۆم پڕ دەبێ

13

گوڵێکە دوور، بۆی دەچم دادەخرێتەوە

جێی دەهێڵم

وەك شەوبۆ دەکرێتەوە

14

ئەو چرایە مەکوژێنەوە

تۆ لەناو ڕووناکی ئەوای

گۆزەی دڵی من مەشکێنە

خۆت تیا وردو خاش دەبی

15

ئەی با ئەی با

وەرە دوور دوورم هەڵگرە

لێرە ژەنگم هەڵێناوە

دەزانم لە دووریش دەڕزیم

قەیدی چییە

نیەتی مەرگم هێناوە

16

ناكرێ لەو بایە جێت هێڵم

دەترسم پەرشی دونیات کا

یا ون ببی لەو کێوانە

کە تۆ پەرشی دونیا ببی

دەبێ مانای ئەزەل چ بی ؟

17

کە بەرەو ئاسمان هەڵدەچووی

زانیم مەسیحی خۆم هەیە

کە بە پەیژەکان دابەزی

خاچێ لەناو دڵم لەرزی

## سیفری ئاگر

1

ئەو کاتەی تاڤگەی نەی ئێمەی نوقمی
سەدای دەف و بارانی نوور کرد بوو
هاوارمان وەك بخووری گوناه
لە کەنارەکانی دۆزەخ دادەگیرسا
ئەو کاتەی شەونمی سپێدان
لە چاوانما دەڕژایە سەر گۆنای گیا
هەمووومان بە یەکەوە
دەممان خستە ناو دەمی وەهمی یەقین
هەندێکیشمان هێشتا
لە ناو تەمی گومان گاگۆڵەی دەکرد
ئەو کاتە بوو کە پرسیار دڵی دەهاڕین و
سەری پڕ هزری دەبردین
نە گومان وەك بایێ لوولی دەداین و
نە یەقین ڕەهای دەکردین

2

دەرگاکان چەند زۆر بوون
نەماندەزانی کامیان
بەرەو حەقیقەتمان دەبات
لەگەڵ کردنەوەی کامیانا
کۆترەکان لە شەققەی باڵ دەدەن
دەرگاکان چەند زۆر بوون
هەندێکیان ئاسنین هەندێکیان وەهم

بەڵام ئێمە نەمانزانی
کامیان بەرەو یارییەکانمان دەبات
ئەو یارییانەی هەودای قەدەر دەیسوورێنێ و
بخووردی چارەنووسمان بەسەردا دەپژێنێ
3
تا دەهات دونیا پڕ بڵێسە دەبوو
دامێنەکان، ئەشکەوتەکان ناولەپ و دوو چاومان
پڕ دەبوو لە ڕووناهی
شتێ نەما غەرقی بڵێسەی نوور نەبێ
شتێ نەما وەك شەمێی عەنبەری گەورە دانەگیرسێ
بەڵام ئێمە دەروونمان
هێندە تاریك بوو چاومان هیچی نەدەدی
4
ئەو کاتەی کە مارهزرەکان
کەوتبوونە دوای ماری دارستان
منالێ دەمی خۆی کردەوەو
ماری لە هەناو شاردەوە
تا ئێستاش مار لە هەناوی بەشەردایە
مار تەنها لە هەناوی مرۆڤدا
پەیامی خۆی جێبەجێ دەکات
5
زەمانێکی زۆر
ئێمە لەگەڵ ئاگردا یاریمان دەکرد
شەوانە لەبەر ڕووناهی ئاگری مانگدا
دەچووینەوە سنوورە دوورەکانی ئەوین
لەتەك ئاگردا تا سپێدان سەمامان دەکرد

بە ئاگر دەچووینە حزووری مەرگ و
سارێژی برینەکانمان دەکرد
بە ئاگریش باڵمان دەگرت
کە برسیمان دەبوو، ئاگرمان دەخوارد
کە تینووش دەبووین، ئاگرمان دەخواردەوە
ئەی ئاگر، تۆ هاودەمێکی چەند جوان بووی
بەڵام ئێمە خۆڵەمێش بووین
هەمیشە تۆمان لە ناخمان دەشاردەوە
ئێستاکەش بێ ئاگر ماوینەتەوە
هەرگیز دانەگیرساینەوە
6
ئێستاش گومان لەوە هەیە نازانین
لەپێناوی عەترێ، باخێك لە گوڵا وێران بووە
ئێستاش گومان لەوە هەیە
لە پێناوی باڵەفڕەیێ
دارستانێك مەل قوربانی داوە
هەمووومان گومانمان وایە شەو بۆیە تاریکە
تا ڕووناهی ئەستێرەکان بە هەدەر نەچێ
هەموو یەقینەکان ناتوانن
گومانە ئەزەلییەکان لەبار بەرن
بەڵام گومانێکی سادە
گەورەترین یەقین لەق دەکات
7
ئەو ڕۆژەی عاشقان یەکە یەکە
دانیان بەوە نا کە بەو ئاگرە سووتاون
کە لە چاوی گوڵەکانەوە هەڵدەکا

ئیدی کۆمەڵ کۆمەڵ
لە نێو باخەکانەوە دەکەوتن و بۆ لەبەد
جارێکی دیکە گوڵیان لە یەخە نەدایەوە
ئەوانە ئەو عاشقانە بوون
لە بری پەیکەرێ بۆ گەلا
باخەکانیان هەڵدەوەشاندەوەو
لە بری قوربانی
مەعشوقەکانیان سەردەبڕی
8
ئێمە ئەو کاتە کوژاینەوە
کە بیرمان لەوە کردەوە
لە شەوە درێژەکانماندا
ڕق و کینمان داگیرسێنین
جەستەی بەرامبەرمان بچنین
ئێمە ئەو کاتە کەوتین
کە ویستمان بەسەر پشتی نوور کەوین
هێشووی ئەستێرەکان بڕنین
ئەو کاتەش بۆ ئەبەد کوژاینەوە
وامانزانی دونیامان پڕ لە نوور کردەوە
9
هەموو کیژۆڵەکان کەمەری خۆیان پڕ کرد
لە ڕێحانەو شەوبۆی ئاڵدا
چاویان پڕکرد لە کلی ئەبەنووسی و
باسکیان لە بازنی مانگ و لێویان
لە ئاڵەکۆك و ڕۆحیان لە نەشئە
لەو سەرەوە تابان لە ژێر درەختێکدا

هەموویانی لە نوور وەرداو
پیرۆزەی ئاسمان داپۆشین
بوون بە قەبارەیەك جوانی
بەڵام دووکەڵێ لوولی دان
شەقاری ژێر درەختێکیش قووتی دان
10
ئەو منالانەی گوڵەگەنمەکانیان پەڕ پەڕ کرد
دواجاریش هەر پەشیمان نەبوونەوە

تا دەهات گوڵەگەنمەکانیان پەڕ پەڕ دەکرد
دیسان هەر پەشیمان نەبوونەوە
کە دوا سونبوڵیان پەڕ پەڕ کرد
هەمدیس پەشیمان نەبوونەوە
11
کە ئێواران مێگەل مێگەل
ئینسان بەرەو پاوانەکان دەگەڕانەوە
لەو ڕەوە تۆزاویانە دەچوون
کە بۆ یەکەمین جار لەژێر زەوی بێنەدەر و
بەرەو ئەشکەوت بگەڕێنەوە
ئەوان دڵیان بە دونیا خۆش بوو
بەڵام نوورێکیان لەسەر دانەبوو
بەرەو خودی خۆیان بباتەوە
کە لەناو تاوێرو تەمی بنارەکاندا
جێیان هێشتبوو
12
لەشکر لەهەموو لایەکەوە تێکچڕژابوون

لوورەی غەریزەیێك
وەكو لوورەی گورگی بەرمانگ دەیهاڕین
مەیدانی شەڕ پڕبوو لە شمشێری شكاو
لە خودەی كونكون و زرێپۆشی جەستە
ئەسپی كەڤەڵ بە خوێن و ماینی زەردی بەجێماو
جەنگاوەرەكان لە شەڕێكی بێهوودەدا
بڕستی خۆیان لەدەست داو
لە خوێنی خۆیان گەوزین
كپییەك ئەو ناوەی داگرت
وەك كتێبێ هەرگیز كۆتایی نێت
13
كە عاشقی ڕووناهی بووم
هەزاران كێوم بڕی
تا گەییمە ناو پارچە نووری
بەڵام ئاخ چاوەكانم كوێر بوون
دڵم پڕ عەشق بوو نەمدەزانی
ئەو هەموو عەشقە لە كوێ دێ
كە سەرچاوەی عەشقم دۆزیەوە
هەموو عەشقی خۆم لە دەست دا
زۆر بە دوای زناری ئەفسانەیی گەڕام
كە دونیام بخاتە بەردەست
بەڵام كە بوومە خاوەنی
مردن بووە جوانترین یەقین
هەرگیز دەستم نەدەكەوت

## فيـــل

1

تازە ڕووناهی قەڵاو منارەکانی بابل
لە بەرچاوم کزدەبوو
ئەو لەسەرە مەرگیشا هەر سەمای دەکرد
سەما, سەما, سەما
بەڵام یادی فیلێ لە یادگەما ناسڕێتەوە
کاتێ کرا بە قوربانی خوداوەندان
ڕامدەکێشێتە ناو وەسوەسەیەك
غەرقی دوودڵی‌و مەزەندەی زمانم دەکا
یادێك تاڵ تاڵ وەك ژەهری عەشقی ڕژاو
لە بەردەم ئامووندا
شیرین شیرین وەك قەندی جودایی
لە نێوان خوداو ئینساندا
یادی فیلێك هەمیشە ڕامدەکێشێتە ناو گۆرانییەك
وشەکانی لە شووشەیێ عەتر دەچێ
کە دەکەوێتە بەر تیشکی خۆر
بە سەر ڕەفەکانی درەختەوە باڵیان گرت
لە ناو کتێبە دوورەکانەوە دێن
بانگی سەمای کچە جوانەکانی دارستانم دەکات
کە لەوێدا لە بەردەم خوێنی ڕژاوی فیلێ
پێکەکان خەون بوون
بە شەوقی سووتاوی لێوار ئاوەکان
جریوەی شەکەتی لەززەت بوون
لە ناو درەختەکانی بەفر
سەمای ئەو کچانەی لە نێوارەوە

مەیخانەکانیان دەکردە ئورۆکی خۆیان
ئەوەندە مەست دەبوون
جگە لە هەستی فڕین، هیچیان پێ نەدەما
2
هەمیشە خەمێك هەیە، نازانم لە کوێوە دێ
جارجار دەمباتەوە کەنارەکانی گریان
هەندێ جاریش کەوتن لە سەمای مەرگی فیل
دەچێتە ناو دیدگامان
خودایە سەرچاوەی ئەو خەمەم پێ بڵێ
ڕامانی فیلت بۆ هەڵدەڕێژم
ئەوە برین و باقی شووشە شکاوەکانی دڵی فیلێ بوو
کە بە سەر تاوێرەکانەوە وەستا بوو
سەیری قوربانگای دەکرد.
3
ئەو کاتە من تازە لە باخچەی ئاژەڵان دەهاتمەوە
کە جیاوازیمان تەنها ئەو تەیمانە بەردینە بوو
بە دەوریاندا هەڵیاننابوو
کۆمەڵێك بە کاردو چەقۆو چەنگاڵ فیلێکیان یەکاڵا دەکرد
فیلێك سپی سپی لە بارینی بەفرێکی زۆردا
ئەو ڕەنگەی هەڵمژیبوو
گەورە گەورە لە ڕمانی شاخێکا
ئەو گەورەییەی دەست کەوتبوو
هێمن هێمن لە دارستانێکی چڕا
ئەو هێمنییەی گرتبوو
یەکێ دەیگوت بەدوای ئاوێك دەگەڕێن
کە ئاوی زیندەگانییە

ئەمری دەبەخشێ بە مرۆڤ
کەس نازانێ لە کام دەماری ڤیل دایە
یەکێ دەیگوت بە دوای کیسەیێ پشکۆ دەگەڕێن
ڤیل لە کاتی تووڕەبوونیا لە خواوەندەکانی دزیوە..
هەندێکی دیکە دەیانگوت
ئەوعاجانەی لە دەمی ئەو ڤیلە دایە
هەندێ لە زێڕەکانی فیرعەون و
قەدەرێ لە یۆرانیۆمی تیایە
ئەو منالأنەی کە بە دەوری ئەو ڤیلەدا کۆببوونەوە
لەگەڵ بازرقەی خوێندا منالێتی خۆیان تاو دەدا
دەفتەر ڕەسمی خۆیان دەردەهێناو بەو خوێنە
ڕەسمی ئەو سێوانەیان دەکرد
کە هەرگیز نەیانتوانی بوو
لە ئەلفابای کتێبی کوردیدا بیڕنن
بەڵام ڤیل ئای ڤیل
کە خۆی سەیری تراژیدیای خۆی دەکرد هاواری کرد
ئەوەی ئێوە بە دوایدا دەگەڕێن
تازە بەسەرچوو نایدۆزنەوە
من هەزاران ساڵ لە کرێشمەو ڕامان ژیام
تا ئاوا گەورە بووم
کە چی ئێوە هێشتا زۆر بچووکن
خەریکە لە ناو هەناوم ون دەبن
4
ڤیل هێشتاکە لە گوڕو هێزی خۆی نەکەوتبوو
لە رامانی قووڵ و
لە دیدی تیژی خۆی نەکەوتبوو دەینرکاند

بەڵام نرکانی ئەو لە خەمی ئەو ڕامانەیدا بوو
کە ورد ورد لەگەڵ خوێنیا دەڕژاو
پەرشی ئاسمان دەبوو
هەر مەلێ تیشکێکی لێ هەڵدەگرت و
هەر ئەستێرەیێ ڕەونەقێ
بە تەنها هەر فیل بوو دەیزانی
چی لەناو ڕامانی شاردۆتەوە
بەڵام ئەوان بێ پەروا
کە کاردیان لە شادەماری فیل دەدا
تریشقەی خەندەیان
دونیای پڕ لە بارینی بەرد دەکرد
لەگەڵ بازرقەی خوێنی فیل
کێلگەکان سوور دەبوون
قەل‌و داڵ ئاسمانیان پڕ سەداو قریوەی هاردەکرد
من ئەو کاتە پارچە ڕامانێکی فیلم کەوتە بەر هزر
کە بە دەنووکی مەلێکا هاواری دەکرد و با فڕاندی
ئەو شەوەی کە کەون
لەبەر باو وەیشوومەی قەدەرا دەلەرزی
من تازە زمانی ئایندەم گۆش دەکرد
من تازە پێکێکی زۆر خەستم
لە خەنی کۆرپەما نۆش دەکرد
5
فیل لە دوا جارا کە سەیری گۆشتی ڕانی خۆی دەکرد،
وەك ئەو دامێنە وابوو لە هەموو لایێکەوە بتەقێتەوە
تیشکی ئاوێنە هەڵڕێژێ
ئەو مرۆڤانەی زۆر بچووك دەهاتنە بەرچاوی

تا دەهات بچووك دەبوونەوە
كە وردە وردە خوێنی جەستەی فیل چكی دەكرد
مرۆڤەكان تا دەهات بچووك دەبوونەوە
كە دوا قەترەی خوێنی ڕژایە سەر تاشە بەرد
مرۆڤەكان هێندە بچووك ببوونەوە
لەبەرچاوی نەدەبینران
سەرەنجام هێشتاكە فیل هەر مابوو
دوا هەناسەی هەر نەدابوو
كە مرۆڤەكان كۆتاییان هات
بەڵام فیل تا دەهات گەورەتر دەبوو

## جوانی لە پیاسەکاندا

وەك نەی لە پەڕی کتێب هەڵدەڕژاو دەبوو بە هەڵم
وەك باران دەهاتە خوارەوە
ئەفسانەیەکی ئاویی بوو
دڵۆپ دڵۆپ ئەفسوونی خۆی دادەگیرساند
کەنار کەنار حیکمەتی خۆی دەبەشیەوە
ئێستا لە دڵۆپە ئاوێکا سەیری تەرمی جوانی دەکا
پەڕە ئاویەکانی ڕۆحی وەك مانگ دەدرەوشێتەوە
باشووکەیێکی ئاویی بوو
حەزی لە تەلارە دێرینەکان و لەتاقە بەرزەکان دەکرد
وایدەزانی ئاسمان شووشەیێکی شینە و
مانگیش ڕوومەتی فریشتە
کە ئەسکەندەر کانیاوەکانی پڕ بریسکەی شمشێر کرد
ئەو کاتە ئەو دڵۆپە ئاوێکی نێو ئاسمان و زەوی بوو
خەمگینترین براوەو بەختەوەرترین دۆڕاو بوو
لەگەڵ بۆلیڤار لەسەر مێزی لاتین گۆرانیان دەگوت و
شەرابی سەمەرقەندیان دەخواردەوە
هێشتا قسەی لەگەڵ میدیا نەکردبوو
مێرگێکی سەوز بوو هەمیشە بانگی پاییزی دەکرد
پاییز.. پاییز
دەستێکی لە باکوور یەکێکی لە باشوور
ئەو کاتە فاتیمە لە ئاوەکانی خۆراوا
هەڵدەڕژایە کەنارەکانی جوانی
ئەو دڵی دابوو بە خۆرهەڵات
لەو ڕۆژەوە باخچەی کتێبەکانی بابل سووتا

مۆمە جوانەکانی نیپال
لە پەرستگاکانی بووزا کوژانەوە
ئەو هەمیشە لە گۆرانییەکان دەگریاو
لە گریان گۆرانی دەگوت
لە جامی ئایدیادا شیری مایئی دەخواردەوە
لە کوانووی خۆری خواوەندی هەڵدەمژی
کوختەکەی لەناو لەپی قەڵاو بیرازی نۆڤیلیا بوو
هاواری زەینەفۆن ڕماندی
هەمیشە سەیری ئاسمان دەکاو
شووشەی ئایندە دەشکێنێ
دەگەڕێتەوە ڕابردوو کە هێشتا
دووکەڵی ئاگری موغەکانی لێ هەڵدەستا
هەزاران زریزەی ئەڤینی لە کووپەی دڵی داناوە
یادەوەرییەکانی کۆمەڵە مەرجانێکی ڕژاون
لە باخچەی کچە ڕووت و قووتەکانی کتێب
هەڵگری پەیامی جوانییە
لەناو کۆڵانە ناشیرینەکاندا
عەتری ئاگاهی بوو لە بارەکانی ئۆدیسۆس
دوای شەڕەکانی تەڕوادە

سادە وەك گیا شیلەییەكانی بنی دەریاو
ئاڵۆز وەك گەمەی منداڵ
كە بۆ ڕنینی سێوی عەشق دەگەڕایەوە ناو كتێب
كە بۆ چنینی شیعر دەچوو
سەفەری خۆی دەست پێ دەكرد
دۆستایەتی لەگەڵ برینی كۆن هەبوو
هەمیشە دەچووە ماڵی كچە تیرهاوێژەكانی قەفقاسان
هاملێت بوو لە یەقینی ئاڵ
ئاوێكی تەنك بوو لەناو ڕووبارێ لە مەحاڵ

## خۆرئاوای قوڵینگەکان

هێشتا هەڵۆ بە یەکەم چاوترووکانێ
ئاسمانی دانەگرتبوو
ڕموزنەی خەو لەنێو باڵی
باشووکەی قەڵا بەرزەکان نەمردبوو
کە دەستێکی نەرم و نیان
ورتەیەکی فریشتەیی
ڕایتەکاندم لە خەوێکی نزیك مەرگی هەمیشەیی
کە سەیری باڵای سەرم کرد
دەستی پڕ میهری دایکم بوو
وتی زووکە
ئاسمان دیلی ڕەوە مەلێکی وەك بووکە
قوڵینگ وادێن تێدەپەڕن
سەفەرێکی دوورو درێژیان لەبەرە
گەروویان بە لاوکی کۆچ داغ کردووە
لەمێژە شەو لەنێو دەنووکیان مردووە
وتم ئۆخەی ئەوە قەتێی یەکەم ئەوینم پێکرا
کاشکێ دەمزانی کە قەفتەی
خەنجەری ئەو زامە چۆن بوو؟
هەر لەوساوە هەناسەیەکم هەڵکێشا
هەناسەی برینی کۆن بوو
ڕێی سەخت و دامێنی تژیان وەبیر هێنام
بازی کۆكو هەڵۆی زیخی
نێو دەروونیان بەجێ هێنام
زۆر لەمێژە من سایەدی پەیامێکم

قوڵینگان ببینم بێنەوە
شاتەختی هامۆن جێ بێڵن
یا ئەو دەمانەی کۆچ دەکەن
بۆ لەو ڕەوەزە شاخانەی بەدوای وێڵن
ئەوێستاکەش لە ژێر تاوە تیشکی خۆرا
چیا هەر دەڵێی شووشەیە
کەڤرەکان دەبریقێنەوەو
لەنێو چەما سەما دەکەن
دووکەڵکێشی سەربانەکان
ئاهی ساردی
چیرۆکی بەر ئاگردووی شەو بەبا دەکەن
پەنجەرە یەك یەك دەبنەوە
داوێن خاڵ خاڵ لوتکەکان سپی دەچنەوە
نەرمە بایەکیش هەڵدەکات
هەرچیم هەیە لە ناخەوە دەکۆڵێتەوە
قوڵینگەکان قوڵینگەکان
بۆ لە لای من قەرار ناگرن
هەمیشە حەزتان لە گەوەو هەڵەمووتی تووشی ڕێیە
ئێوەش وەك من بێ حەوسەڵەن
لەگەڵ کۆچی هەر مەلێکا
ڕووبارێ فرمێسکم پێیە
ئێوەش وەك من دەستی گراوی خۆ دەگرن
کە غەریبیش دەتانگرێ سەر هەڵدەگرن؟
بۆ لەلای من ئۆقرە ناگرن
ئێوەش وەك من
بۆ مەرگی ئەزیزان دەگرین شین دەگێڕن؟

تاولی‌و ڕەشماڵان تێك دەنێن؟
یا بۆ کۆچێکی یەکجاری چاو لێك دەنێن
خۆ من زیوی چاوی ئێوەم بە کلۆری
هیچ شتێکی ئەم سەر زەمینە نەداوە
هەتا ئێستاش شاپەڕی تاووسی ئێوەم
کردۆتە ئەوینبەندی خۆم
لەنێو پەراسووما ناوە
هەتا ئێستاش جێتان هەر گلێنەی چاوە
مەڕۆن قولینگەکان مەڕۆن
ئێوە خەڵکی کام وڵاتن؟
ئاوا بەلەز کۆشکی خەیاڵم دەڕمێنن
نا نا مەڕۆن
تا بۆ دواجار شەختەی تەنهاییم بشکێنن

## گورگ

1

وەکو ژەهری ئەستێرەمژ

وەکو شمشێری دوو تیغی بێ گوناه کوژ

وەلێ ئاخ دەروونم نرکەی دێ و

نرکەکوژ هەر زاڵە

وەلێ ئاخ برینم هەر گەرمەو

تیماریش لە چڕنووکی داڵە

2

موویان لێدێ، من دڵنیام موویان لێدێ

موویان لە سپێنەی چاوان دێ

من دڵنیام موویان لە لەپ و لێوان دێ.

## میـــوان

گوڵەکەم تاقە زێدو گراوی خۆم
لە پەنجەرەی دارینەوە زۆران شەو و ڕۆژ ڕابردن
زۆر میوانی خۆم بەڕێ کرد
بە چاوی پڕ فرمێسکەوە ماڵئاوایی خۆم لێکردن
گوڵەکەم تاقە زێد و گراوی خۆم
وا بخوور دادەگیرسێنم
میوانی من لە چیاوە دێن
لە درەخت و گەڵاوە دێن

## چیای خەون

خۆم لە ملی کەنار وەرداو پەنجەکانم تەڕ کردەوە
قەت ئەوەندە مەستی بۆنی خاك نەبووبووم
زەوی تامی ڕەگو ڕیشەی
برینی مێژووی لێدەهات
چرای بەختم هەڵدەگیرساو دەکوژایەوە
ئەستێرەی سەفەری سەختم لێ هەڵدەهات
ئەستێرەی بەختم کەوتە ژێر
کەپکە شاخی خەمێکی قووڵ
تانە کەوتە سەر گلێنەی ئاواتی دوور
ئەی پاساری بەختەوەری
لە دەروونی من غەریبی
بە بەرچاوما ڕادەبوری و بەڵام هەمیشە تەریوی
لەمێژە ئەم سینە تەنگەم
خورپەی گەرمی لە دەماری خۆی نەدیوە
درەختی لێکدانەوەشم
لە ژێر شەختەی ڕێ تەزیوە
ئەی ڕووباری شەپۆل وردو هێمن ئەدگار
پەنجەرەی ڕێگەم بکەوە
گەڵای سەر لقی درەختان
دەرژێنە سەر سینەی بێدەنگو خەفەتبار
گەر لە نهێنی دوا ڕێژگەی خۆت گەیبیا
تەمی گیانی ئەو کەنارەت ئاوەها نەدەشووشتەوە
کۆچی دواییت لە سەرچاوەی خۆت نەدەکرِیو
هەمیشە گۆرانیت دەچڕی

کە هەوری لوتکە دەبینی دەڵێی ئۆخەی!
دیارە دەتوانم ئەم خاکە لە بەخششی خۆم ڕازی کەم
کە تەمی لوتکەش دەبینی دەڵێی ئۆخەی!
دیارە دەتوانم دووبارە
بگەڕێمەوە سەرپشتی لەم خاکە جوان و خەمبارە
من دەزانم ئەگەر هەور بێ یا باران
بەفر بێ یاخود تەمتومان
تۆ هەر وێنەی بەخششی خۆت دەنەخشێنی
کۆترێکی بۆ دیداری داهاتووی دوور دەگمێنی
بەڵام منی مرۆڤی ڕووت!
قەت لەگەڵ تاسەو ئاواتم نابم بە جووت
تروسکەیێ لە ئاسۆدا دەردەکەوێ و دەرناکەوێ
ئەویش ئاواتێکی دوورە، زۆر دەترسم
مەرگی خۆمی پێشکەوێ!

## ئاسوودەیی

گەلێ جار پەنجەی من لە بەفری کۆساران تەزیوە
زریانی ناوەختان هەناسەی بڕیوم
تەمی خەستی لوتکەو بناران
ڕێی داومە هەڵەمووتی سەخت و
کەوڵە پێستی لەبەر دڕیوم
دۆڵایی ڕکی زۆر زنارو خەرەندان
قەتماغەی کۆنە برین و کولی
وەك کرۆسکی شاخان لەسینە ڕنیوم
بەڵام من ئاسوودەم ساڵانێکی دوورە
تاپڕی شکارم دەخوێنێ و
ئاسکێ نەکەوتۆتە بەرماشەی دەستم
کوکوختیش لە سیمای ماندووما
ترس دای نەگرتووەو لە لانە نەجمیوە
کەس بە قەد چاوەی من سێرەی ساو نەداوە
بە قەد من تاوێرو تەلان و هەورازی لەبن پێی نەڕماوە
بەڵام زۆر دڵخۆشم تا ئێستا
مێرگی سەوزو پڕی هیچ نسێ و بنارێ
لە سایەی ئەوینم
کەڵێ خوێنی بەسەر گلیا دانەڕژاوە
ئەوەی من دەبینێکم لە دووررا دەیناسم
هاتووە بروسکم لە چاوان بڵندکا
بۆی بلوێ هەڵۆی نێو هەناوم گڕدەدا
ئەوەی من دەمەوێ چەمو شاخی لەسەر گاڵە دەم
زۆر ڕاوچی وەك منی پێکاوە

گەلێ جار درەختم لە سووتانا دیوە
گۆڕم بۆ پیاوی ڕەند لێداوە
ڕێی سەختم لە ئەشکم بڕیوە
چوومەتە سەرخۆشی عاشقان
لە باتی ماتەمو بێدەنگی
ئاگرم لە پەندور بەرداوەو گۆرانیم چڕیوە
بەڵام هەر چەند جارێ هەڵۆیێ دەبینم
بێدەکرێ و شەلاڵی خوێن دەبێ
پڵنگی دەرروونم سڕ دەبێ لە تاوان
چی بەربەستی ژینە چۆك دەدا
لە بەرامبەر ئەم فرمێسکە گەشەی دەگلێێ لە چاوان

## ئازارستان

هەر سپێدەیەك ڕادەبم
دەمارێ لە ئەژنۆم دەپسێ
هەر نیوەڕۆیێ ڕەت دەبێ
تەڵێ لە بڕبڕەی پشتم
بەناچار ورد و خاش دەبێ
هەر ئێوارەیێ تار دەبێ بە هەواڵێ
چەمێ لە لەشم ئاڵ دەبێ
هەر سپێدەیەك ڕادەبم
جگەرگۆشەییەکم لەشی
پڕ لە پەنجەرەی ئاڵ بووە
هەر نیوەڕۆیێ رەت دەبێ هاوسێییەکم
لە پرسەی ئازیزێکی دانیشتووە
هەر ئێوارەیێ تار دەبێ کوژرانی دۆستێ دەبیستم
هەر سپێدەیەك ڕادەبم
گەڵایێ لە خەونی پاکم دەوەرێ
هەر نیوەڕۆیێ ڕەت دەبێ
کتێبێکی خۆشەویستم لێ ون دەبێ
هەر ئێوارەیێ تار دەبێ
قەڵەمێکی باڵابەرزم شەهید دەبێ
هەر سپێدەیەك ڕادەبم
کارە خەمێ شارەکەی من ڕادەژەنێ
هەر نیوەڕۆیێ ڕەتدەبێ
ئەشقیایێ کەڕەنای مەرگ دەژەنێ
هەر ئێوارەیێ تار دەبێ تیرەمارێ

ژەهری ڕەشی خۆی دەڕێژێ
ناچارم ناچار
یا دەستم بخەمە بەر ئەژنۆی زەمەن
یا بچمەوە نێو ئەو کونجەی
پێکەکانی فێری پێکەنینم دەکەن

## بیـــابـــان

خەم بەسەر خاك و خۆڵەوە
تەم بەسەر وەردی مس ئاسای
نێو بیابانی چۆڵەوە
تەنها تاقە مەلێکی دوور بەسەر خوێنمەوە دەخوێنێ
گەرمای دۆزەخ، کەڵبەی لەگۆشتم گیر کردووە
نێڵەی ئاگر برینی من دەلێستەوە
زۆر لەمێژە خورەی چیا، لەنێو دڵی من مردووە
مەلی گیانم باشووکەیەکە،لە کەرنەك هەڵدەکرۆزێ
تەمتومانی هەورە تریشقە
هەواڵی تازەنەمانی میری زەمانم بۆ دێنێ
نەسێبەرێ بەدی دەکەی
نە پەنایێ دیارە بۆ سێبەر
وەرِسی ئەم بیابانە
هۆنراوەیێکی مەزنە لە لم‌و چەو هەڵکێشراوە
لە پسدانی ئاگراوی تۆزو بادا لە دایکەبێ
لە گەڵ ئازارو شکانەوەی دەروونم
بەرد دەجمێ‌و چیا دەهەژێ
با بۆ دارستان و جەنگەڵی دەڵێتەوە
سەراب بۆ زەوی ئاگری دەگێرِتەوە
من دەبمە سوارێکی نێو تۆزێ غوربەت
ئۆدیسۆس ئاسا دەگەرِێمەوە ئەو شارەی
هیچ کەسێ نامناسێتەوە
ئەوە نەبێ مەزنترم
لەو سوارانەی کلیلی خودایان پێیەو

داستانی دۆزەخ بۆ خەڵك
دەكەنە پەینی چیایی
لە ئاستانەی مێژوودا
بەسەر بەرزترین پەیژە دەوەستم
چی دۆزەخ و خەفەت هەیە
بۆ من پەنجەرەیەكە لە ئاو
چاوی مرواری ئەو ماسییەی تیا دەبینم
كە جوانترە لە تەمەنی هەزار ساڵەو
لە بەژنی درێژی خۆشی
لەو دەستەی لەژێر تەنووری
بوردەگیدا پاڵ دەكەوێ
لەو هەتاوەی لە پاش بارانێكی تووڕە
وەكو كۆرپەیەكی ساوا، لە دایكە بێو دەردەكەوێ
بیابانە هەمیشە بیابان
ڕێگایەكی داخراوە، مەرگاوێزە
وەكو ئەكتەرێ دەوری بێدەوری دەگێڕم
وەكو ئەو سەرە مەزنانەی
بەسەر كتێبەوە بەندن وەكو ئەو سوارە مەستانەی
ساتێ مردوون ساتێ خەیامێكی ڕەندن
هەموو شتێ لەم ملەدا ڕوودەچێت و دەتوێتەوە
تەنها لولاقی تەقەللام نەبێ
لەژێر چەوەوە لێدەداو دادەخورپێ
گەورەترین بروسكەو هەورە تریشقەی ئەم دنیایە
دەبێتە كۆتری ترس و
لەسەر شانم هەڵدەكورمێ
كەنارەكان تەی دەكەم هەمووی

هەر کەناری زیخەو بەردی داغە
کە بیابان لە باتی پشی گەرم هەڵیاندەمژێ
دراکۆڵایە بەبێ وەستانو دوودڵی
نزمترین شەپۆلی ئەم مله
بەرزترین ترۆپکی خوێنم دەمژێ
ئەمە سوورانەوەی ژیانە، یا بە مردن لە خاچدانە
کەناچەیێ دیارنییە، بەسەر سەرمەوە بسوورێ و
ئایەتی شیعرەکانی من لەبەر بکاو
بگەڕێتەوە لێواران
هەژارێکیش دیار نییە،قەڵای ماندوو بوونم بباو
بیکا بە مەقسەڵەی برسیەتی تێواران
ئەمانە هەمووی ئاگری ڕقی منە،
شکایەتی خوێنمە، شکایەتی ئومێدمە.
دەنگی هەناسەم مژدەیە بۆ ئەو بێ دەنگییەی
لە دەروونی خۆتت شاردۆتەوە
جوولانەوەم دەستێکە بۆ تەکاندانت
خەونێکە بۆ ئەو خەوەی
کە هەزار ساڵە هەڵدەکشێو نارەوێتەوە
تۆش ئەی گیانە سەرکێش وتەمە چڕەکەی سەرشانم
گەردووغان پێکەوە بەندەوبەڵام ویستمان زیندووە
سیمرغی خوری تەورێزە
بەسەر شان و ملی مەولانای دڵمانا هەڵاتووە
خوێنم هەر دەبێ بە مەلێ
چاو سوور بکا لە گریاندا
باسی تەختی میرایەتی گیانم بکا
بەسەر خۆڵی بیابانا

هاکا هەموو شتێ سەنگی خۆی لە دەست داو
ئاگر بەربێتەوە ڕەنگەکان
پێکی چاوم بخۆمەوە
ئەوسا دەچمە دوا سنووری مەلەکوتی ئەو فەزایە
چ شتێ لە بینایی ئێستای تەمەنم سافترە
ئەسپی سپی ئەو ئەشقەی من بڕوانە
چۆتە سەر کام کەپکە شاخی بەرزی مێژوو
وەکو ئەو ئاسکە کەسکەی، لەنێو رەوەزێکی سەوزا
هەڵیدەنە ناو سەحرایێ
گۆرانی بۆ بێچووەکانی خۆی بچڕێت و
شێت بێ لە حەسرەت چیایێ
بیابانە هەمیشە بیابان
لە من نێچیر لەویش راوە!
هەموو شتێ چاوەڕوانی مەلە دەکا
لە دەراوی ڕایەکانم
من دوو باڵم
نیوەی دڵم بنیات و ئەشق و ئەوین و سەرخۆشییە
نیوەکەی ترم رمان و ئاژاوەو خەفەت نۆشییە
لەناو شەوی بیابانا لەگەڵ ئەم گەردوونە تاڵە
هەموو شتێ لە بوونی من ناڕازییە
بالیەی شێتانەیە و تروسکەی شمشێربازییە
من دوو باڵم
باڵێکم لەشی ناسکی بەر مانگەشەوی کچێکە
شەهوەت دڵی لێسەندووە
باڵێکیشم کافووری بیابانێکی شەهوەت کوژە
نەخشەی فڕینی یەکجاری

له ڕیشی خۆی هەڵکەندووە
ئەی بازرقەی دەروونی من تۆ دامرکانت بۆ نییە
کێ دەزانێ من لە کام تروسکەی ئازارا لەناو دەچم
لە کوێی مەرزی بەرگەگرتن لەدایکەبم؟
چۆن لە پۆپەی چیای شێتیم وەخوار کەوتم؟
ئەو کاتانەی هەموو پۆلیەی
گەشی برین دادەمرکێن
دەبنە خۆڵەمێشی بەرپێت
ملی بیابان دەتوێتەوەو گیابەند دەڕوێ
منیش دەکەومە نێو چەقی
ملیۆنەها ئارەزووی شێت
خەنجەری لولاقم لە کاڵانی
ئەم بیابانە دەردەکێشم
بەناو پانتایی رادەکێشم، پەنجەرەی بوون
دەخەمە سەر گازەرەی پشت
سەیری خەونەکانم دەکەم
دڵم دەگری‌و دەتوێتەوە
وەکو سمۆرە زیتەکان بە بەرچاوم رادەبوورن،
تۆزێ خۆم لە بیردەکەم
لەم دونیایە کە تاوانی وەکو بەلەمێکی پیرۆز
بە بەرچاوان دەخولێتەوە
ئەوسا کێ دەزانێ کە من لە بیابانا تەنهام و
لە تەنهایی دەبمە شای غەریب و نادیارەکان
شمشێرەکەم وەڕسییە
لە بەرجەستەی خۆمی دەدەم
تەختەکەم برینی لەشە

تاجەکەم سەرکێشی گیانە دەبریقێتەوە
تاوانکاریش ئەو مەسیحە ڕۆح پاکەیە
لە تابووت دەریدەهێنم
لە خاچ و میخکۆیی شەوانی
پڕ نووری خۆمی دەدەم
ئەی خوای ئەم بیابانە چۆلە
کە چۆڵترە لە گۆڕستان
کە چۆڵترە لە ساتی دوای دەست لێکبەردان
گەرمترە لە مەودای نێوان، دوو سینەی ئەویندااران
ساردترە لە ژەهری قسە کە دەڕژێتە
ناو درەختی بەهرەداران
ئێستاکە سەرم تۆپێکە
لە مەیدانی مەرگ دەخولێتەوە
برومیتۆس منم، بەڵام ئاگرم نەدزیوە
بیابانیش ئەو دڕندەیە
کە داڵی تیژو گەردەلوول
لە هەستو سینەم گیردەکاو
خوێنم دەخواو دەخواتەوە
من قەرەجی چۆڵنشینی ئەم هەوارەم
جوانترین گۆرانیو بالۆرەی خۆی دەبێژم
جوانترین شیعری خۆم لە گۆڕی
خەفەتی مێژوو دەنێژم
باسی مردنی خۆم دەکەم بۆ زیندووێتیم
هەموو شتێ لەم بیابانە گۆڵەسەگە
لە قاوغی نێو کپیدا لە خاچدراوە
من و بەردو خاك و خۆڵ و کرمی ناو خۆڵ

دیلن بە دەستی مەداری
یەك گەردیلەو یەك مۆلکیۆل
من و شیعرو مەزنیو شاو هەژارو دۆم
من و خۆم، هەر بە تەنها
یەك یاسا دەمانخاتە دەمی خنکان
دەمانخاتە ناو مەلەوانی قورو چۆم
دەبقیژێنە ئەی وێژدانی
مەلاوی ئارەزووی پاکان
ئەم بیابانە لە زمانی هیچمان ناگا
ئەم بیابانە شەوی درێژی ژیانە!
لە پانتایی ئەم بیابانە ترسبارەدا وەستاوم
وەکو ئەوەی کە بیەوێ بەر لە با بگرێ
گوێ بۆ گۆرانی خنکان ڕادێرێ
یا بەلەمێك رەنگ بکا نغرۆ دەبێ
یا لە هەوادا باز بداو
لە چەقی ئاسمان بوەستێ
لەتاو هاودەمێ باڵ بگرێ
وەکو ئەوەی عاشقی ڕۆژ بێ شەو بمرێ
ئاوەها من لەناو دڵمدا پیر بوویم و
تەمەنم بەسەردەچێ
لە پانتایی ئەم بیابانە ترسبارەدا وەستاوم
لێوەکانم گیای تینوێتیان لێ ڕوواوە
چاوم ئاوەدانی مەرگباری لێنیشتووە
پێیەکانم مووی شەکەتیان لێهاتووە
چۆڵیی هەستم دەسڕێتەوە
ئاوەها من دەگەڕێمەوە پسدانی

ئەم سروشتە ماڵیخوڵیایە
ئەو سروشتەی منی زۆر بە سەختی هێناو
زۆر سووكو هەرزانم دەكڕێتەوە
دەگەڕێمەوە یەكەم زیڕەی لە دایك بوون
ئەی سەرابی مەرگ، ئەی چەوی داغ
ئاسۆی ئەم ئێوارە بگرەو مەهێڵە چیتر ئاوابێ
با هەر لەشت خوێناوی بێ
كەزی ئەم خۆرەتاوە ڕاكێشەو با بێتەوە
مەلەكان بانگ كەوە
با دووبارە گۆرانی تەنهایی بچڕن
من بێزارم لە ئاوابوون
بێزارم لە ڕۆژ بە سەر چوون
من بێزارم لە هەزار جار مردن
هەر بۆ ساتێ لە دایك بوون
گۆڕانێ لە خوێنی مندا هەڵبهێنجە
ئەم كەونە سەرەوژوور كاتەوە بۆ ترۆپك
شەفەقێ لەسەرم گیركە
تاریكایی ئەم زەمینە كوڕكاتەوە
دێوەزمەی ڕاسكۆلینكۆف ی ناو دڵم بێتە سەرچۆك
لەشم بۆتە دوو كەرتەوە
كەرتێكی كێڵكەی وەرداوی نێو ملی هاری بیابانە
كەرتەكەی تریش هەستو نەستە، خۆرو خەونە
سندوقی مەرگو خەفەتی كەونە
من ئێستا نیوەم بیابانە
نیوەكەی ترم بە گۆرانیو گوڵی لۆتس ئاوەدانە
من باڵندەی ئەفسانەییم ڕاستیم لەنێو باڵم ناوە

من نەبوونم هەبوونم لە دڵم ناوە
ئەی (وانی) نێو ملی بیابان
وەرە باسی گیابەندو ڕەزی سەوزو سوورم بۆ بکە
باسی جەنگەڵم بۆ بکە، گەڵای ئارامم ڕزیوە
من بێزارم لەو سیمایە
کە وەك مردووی هەڵوەریوە
ئەی بیابانی ئاوەدان بە سەرابی شین
تۆ لە وەڕسی چنراوی
یا لە داوی درێژی مەرگ؟
کێ دەتوانێ لە خوارکەوتنا
بگا بە ناو سێرەی ئاسمان
لە سەرکەوتنیشا بگا بە ناخی زەوی؟
کێ دەتوانێ وەك من نەرمو بێ بەرد ئاسا
ڕەق بێ وەك ڕوومەتی مناڵ و دڵ ئاسا
حەزم لێیە بەر لە مردن
پەی بە ماهیەتی خۆم ببەم
وێڕای مەلە جوانەکانی (عەتار) کەوم
پرسیار بۆ خاتوو هودهودی خۆم بەرم
ئای چەند سەختە،
چەند گرانە، ژاڵەیە ژەهری هەلایە
بۆنی شەڕو پرسەی مەرگ و شیعری لێدێ
ئەسپی خۆم تاو دەدەم
چەند بچمە نێو ناخی ئەم زەویە خێواوە
ئەوەندە مەست دەبم

تا تووشی شاژنی هەست دەبم
من دەبێ بکەمە دەریایێ
ئاوازی خەمی خۆم بکەمە بارانی سەحرایێ
مۆری ئەو برینەم دەدەم لە قژی تۆ
دەیدەم لە بەردی گەرم، خاك و خۆڵ
سەرابێ ناو دونیای چۆڵ و هۆڵ
لەشی من دوو لەتە
لەتێکیان هەر شەوەو ماتەمی و سێبەرە
مانگ گیران، ڕۆژگیران، بۆ کاروان ڕێبەرە
لەتێکیان هەر ڕۆژەو ئاهەنگو هۆنراوە
باران و گوڵەگەنم و کوێستان و هەتاوە.

## ئاو ئاویترین ئاو

1

چۆن جوانیی تۆ بنووسمەوە؟
نووسینەوەی ئاو کاری خوداکانە
بە ئاوری سینە ناکرێ
داڕشتنەوەی جوانیی تۆ لە ناو
تەونی ئەفسانەیە
بە پەنجەی شکاوی دڵ ناکرێ

2

جوانیی تۆ وەك ئاو وایە
بۆیە منیش تا هەتایە
ناچارم بە دوای ئاوەکاندا بچم

3

من لە هەموو ئاوێکا تۆ دەبینم
چونکە تۆ لە ناو چاوانمای
تازە مەحاڵە جارێکی تر
من ڕوخساری خۆم ببینم

4

هەمیشە بەرەو ئاوەکان دەچم
تۆش هەمیشە لە ناو ئاوەکانی
کە دەمەوێ بتگرمە باوەش
دەبێ بیر لە دەریا بکەمەوە
ئایا دەتوانم باوەش بە دەریادا بکەم ؟

5

تۆ ئاوی بارانەکانی

دەباریتە سەر دڵی هەموو درەختەکان

هەندێ جار وا هەست دەکەم

چی درەختی زەوی هەیە

بە جوانیی تۆوە وەستاوە

6

جوانیی تۆ وەکو ئاو

تینوێتی زەوی دەشکێنێ

بەڵام کە من دەتخۆمەوە تینووتر دەبم

7

کە دەچیتە ناو ئاو

جیاوازییەك نابینم

واهەست دەکەم هەمان ئاوی

دەڕژێیتەوە ناو سەرچاوەی خۆتەوە

8

لە ئاوەکانم پرسیوە، ئەوان خۆیان درکاندیان

تۆ بەڕەگەز سەر بە ئاوی

بۆیە زەینم ڕاگرتووە

ڕۆژ بە ڕۆژ من دەتوێمەوە و دەبم بە ئاو

9

زۆر وڵاتم تەی کردووە و کێوستانم زۆر بڕیوە

بۆ هەر لایەکا چووبم

تۆ هەمیشە لە گەڵما بووی

چونکە ئاوەکان هەمیشە بانگم دەکەن

10

جوانیی تۆ وەك ئاو شلە

بە هەموو لایەکدا دەڕژێی

بۆیەش هەڵمی جوانیت لە هەموو لایەکدا

دونیای غەرقی تەمتوومان کردووە

11

قەدەری من وایە بۆ ئەبەد من تینوو بم

چونکە دەست بۆ هەر ئاوێ دەبەم

وا هەست دەکەم دەبێ تۆ بخۆمەوە

12

من خاکیم و تۆ ئاوی

توانەوەی من لە دەستی تۆدایە

هەڵمژتنی تۆش لە دەستی من

13

لەو ڕۆژەوە تۆ بووی بە ئاو

بیابانی دڵم فراوان و فراوانتر دەبێ

14

تۆ لە کیمیای ئاوێکی تری

ڕەنگت لە ڕەنگی گیا دەچێ

بۆنت لە بۆنی پونگ دەچێ

تامت لە تامی خاك دەچێ

15

هەموو ئەو مەلانەی قوم قوم تۆ دەخۆنەوە

گەروویان بە چرین سووتاوە

باڵیشیان بە فڕین

ڕەنگیشیان بە تەونی ئەفسانە نەخشاوە

16

که باران دەبارێ دڵۆپ دڵۆپ

دەبن بە جۆگەلەی جوانی تۆ

جۆگە جۆگە دەبن بە دەریای جاویدانی

دەریا دەریا دەبن بە مایەی زیندەگانی

17

کەباران دەبارێ دەزانم

جوانیی تۆ هەموو زەوی دادەگرێ

دەزانم ئیدی

جێگەی من لە سەر زەوی نابێتەوە

18

بۆیە دەزانم تۆ ئاوی مانەوەی منی

چونکە کاتێ گەڵای ڕۆحم

تك تك ئاوی لێ دەتکێ

زەرد زەرد هەڵدەگەڕێ

19

دەبێ نهێنییەك هەبێ

بچمەوە سەر هەر لێوارێ

بەهەزار چەشن خۆت دەنوێنی

دەست بۆ هەر لایێ دەبەم

گیانم شەڵاڵی ئاو دەبێ

20

هەندێ جار دەڵێم تۆ لە گیا دەچی

بەڵام کە خوناوی سەر پەلکی گیا دەبینم

دەڵێم نا تۆ هەر ئاوی جاویدانی

21

بەیانیان شەوقێ هەڵدەسێ
دەڵێم ئەوە تۆی ئاوەکان بەسەر دەکەیتەوە
نیوەڕۆیان هەڵمێ بۆ ئاسمان هەڵدەچێ
دەڵێم ئەوە تۆی دەبیتە باران
ئێوارانیش نووریٚ دەکشێتە سەر گلێنەی چاو
دەڵێم ئەوە تۆی دیسان دەبیتەوە بە ئاو

22

من قسەکانت لە ئاو دەبیستمەوە، ئەی ئاو
مەودای هۆشم لێ دەسێنێ
من ڕوخسارت لە ئاو دەبینم، ئەی ئاو
ڕەگی زەینم شەڵاڵی تەڕایی دەکا
ئێستا من جگە لە ئاو شتێکی تر نیم

23

کە پێ هەڵدەگرم لە ئاو نوقم دەبم
کە قسە دەکەم زمانم پڕ لە ئاو دەبێ
کە گۆرانی دەڵێم دڵم پڕ لە ئاو دەبێ
ئەوەندە دەزانم تۆی پەلکە گیای ئاویی
منت لە دۆخی ئەزەلی ئاو ناوە

24

هەموو ئەو خەونانەی من دەیبینم
ئاوەکانم بۆ ڕاڤە دەکەن
کە بەیانیان لە خەو بێدار دەبمەوە
تك تك ئاوی جوانی تۆ
لە پەنجەکانم دەچۆڕێتەوە

25

ڕۆژێ دێ تۆی ئاو
لە وشکاییدا بمخنکێنی
ڕۆژێ دێ منی خنکاو
لە تەڕاییدا زیندووت کەمەوە
26
تۆ ئەی ئاوی من، ئەی تاقانەترین ئاو
گەلگامش نیم بەدوای جاویدانی بگەڕێم
من نەرسیسم بۆ ئەوەی ورد ورد بتوێمەوە
دەمەوێ جارێ وێنەی خۆم
لە ئاوی ڕوخساری تۆ ببینم
27
تۆ ئەی ئاو ئەی تاقانەترین ئاو
کە لە دەراوەکان دەوەستی من لەوێم
کەبەسەر زەویدا هەڵدەڕژێی من لە گەڵتام
کەی لە وەستان و هەڵڕژانتا
دەمدەیتە بەر شەپۆلێکت ؟
28
زۆر جار هەندێ دەنگ دەبیستم
لەسەر ئاوەکان هەڵدەستێ
بەپەلە ڕادەکەم من دەنگی تۆ دەناسمەوە
بەڵام جگە لە خوڕەی ئاو شتێکی تر نابیسم
29
تۆ ئاوێکی حەوت ڕەنگی
ڕەنگێکت دەچێتەوە سەر ئاگر
بەو ڕەنگە دەمسووتێنی
ڕەنگێکت دەچێتەوە سەر با

بەو ڕەنگە بە دونیادا دەمگێڕی
ڕەنگێکت دەچێتەوە سەر خۆڵ
بەو ڕەنگە لە گۆڕم دەنێی
30
سپێدەیەك گوێم بۆ ئاو هەڵخست
بە هێمنی باسی تۆی دەکرد
ئەو کات زانیم من عاشقی کەسێ بوویمە
ئاوەکانی ڕاگرتووە و چاوەڕوانی من دەکات
31
لە ناو هەناوی هەر هەورێکا بیت
تۆ ئاوی هەردوو چاومی
بچیەوە هەر ئاسمانێ
بەسەر مندا هەڵدەڕژێی
32
لەبەر ئەوەی تۆ ئاوی
من مرۆڤێکی ئاویم
بۆ هەر لایەکی دونیا بڕۆیت
دەرەنجام تێکەڵی یەکتر دەبینەوە
33
تۆ ئەی ئاویترین ئاو
جارجار لە بریسکەی شەونمی چیا
تۆ دەبینم تازە دەچیتەوە ناو ماڵی گیا
34
کاتێ دەچمەوە ئاوەکان
لە ڕوخساری ئاویت دەڕوانم
گرشەی حیکمەتێ دەبینم

دەزانم حیکمەتی سووتانە

35

زۆر جاران بیر لە سیمای ئاویت دەکەمەوە
وا هەست دەکەم هەر چوار بەشی زەوی ئاوە
شوێنێ نەماوە من پێی پیا بنێم
چونکە تۆ لە هەموو ئاوەکاندا هەی
بۆیە لەم ئاوە مەیوم

36

ئەی ئاوێنەی ئەبەدی من
نازانم ئاوە جاویدانی داوە بە تۆ
یا تۆی جاویدانیت بەو داوە ؟
وەها کەوتوومەتە ئەو داوە، سەرسامم

37

تۆ ئاوێکی مەندی
دەزانم ڕۆژێ دەمکوژی
تۆ ئاوێکی پڕ دەنگی دەزانم
ڕۆژێ زیندووم دەکەیتەوە
بۆیە من تا هەتایە
جەستەم لە میانی مردن و زیندوو بوونەوەدایە

39

من هەموو بایەکان دەناسم
تۆ بایێکی ئاویت کە هەڵدەکەی
چرکەو سەعات و ڕۆژ ساڵ ودڵی من
هەموو لە ناو قوڕی زەمەن ئاسێ دەبن
کە دەنیشیتەوە
هەموویان بەردەبنەوە ناو زەمەن

40

کە دەچیتەوە ناو ماڵی بەفر

وەك ئاوێکی ڕوون خۆت لەمن دەشاریتەوە

هەموودونیا بۆمن دەبێتە کفن و

سپی سپی دەچێتەوە

41

کە ڕێم کەوتە سەر کوپەڵە سەوزەکانی نێو گۆڕستان

قومێ لە ئاوی جاویدانی تۆم خواردەوە

لەدوورەوە گەلگامشم دەبینی

دەستەکانی بۆ من بەرز دەکردەوە

زانیم ئەوەی ئەو بە دوای دەگەڕێ

تازە قەت نایدۆزێتەوە

42

کە چوومەوە ناو گۆڕستانەکان

لەژێر هەر درەختە گێلاسێ

تۆ ببووی بە گۆمە ئاوێکی شین

زەوی و ئاسمان تێکەڵ ببوون

43

ئەو ڕۆژەی دەستی گوڵەگەنمێکت گرتبوو

ئەی شاجوانی هەموو بەندەرەکان

دونیا هەمووی گەنمڕەنگ بوو

44

ئەوە منیش وا بووم بەئاو

ئێستا پەی بە هەموو نهێنیەکانت دەبەم

ئەوە نەبێ تۆ ئاوێکی پڕ نوور و

منیش دڵۆپە ئاوێکی تەنها و تەنها

هەرجارەی شەپۆلێکی جوانیت
بەرەو دەریایێکم دەبا
ماڵاوا ئەی ئاویترین ئاو ماڵاوا

## ئەوەی پێی گوتم

1

قامیشەڵان بەو هەموو جوانی و هەیبەتەوە
بەو هەموو شەوق ونوورەوە
ڕژاوەتە ناو تەمتومان
خۆی و لەشکری پڕ شیری گەڵاکانی
خۆی و یاقووتی گەردەنی چڵەکانی
خۆی و هەموو سەماکانی
سەری هەڵگرتووە بۆ ئاسمان

2

بۆنی خوناوەی سپێدان
نوقمی ئەوینی دێرینەی کردۆتەوە
لە سێبەرو تەمی تێکەڵ بەفەریکیا
هەزاران کتێب پڕ بووە لە جریوە

3

نەیژەن دەتگوت
بە شەربەتی ئەزەلی چیا مەست بووە
لە سیمای ئاسمانا ڕووچووە
خۆی لە گیاوجۆگە و زەندۆڵان وەردەدا
لە ڕۆخانە و کەناراندا تای ئەوینی خۆی بەردەدا
گۆرانییەکەی جارانی خۆی دەچڕیەوە
وەرە هەر وەك جاری جاران
تاوێ بچینەوە بەر باران
فاتیمە لە کوێی تۆ لە کوێی
باکوور دوورە دوور دادی جوانیت نادا
باکوور سیمات لە بەفر هەڵدەپرووکێنێ

درەختی کاژ شەوقی چاوت هەڵدەپاچێ
خەونەکانت تێکەڵ بە تەمی دۆڵ دەکا
4
نەیژەن هەمیشە تەنها و هەر تەنها
گۆرانییەکانی خۆی دەگوتەوە
کۆنە برینی دەکولانەوە
دەنگی نەی چیای شەڵالی غوربەت دەکرد
هەر ئاگر بوو هەڵدەگیرساو
لەدڵی نەیژەن بەردەبوو
5
لەکوێی فاتیمە تۆ لە کوێی
لە دوورەوە دڵت دەبینم گۆزەیەکە
لە هەزاران جێ شکاوە
ئەوینی چۆڕچۆڕ لێدەچکێ
برینەکانت دەبینم
خوێنیان لێ بازرقەدەدا
6
دەپێم بڵێ تاقە شوێنێ ماوە لە دڵت نەسووتێ ؟
چەند جار ئەڤین دڵی پڕ کردووی لە ئاگر ؟
چەندجار لە تاو ونبوونی جوانی ئاسکان
شەوت بەسەر داهاتووە؟
بە تەنها خۆت ماویتەوە
هێشتاکە ئەتۆ چیت دیوە
تای ئەو ئەشقە تازە بەربۆتە گیانی تۆ
هێشتا سووتان فێری ئەلفێکی نەکردووی

7

جارێ بووە لە نوری ئەو

بینایی چاوت نەمێنێ

جارێ ڕێت کەوتۆتە ئاسمان

تا لە زمانی ئەوین بگەی؟

وەرە سەیری ئەدگارم کە

ئەوسا دەزانی کە ئەشق

چی بەدڵی من کردووە

چۆن منی داوەتە دەست مەرگ و

وڵاتانی پێ تەی کردووم

8

ئەوین نەبا

کەی من لەئاوری فیراقی

ئەزیزانی خۆم دەمردم

وەرە سەیری ڕۆحم بکە

ئەوسا دەزانی کە ئەوین چی پێ کردووم

ئەوین نەبا

کەی سینەم وا کون کون دەبوو

وەرە سەیری سینەم بکە

ئەوسا دەزانی قیبلەی ئەویندارن چەندە دوورە

9

لەدوورەوە مەرکانەی دڵت دەبینم

دەزانم چەند جار شکاوە

چەند جار بۆتە خۆڵەمێش و

بە ناو سینەتا ڕژاوە

10

وەرە گوێ بگرە لە ڕازم

کە درکاندنی مەحاڵە

وەرە گوێ بگرە لە سازم

کە تەل تەلی بەخوێنی پەنجەی من ئاڵە

11

گریانم بوو ئاوی دایە هەورەکان و

خەونی بەخشی بە ئاشقان

گریانم بوو گۆرانی دایە مەستەکان

بەو گۆرانییە خەمگینانە

نەمامی ئەشقی ئەبەدی لەسەر دڵیانا بچێنن

12

زێمارم بوو هەناسەی دا بە غەریبان

لەشکری دایە ئەسکەندەر

تا بە وڵاتان بگەڕێ

شمشێری دایە دەست تەمموز

شمشاڵی دا بە داود و تا دەریاکان بهەژێنێ

باڵی بەخشی بە کۆتران

لە شینایی ئاسمان بفڕن

13

برینەکانت دەبینم چۆن ڕێ ڕێ

بە ناو جەستەتا دەگەڕێن

هێشتا ئەوین چی لێکردووی

دەبا سەرت پێ هەڵگرێ

ئەوسا دەزانی کە گریان چۆن دەتکوژێ

چۆن شامی غوربەت برستی ڕۆحت دەبڕێ

## با ئەی جانانە ترین با

1

بەر لەوەی نوێژی ڕووناکی دابەستی

پێت وتم شەوقی من لەزەوی هەڵناکا

بۆ ئەوەی لەگەڵ با تێکەڵ بی و

بۆ مەملەکەتی دوور بچی

2

ئەوەتا لەگڵی جوانیتا دروست بووم

جوانی تۆش ئاگرەو هەدادانی نییە

3

کەبا هات لێم پرسی بۆ ماندووی

چ شەوقێ ڕایگرتووی بووی بە نوور

بخوردی عەنبەرت هێناوە

یا بەسەر کانیاوی ئەویندا ڕابردووی؟

4

بای ئەزەل ناولەپی کردەوە

بریقەی خۆڵ ڕژا

هەمووی تەرمی جوانی ئەوین بوون

سیس ببوون وەك گەڵا

5

کەس وەك من نازانێ

با کە خەمگین دەبێ

لە کام لا هاتووە

بۆ کام دڵ ڕەت دەبێ

6

بەر لەوەی ژووری تاقانەی خۆت جێ بێڵی

بەرەو ژوورە فراوانەکەی دڵ بچی

تۆ شیری ئەوینت لە ناو بادا هەڵڕشت

تا بەرەو ئەبەدی هەڵبچی

7

ئێستاکە جوانیی تۆ لە بادا ون بووە

دەبێ وەك بەللوری ئەشکەوتان

پڕ تیشکی سپی ببێ

8

دەزانم ڕۆژێ دێ ئەم بایە

رام دەدا بۆ گۆڕێ

ئەوکاتە دەزانی چۆن لەوینی جوانیت

لەگڵی سینەمدا دەچۆڕێ

9

ئەو ڕۆژەی پرچی با

وەك ئاڵتوون لە درەخت گیر ببوو

تۆم بینی لە ئاقیقێ دەچووی

پیرۆزەی شەفەقی لە گەردن ئاڵا بێ

10

سپێدان کە بایێ پەنجەرەی ژوورەکەم

بە پروشەی سەر ئاوان دەڕشێنێ

دەزانم ئەوە تۆی

کە بات ڕاسپاردووە

تۆوی جاویدانی لە ڕۆحما بچێنێ

11

بمزانیایە قەدەر ڕوخسارت دەخاتە ناو بایان

ئەوینم لە بایان لوول دەدا

دەبوومە درەختێ تا هەمووو سپێدان

لە شەوقی جوانی تۆ بکەومە سەمایان

12

ئەو ڕۆژەی کە باکان هەڵناکەن

دەچمەوە بناران

بەڵکو ئێ ڕێژنەیێ بۆنی تۆم بۆ بێنێ

کۆتایی بە کپی قەدەرم بهێنێ

13

دوای تۆ ئەو دڵەی من چەند وێرانە و

درەختەکان چەند خەمگینن

14

چی دەبێ ئەو بایە بۆساتێ وەستابا

لە دەستی پڕ شەوقی خوادا ڕەهابا

یا عەرشی جوانیی تۆ

لە عەرشی نوورانی خوادا جیابا

15

خۆڵی تۆ ئەی پیرۆزەی ساماڵ

خۆڵی ناو چەمەنی باکانە

مەرکانەی دڵی تۆ

مەرکانەی شەڕابی ئەزەلی خواکانە

16

بەرلەوەی تۆ دەرگای ڕۆحی من

بۆ ئەبەد کلیل دەی

بەرەو ماڵی بای دوور دوور بچی
دەمزانی تۆ شەوق و نوورێکی
بەرەو ترۆپك هەڵدەچی
17
ئەو ڕۆژەی بە پەیژەی باو بۆران
لە ناو با دەهاتیە خوارەوە
پاژنەی پێت لە ڕۆحما داگیرسا
ئێستا من بە نووری ئەوینت ئاشکرام
18
تۆ کە بای منیش وەك تۆ
کە دەنووسم هەرگیز ئاوڕ نادەمەوە
هەر ئاوڕدانەوەیەك شووشە شیعرێ
لە باخی دڵم دەشکێنێ
گوڵە پونگێ لە ئاوی خوێنم سیس دەکا
19
مەلێ لە تاقی ئاسمان
لە ناو بادا هەڵکورما بوو
زانیم بە سەر لەپی تۆدا
هێلانەی خۆی هەڵێنا بوو
20
ئەڤینی تۆ وەك با وایە
کە بەناو سەرم هەڵدەکەی
هەناسەی کەون ڕادەگری
بڵێسەی ڕۆحم خۆش دەکەی

21

بووی بە با ئەی پەمۆی ڕۆحی من

بۆیە من هەمیشە بە دوای با ڕادەکەم

ئایا کێ دەتوانێ با بگرێ

ئینسان بێ و خوا نەبێ

22

جوانی تۆ بای هەموو ئاسمانەکانە

تۆی با و وشەی خوا

لە ڕەحمێ کەوتوونەتە خوار

تەنها ڕەحمی جمکەکانە

23

با کە هەڵدەکا ئاوڕ بۆدوا ناداتەوە

تۆش کە بەسەر خوێنما هەڵدەکەی

من لە پێش خۆت نابینی

24

بەر لەوەی لە زەوی بتۆرێی

بۆ بانگی سەد ڕەنگی با بچی

بەر لەوەی کتێبی ئەوینم تورِ هەڵدەی

کتێبی خۆت نایە ناو سینە

تا بە باڵی بادا

بۆتاقە بەرزەکەی دڵ بچی

25

با جار جار گەڵایێ هەڵدەگرێ

تا بیبەخشێ بە نووری ئاو

بەڵام تۆ ئەی بای ئەبەدی من

کە هەڵمدەگریت و دەمبەخشی بە گۆڕ

26

بۆن وبەرامەی هەر بایێکم بۆ هاتبێ

هەر بۆنی گەرمی تۆ بووە

بۆیە دەزانم با جگە لە تۆ

شتێکی تر نییە

27

ناوێرم باسی تۆ بکەم

دەزانم با بە هەموو دونیای دەگێڕێ

بۆیە عیشقی تۆ تا ئەبەد

لە ناو سینەو دڵی مندا هەر دەمینێ

28

لەوەتەی تۆ وا بوویت بە با

من هەر ڕۆژەی لە کەنارێ ئاگر دەگرم

دەزانم ڕۆژێ هەردێ

لە ناو شووشەی بایەکی تووڕەدا بمرم

29

باوەشێ بام توند توند لە ئامێز گرتبوو

هەستم بە خورپەی دڵی تۆ دەکرد

چۆن لە باوەشما خوێنی فڕینی

لە ڕۆحما دەکرد

30

تۆ دەنگی بای

دەنگی هەدادانی باش

لەماڵی نادیاریی دێ

31

لەبەر ئەوەی تۆ لە هەموو لایێ هەڵدەکەی

بۆیە ماڵێکم هەیە لە زەوی

نە دەرگای هەیە نە دیوار

32

زۆر کەڕەتان کە بە شوێن پێی بادا دەچم

زەوی هەموو جێ پاژنەی زیوینی تۆیە

بوونەتە کانی ئاقیق

33

تۆ بایێکی سەختی

دەزانم ڕۆژێ دەخنکێم

ناوێرم هەناسە هەڵکێشم

دەترسم بکەویە ناو سینەم

ناوێرم هەناسە دەمەوە

دەترسم لە سینەم بێیتە دەرەوە

34

بۆ یەکەم جار شەختەی مێژووی چیا گۆڕا

ئاڵەکۆك سەری دەرهێنا

دنیای بینی هێجگار جوان بوو

لەو ڕۆژەوە ئاڵەکۆك پرچی لە خەنە نا

نەوەکا بەفر بیناسێتەوە

دووبارە دونیای لێشارێتەوە

35

کە بەسەر دەریاکان هەڵدەکەی

هەموو پەریەکانی دەریا

خۆیان بە با هەڵدەواسن

کە بەسەر منا هەڵدەکەی
هەموو دەمارە هەڵواسراوەکانم ئازاد دەکەی
36
ئەو ڕۆژەی با
باسی جوانییەکانی تۆی دەکرد
وشەکانی وەکو دڵۆپە شەونم بوون
دەڕژانە سەر گەڵای ڕۆحم
37
کە با بە سووکی هەڵدەکا
دەزانم ئەوە تۆی گۆرانی دەچڕی
کە با بە سەنگینی هەڵدەکا
دەزانم ئەوە تۆی
بۆ غەریبیەکانی خۆت دەگری
38
ئەی نادیارتر لە با ئەی با
وەرە جارێ لە کوختەکەی من بخەوە
تا من بۆ ئەبەد بێدار بم
39
قەدەر هات ئەوینی فڕاندم
تۆی کردە پەنجەی با
پرسیارێکەو دەیکەم
کەمن جوانی دەمکوژێ
کوانێ خوا
40
کە تۆ با بیت
ئایینی من تەنها لەبەر با وەستانە

41

که له ژێر درەختەکانەوە دەوەستم

دەزانم تۆ وەکو با له ناو هەموو گەڵاکانی

ناوێرم چاوم هەڵبڕم

نەوەکا گەڵایێ ببینم بوەرێ

42

بای باکوور دێ

تۆ وەك بەفر

له ناو ئەو بایەدا دیاری

بای باشوور دێ

تۆ وەك ئاو

له ناو ئەو بایەدا دیاری

بای ڕۆژهەڵات دێ

تۆ وەك تیشك له ناو ئەو بایەدا دیاری

که بای خۆراوا دێ

تۆ وەك درەختی پاییزی

له ناو ئەو بایەدا دیاری

43

بمتوانیایە بای هەموو دونیام ڕادەگرت

تا له ڕوخسارت بڕوانم

بەڵام ئاخ با چۆن به من ڕادەگیرێ

که من خودا نیم و ئینسانم

44

با پێی گوتم هێندە به دوای من ڕامەکە

ئەڤینی تۆ مەحاڵێکە

له جەستەی مندا ون بووە

45

هەموو ڕۆژێ دەچمەوە لای بنارەکان

وەکو مناڵێ دەگریەم

بەڵام کە با فرمێسکم دەسڕێتەوە

هەست بە پەنجەکانت دەکەم

46

ئەی جاویدانیترین با

تۆ هێندە بەرز بوویتەوە

دەترسم بووبیتە خوا

### تەنها ئاو وەك ئاو وایە

1

کە بەسەر باڵی بروسکێ، چوینەوە دارستانەکان

قەدەر تازە لەناشتنی تەرمی باران دەهاتەوە

هەرچی ئاشقی کەون بوو

لە ناو گەڵای هەڵوەریوی ڕێ خەوتبوو

2

دۆستایەتی من و باران

دوونهێنی ناو کتێبی ئەوینە

دوو گەوهەری بلورینی

سەر پەنجەی نەرمی عاشقانە

من و باران کاتێ دەگەینە یەکتری

دوای شکانی قاسەی سپی ڕازەکانمان

وەك تەنکە تەمێکی چیایی

شووشەی دڵی یەکتر دەگرین

من و باران ئەگەر لە یەکتر دابڕێین

لەنێو کۆشی ماتەم وغوربەتا دەمرین

3

من و باران لە ئەزەلدا یەك دڵۆپ بووین

بایێ لە باکووری سەرشێت

بە گەڵای زەردی پاییزێ

هات و جیای کردینەوە

هەریەکمانی فڕێدایە سەر کەنارێ

بۆیە ئێستاش کە ئێواران

مەل دەچنەوە لانەی خۆیان

یا کاتێ گەڵا دەوەرێ

دەچمەوە لای تاشەی نوقی ناو تەمتوومان
پێم وایە باران دەبارێ
4
باران باران باران هەمیشە باران
من گریانی کەنارانم
ئەو سەفەری ئاسمانانی
من پیاسەی ئێوارانم
ئەو سترانی سەر هەورانی
5
سەفەری کورتی من و ئەو
نێوان ئاسمان و ڕێسمان بوو
قسەو گوفتاری نێوانمان
شەکری سافی سەمەرقەند بوو
ستران و بالۆرەی دڵمان
بۆ ئاسکی ئەو کەژانە کەمەربەند بوو
6
من وباران ئاخ من و باران
لەسکی ئاسمان لە دایك بووین
لەسەرپشتی ئەسپی بادا ڕامان دەکرد
نیشتمانی ئەبەدیمان
ناو گوڵمەزێ خاك و خۆڵ بوو
دەسرازەمان چیلەی چڵی ئەرخەوان بوو
کە لە شەوانی پاییزی دامان دەکرد
بە بۆنی شەوبۆی هەزار ڕەنگ
دونیامان دیلی خۆ دەکرد

7

خزمایەتی من و باران

دەگەڕێتەوە بۆ دەمێ

کە من تازە لەدایك دەبووم

ئەو پرژایە سەر ڕوخساری ساوایەتیم

هەموو نهێنی ناودڵی خۆی پێ بەخشیم

لەو ڕۆژەوە کێ دەمبینێ

دەڵێ تۆ لە باران دەچی

لە هەرشوێنێکیش کە باران داببارێ

ئەوان منیان بیر دەێتەوە

8

باران هەمیشە باران

چی بینیوە هەموویان دەگێڕێتەوە

باسی بایە دوورەکانمان بۆ دەکاتن

چۆن بە سەر دەریا هەڵدەکەن

لەو شوێنانەی هەرگیز خۆریان ئاوانابێ

هەرچی بۆنی جەستەی جوانی کەنارانە

چی ستیانی تەنگ و تورتی سەر مەمکانە

هەرچی شەوقی پرچی کراوەی کچانە

9

باران ئاوێنەی نەرسۆسە

جوانی دێ و هەمیشە خۆی تیایا دەبینێ

با دێت یادەوەرییەکانی تیا دەنووسێتەوە

باشووکەی قەڵایان بە سەریا دەنیشێ

تا ڕابردووی دووری  تیا زیندوو کاتەوە

عاشقانیش بەگوڕ دەپەڕنە ناویەوە

تا ئایندەی خۆیان لەناو بدۆزنەوە

10

باران تاقانەی پڕ میهرە
سیفاتەکانی ئاگرمان بۆ دەنووسێتەوە
شێلووی کەین لە پەل و پۆی خۆمان دەخات
تەنها ئاوە وەك ئاو وایە

11

من و با  بە ڕەگەز، سەر بە کتێبی بارانین
کەهاتین هەموو گیانمان
پڕ بوو لەو گۆرانییە خۆشانەی
فێری ئەوینی دەکردین
بۆ شکاری میهرو یاقوتی جاویدان
دوور دووریان دەبردین

12

من و با بە ڕەگەز کۆچەرین
لە خزمی نزیکی درەختین
کەمێك جوانی مانگ و
تۆزێ لە ڕەنگی ئاو
هەندێ لە غوربەتی شمشاڵ و
چەند دڵۆپێ خوێنی شەیتانمان تێدایە
کەهاتین خۆمان بە سیوەیلێ سپارد و
ئێمەی دا بە سازو سەمتوورێ
پڕ بووین لەو ئاوازە مەستانەی
بۆ مەعشوقەکانی سەر زەویمان دەچڕی

13

من و با قەدەرمان هەمیشە وێڵبوون و گەڕانە
قەدەرمان دەوار و سەرپشتی ئەسپانە
بۆ هەر لایێ بچم مشتێ با هەڵدەگرم
من لەگەڵ ئەسپی با پشتاوپشت هەر خزمم
هەر با بوو منی دا بە دەمی
ئەو تەنها ڕێگایە
هەر با بوو ئەو هەگبەی شائمی پێ بەخشیم
کە دوێنێ و ئایندەی تێدایە
پڕ بوو لەو سپێدە ساردانەی من و با
پێکەوە سەرمان لە خوناوەی
سەر پەلکی گیا دەدا
پڕ بوو لەو جۆگەلە تەنکانەی
سڵاوی ئێمەیان دەبرد بۆ گوڵەگەنم

14

من و با زۆر دۆستین، بەڕەگەز کۆچەرین
هەندێ جار دەچینەوە سەر ناڵەی ئاشقان
هەندێ جار ڕەچەڵەکمان دەڕواو
دەچێتە سەر خودا
دەبینە ناسیاوی پەپوولەو
دەگەینە پەلکی پونگ
بۆهەر لایێ دەچم ناولەپم
لە شەکری قسەی با
لەپشکۆی دڵی با
لەتامی ماچی با پڕ دەکەم

15

من و با یەك مامان ناوكی ستڕانی بڕیوین

یەك ئەشق وێڵی دونیای كردووین

هەمیشە فەریكێ گوڵەگەنمان لەدەستە

بەدونیا دەیگێڕین

16

من و با هەمیشە دوور دەڕۆین یەكجار دوور

ئەوینێ لە سینەی من و با دەسووڕێ

دەمانباتەوە سەر ئاگری ئایەتێ لە جوانی

هەندێ جار دەچینە ئەشكەوتان

لە كەڤرو زنار دادەمركێین

هەندێ جار لە شووشەی ڕووبارێ

هەندێ جار خۆمان لە دارستان لوولدەدەین

17

من وبا بەڕەگەز كۆچەرین زەوی بەشمان ناكا

هەربۆیە ئاسمانان تەی دەكەین

من و با بۆ پرسەی ڕۆشنی

چووینە ماڵی مانگ و

لەسەرخۆ لە دەرگای مانگمان دا

تابان هات دەرگاكەی كردەوە

كەهەستاین مانگ گریا زۆر گریا

گۆزەی دڵی پڕ تیشكی مانگ شكا

ئێستاكەش بۆ هەر لایێ بچین

پارچەیێ لەو مانگە دەكەینە ئاوێنە

18

من و با خزمێكی نزیكی تابانین

بۆ هەر لایێ بچین پارچەیێ لە دڵی ئەو مانگە
دەدەینە عاشقێ لەبەرۆکی بدا
چوزانم من و با کە چووینە ماڵی مانگ
پڕ بووین لە شیری ژیان
دەفتەری چریکەی مەلەکانمان پێ بوو
کەچووینە ماڵی مانگ
پڕ بووین لە سەدای ئەو
ئاسکانەی بە پەلە ڕایان دەکرد

19

من و با بەڕەگەز مەستیمان لە ترێ هێناوە
ئەوینمان لە ماڵی چۆلەکان هێناوە
ئەوێستاش دەچینە ناو دڵی دارستان
بۆ ئەوەی پارچە پارچەی دڵی ئەو مانگە
ببەخشین بە کۆڕی ئاشقان
بیخەینە کتێبی پڕ خەیاڵی مەستان

## دیل بوون لە گیا

1

ئای کە سەرسامم تۆ بوویت بە گیا

وشەی خوا و گیا

چەند لەیەك دەچن

2

گیا لە سەر دڵم شین بووە

گیا لە ناو لەپم شین بووە

گیا لە سینەم شین بووە

گیا لە ڕۆحم شین بووە

3

من لە تۆ دەتوێمەوە تۆش لە گیا

لێت دەپاڕێمەوە ئەی پەلکە گیا

ئەی تەمی چیا

4

هێندە من ناوت دەهێنم

گیا لەزمانم ڕسکاوە

هێندە سەیرت دەکەم

گیا لە چاوم شین بووە

5

تۆ گیایێکی ئەزەلی

با تێکەڵی ڕۆحت بووە

نزیك کەومەوە وندەبم

ئاو سیماتی نەخشاندووە

ماچت بکەم دەخنکێم

ئاگر تانۆکی جوانیتە

نزیك كەومەوە دەسووتێم

6

گیاكان گۆرانیت بۆ دەڵێن

تۆ لە زمانی گیا دەگەی

بایەكان پرچت شانە دەكەن

تۆ لە نهێنی با دەگەی

7

خەمگینی من لە وەدایە تۆ مەحاڵی

مەحاڵی تۆ لە وەدایە بوویت بە گیا

چۆن بتوانم بتهێنمەوە سروشتی جارانت

ئەی پەلكە گیا

8

جوانی تۆ وەك شیری گیا

وەك وردە مۆنادی ئاقیق

بەسەر زەمیندا ڕژاوە

هەرگیز بۆم كۆ ناكرێتەوە

9

تۆ قەدەری لە لكی گیا

لە گەردنی من ئاڵاوی

تۆ كەمەندێكی گیایی

لە لەسپی ڕۆحم گیر بووی

10

من كە گیام خۆش بوێ

دەبێ تا هەتا بە دوای تۆوە بم

تۆش بە تەنها هەر لە یەك ڕێگا نیت

پێویستم بە نەمریی هەیە

تا هەموو ڕێگاکان تەی بکەم

11

سپێدان تك تك لە سەر پەلکی گیا

تۆ دەخۆمەوە بۆیە ناو سینەم

بۆتە چیمەنی ناو کەلێنی چیا

12

درەنگە شەوان گوێم لە بانگێکە

دەزانم بانگ و هاواری تۆیە

کاتێ بە پەلە بۆ لات ڕادەکەم

جگە لە شنە و کەروێشکەی گیا

چیتر نابینم

13

چونکە تۆ گیای

نیشتمانی من هەمووی گیایە

کەسێ هەیە گیا داگیر کات؟

14

لەو ڕۆژەوەی تۆ بوویت بە گیا

کە لە باڵای خۆم ورد دەبمەوە

دڵنیام لەوەی کەوا ڕۆژ بە ڕۆژ

من کورت دەبمەوە

دەبم بە گیا

15

ئەو ڕۆژەی کە تۆم

لە ناو پاوانی گیادا بینی

بە پەلە ڕامکرد تا بتبینمەوە

بەڵام ئاخ لە گەڵ گیا تێکەڵ بووی

بۆیە دووبارە ونم کردیەوە

16

تۆ ئەو گیایەی

لە هەموو شوێنێ شین دەبیتەوە

بۆیە شوێنەکان بۆمن وەك یەکن

لە باشوور بژیم یا خود لە باکوور

لە ڕۆژهەڵات بم یا لە خۆراوا

17

زۆر کەڕەتان

لە ناودەشتایی دۆڵ و زەنوێران

کەبا هەڵدەکا چاوم دەگێڕم

بەڵام هەر هەموو پەلکە گیاکان

لەناو کەروێشکەی ئەزەلی دایە

چۆن بتناسمەوە؟

## سەناریا تەمێکی دوور دوور

1

ئەفسووس بەهێکان کاڵ بوونەوە
زەمانی ئەوە بەسە رچوو
بەسەر پشتی ئەسپەوە پەرییەکان هەڵگرینەوە
بەسەرچوو لە ئاوابوونی خۆر
سەیری شەوقی جوانیی بکەین
بەسەر ئاوەکان بوەستین
باوەشێ گوڵ بۆ سەناریا بەرینەوە

2

بەسەرچوو
بەدیار شووشەی شکاوی عاشقان
دانیشین ئەشك برێژین
بەیادی خەونی بە سەرچوو
شەرابی ئەفسووس بچێژین

3

ئێستاش هەروا بەدیار ئاسۆوە دانیشتووم
چاوەڕوانی هاتنت دەکەم
هاتنێ تازەم کاتەوە
شەڵاڵم کا لە شەوق و نوور
ئێستاش هەروا
داوداو تیشکی ئاسۆ دەچنم
وا دەزانم هەندێ قسەی پڕ نارنج و
هەندێ بزەی سەر لێوی خۆتم بۆ دێنی
ئێستاش هەروا بە دیار ئاسۆوە وەستاوم

وادەزانم ئێستا نا ئێستا دێتەوە
ناوی ئەزەلم بۆ دێنی
4
تاریك داهات هەر نەهاتی
مەل گەیشتنەوە کەناران هەر نەهاتی
ئاسك چوونەوە بناران
پاییز گەڕایەوە ناو ساڵ هەر نەهاتی
5
ویستم لەگەڵ باوەشێ با و چەپکێ سەمای جاویدانی
هەندێ تەمی بناران بێم
ویستم کە بێم ناو لەپم پڕ بروسك بێت
لە ڕووناییدا غەرقت کەم
ویستم کە بێم لێوەکانم پڕ پشکۆ بێ
دڵت گەرم بکاتەوە
6
بەڵام ئەفسووس کە گەیشتم
تەرمی سپی نیشتمانی خۆمم بینی
لیمۆی سیسی کوڵمی کچەکانم بینی
هەموو ڕێگاکانم ون کرد
هەردوو ئەژنۆم شل هەڵگەڕان
بیناییم وەك بێ ناو ئاو لەرزی
گەڕامەوە چاوەکانم ڕەش داگەڕان
7
لە نامەیەکی بە پەلەی تەڕی باراندا خوێندمەوە
ئاگری ناو سینەی ئاشقەکان کوژاوەتەوە
هەرگیز داناگیرسێتەوە

8
سەناریا ئێستا گوڵە گیایێکە
لە ژێر بەردێکی سپی
بۆنی خۆی داوە بە مەلان
جەستەشی داوە بە خاك
ئەوە لەو کاتەدا بوو کە تازە مانگ
خۆی لە لەپی منا دەشووشت
9
من ئەو کاتە منالێك بووم
لە نێو تەمی چۆل و بەڕیا
نوورێك بووم لە کووپەی دڵی سەناریا
حەسرەتێك بووم لە سەر پەلکی گیا
10
ئەفسووس
شوێن پێمان لە سەر کەناران نەماوە
بروسکێ هات
کووپەی دڵی شاژنی خۆرەتاوی شکان
میهر ڕژایە سەر زەوی
ئەڤین بوو بە سابات و چەتر
زەوی پڕ بوو لە گەوهەری نوور
گەڵای هەڵڕژاوی عەتر
11
ئەودەم تازە فەریك لەژێر تاوێرەکانەوە
سەری دەردێنا
تازە پەڕسێلکە دەهاتنە ناو ژووری قوڕین
خودایە ئەوە چ تەڵسمێك بوو بۆم ناکرێتەوە

ئەوە چ میهرێك بوو ڕژایە زەوی
تازە بۆم کۆناکرێتەوە
12
ئەم دایگرتم ئەگەرنا دەچوومەوە بناران
کەمێك بەدیار گێلاسەوە رادەوەستام
باسی بارانم بۆ دەکرد
چۆن لە تەمتوومان هاتەوە
دەچوومەوە لای ئاشقەکان
قومێ ئاوی بەردەنووکی
کۆترەکانم بۆ دەبردن
13
تازە بە ئاسۆ ڕاناگەم تا بڵێم کەمێ بوەستە
هەتاکو ئاسك دێنەوە
پرووشەم ناردۆتەوە لای با
ڕووناکی بێنێ بۆ چاوم
هودهودم تێ گەیاندووە
هەواڵم بداتە باران
بۆنی ئەوم بهێنێ
14
ئێستاش درەنگە نازانم
قولینگ بێرە تێدەپەڕن
یا ئەوانیش لەناو تەمتومان ون دەبن؟

## بەفری بەفران

1

من بەو ئاگری ئەشقەوە

چۆن لە تۆ نزیك كەومەوە

كەدەزانم بە هاتنم دەتوێیتەوە

2

ئەی بەفرو نوور

تۆ شەوقی یا تیغی بەللور

ئاوا لە یەكتر ئاڵاون

3

مەحاڵی من لەوەدایە

تۆ هەمیشە لە ئاسمانەوە دێی

منیش هەمیشە لە زەوی

ئەوینم سەختە خودایە

4

ئەی بەفری جاویدانی من

تۆ گەردەنی یا شمشێری؟

منت لەسەرسامی دیل كردووە

5

دڵنیام لەبەفر بەفرتری

بۆیە من بەرگەت ناگرم

كە من بە ئەوینی تۆ ئاگرم

6

ئەی دوورترین سپیاتی بەفر

چیاو بەندەنی زۆر هەیە ، بۆ دڵمت داگیر كردووە؟

7

لەوەتەی تۆ بوویت بە بەفر

من جگە لە سپیاتی هیچی تر نابینم

8

کە دەباریت

ئەی شای ناو ئەتڵەسی سپی

دونیا دەبێ بە بەستەڵەك

منیش ئاگر

## تۆ هەمیشە تۆ

1

من هەمیشە بەدوای تۆدا

دوور دوور دەچم

تۆش هەمیشە هەر لێم ونی

لەناو ئاوەکاندا شەپۆلێکی

لەبەرایی لافاودا

لە ناو ڕەوزەکانیشدا

لوتکەیەکی لە پێش هەزاران هەزاردا

لە شەوانی مانگەشەودا

ڕەوە کەروێشکێکی سپیت

لە ناو جەرگەی تەمتوماندا

لە ناو زەنوێرەکانیشدا

گوڵە پەمۆیەکی تری

لە ناو گەلەی ئاسکاندا ڕێبەرو

لەناو گەڵای پاییزیدا تۆ

لە هەمووان زەردتری

2

ئاخ من هەمیشە بۆ هەر لایێ

بەدوای تۆدا بگەڕێم

تۆ لە هەموویان دوورتری

قەدەرێکی بۆ ئەبەد لە من ڕادەکەی

بارانێکی هەرگیز بەسەر منا ناباری

تۆ بایەکی ئەزەلیت و

قەت بەسەر مندا هەڵناکەی

3

من هەمیشە بە دوای تۆدا

دوور دوور دەچم

تۆش هەمیشە هەر لێم ونی

کە با هەڵدەکا

تۆ کراسی هەورت لەبەرەو

لەبەرزاییە دوورەکانەوە

بۆ باکووری دوور دوور دەڕۆی

کە دارستان دەرگای پاییز دەکاتەوە

تۆ پێشەنگی گەڵا ڕژاوەکانی

کە ئاگرێ دادەگیرسێ

تۆ پشکۆ و پۆلیەکانی

4

من هەمیشە دوور دوور دەچم

تۆش هەمیشە هەر لێم ونی

کە خۆر هەڵدێ

تەنکترین داوە تیشکی گزنگانی

کە شەو دادێ تۆ یەکەمین ئەستێرەی

هەموو ئاسمانەکانی

کە ئێواران مانگ لە دوورەوە بانگم دەکات

دەزانم ئەوە تۆی چوویتەوە

ناو سەبەتەی جاویدانی

ئاخ ئاخ تۆشوێنێکت نەهێشتۆتەوە بۆمن

منیش جگە لە دڵم

شوێنێکم نییە بۆ تۆ

5

من هەمیشە دوور دور دەچم

تۆش هەمیشە هەر لێم وونی

زستانان لە ناو باراندا

ماڵت بۆ خۆت چێ کردووە

هاوینان لەناو شنەدا

بەهاران گیات لەجەستەی خۆتا لوولداوە

پاییزان گەڵای ڕژاوی

6

من هەمیشە دوور دوور دەچم

تۆش هەمیشە هەر لێم ونی

کە دەچمەوە ناو بەرزاییەکان

تۆ لە بناران دەبینمەوە

ئاگرو پووشت هەڵکردووە

کە بۆ بناران دێمەوە

تۆ لە بەرزاییە دوورەکان

دونیات پڕ لە نوور کردووە

قەدەری من مەلەیە لە ئاوی سەراب

یا مەست بوونە

لەناو پونگی هەزار ڕەنگی گۆزەی شەراب

7

هەموو ئەو سەفەرانەی من دەیکەم

بە تەمام تۆ بدۆزمەوە ئەی زێدی هەتاهەتاییم

تۆش هەتا دێ دوور دەبیەوە

لە شوێنێ ئۆقرە ناگری

8

لە هەموو عەترێکدا تۆ هەی

ئەی ڕەزی مەی

لە هەموو شمشاڵێ نەوای نەی

ئەی باخی نەی

لە ناو هەموو گوڵە پونگێدا سەمای

لە هەموو بەفرێکدا گیای

تۆ تەیمانێکی لە وەهم

لە هەموو تەیمانێکدا جیای

تۆ تاقانەترین خەڵقەندەی دەستی میهری

9

بە هەر شوێنێدا ڕەت ببم

من شوێن پێی تۆ دەناسمەوە

دەزانم کام گوڵە کێویلەت چنیوە

کام کرۆسکت

لە درەختی ئەوینی مندا ڕنیوە

سەیری کام ڕێژنەت کردووە

کام مەلی ئاو لە سەر پرچی تۆ نیشتووە ؟

ئاخ چەند ماندووم

10

تۆ مەلی ناو ئاوەکانی

خووت بەکەناران گرتووە

تۆ شەرابی ناوگۆزەی هات و نەهاتی

قومێکت زەوی مەست دەکا

تۆ گەوهەری ناو کووپەی بن دەریاکانی

بریسکێکت دونیا شەڵاڵی نوور دەکا

11

تۆ لە هەموو شوێنێکا

دەنگی دەف و شمشاڵ و نەی

لە سەر هەموو درەختێکا گەڵای میهری

لە ناو هەموو ئەشکەوتێکا

قەددیسێکی جوانی پەرستی

لە ناو مەیخانەکانیشدا ساقی و مەی

ئاخ من بەرەو کام ڕێ لادەم

بیمە دەروێشی ئەوینت

یا پیاڵەی مەی لە نووری دەستت وەرگرم؟

## نە شەوقت دیارە و نە سیما

1

بۆ نهێنی خۆتت لە گیانم بەرداوە

من تەنها بەندێکم

کەسێك نیم پەیامێکم هەبێ لە خواوە

2

لەبەرزی لوتکەیێ تۆ نووری

لەدامێنی قووڵی غەمزەیێ

تۆ ونی

3

نە شەوقت دیارەو نە سیما

ئەو ئەشقەی من چییە

واگڕی گرتووە ئەی خودا

4

زۆر جاران تۆ لە بای

کەم جاران من لە با

دوا جار تەونێکین لە نەوین

نە من با و نە تۆش با

5

وامزانی دونیات بۆ گەڕاوم

نەمزانی هەر لە جێگەی یەکەم دیدارتا ماوم

6

تۆ ئاخ تۆ تەمێکی چەند سپی

تۆ ئاخ تۆ شەوێکی چەند درێژی

تۆ ئاخ تۆ نە ڕەشی نە سپی

7

پێکەوە بۆ فەنا ڕادەکەین

من بۆ تۆ

تۆش لە من ڕادەکەی

8

تۆ سەختی وەك ڕەنوو کە دەڕمێ

تۆ سادەی وەك بەفر کە دەبارێ

9

ئێستا من تۆ وەك با دەناسم

وەك باران دەتبینم

10

دەزانم تۆ نە بای نە من با

بەڵام هەردووکمان لە ناوباین

یا مەستی مەیخانەین

یا هەردووکمان لەناو شەوقی ڕەهاین

11

بە دواتا زۆر ڕامکرد

لە گەڵ گیا تێکەڵ بووی

چۆن تۆ بناسمەوە

12

تۆ وەك مەی چەند من بتخۆمەوە

زیاتر دامدەگری

13

ئۆف ئۆف شەو چەند درێژە

ئارامم چەند کورتە

14

که دڵم دادەگیرسێ

دوکەڵی ئاگری ناودڵمی

که خامۆشه تۆ ئاگری

15

خۆر هەڵدێ و تۆ ئاوا دەبییەوە

تۆ ئاوا دەبیت و خۆر هەڵدێ

16

ئەمان شەوقت چەند ڕوون و نزیکە

دڵی من چەند دوورە

ئەمان ئەمان دڵی من چەند نزیك

شەوقی تۆ چەند دوورە

17

ببوورە ئەی ڕۆحم

که قسه بۆ کەسێ دەبێژم هەر خۆتی

تۆش ئەی خۆم ببوورە

18

که هاتی من زانیم بۆ ئەبەد ون دەبی

که ڕۆشتی من زانیم بۆ ئەبەد لام دەبی

19

له میانی من و تۆ نه زەوی دیارەو نه ئاسمان

له میانی من و تۆ

یەك ئاگر دەسووتێ

وەك شەونم دیارە

ڕووناکیم بەشی تۆ ناکات

## ئاشکرایی من و نادیاریی تۆ

1

درەنگە تازە

بەم خۆراوا بوونە ناگەمەوە جێ

ڕووناکیم بەشی ڕێ ناکات

بڕستم لەبەر بڕاوە

تەنها ئەوینی تۆ نەبێ

هیچ شتێکم پێ نەماوە

2

ئەوینی تۆم بەسە

بۆ ئەوەی هەزار ساڵ بژیم

3

تۆ هێزێکی لە ئاو

ئاوێ لە ئاسێترین چیا هەڵڕژێ

جوانیت لەو هەڵڕژانەیە

4

بۆ هەموو دونیا ئاشکرات کردووم

ئاشکرایی من و نادیاری تۆ

شووشەی دڵیان

لە قەفەزی سینە وردوخاش کردووە

5

هێندە سەیری شەوقی هەڵچووی تۆم کردووە

بینایی چاوم کز بووە، هێند لە تۆ ورد بوومەتەوە

شمشاڵی زمانم شکاوە

ئەوەتە با و تەمتومان بەدونیا دەیگێڕن

6

ئەوەندە لە تۆدا گەورە بووم

واهەست دەکەم جێم لە زەوی نابێتەوە

بۆیە ئاسمانان تەی دەکەم

7

من ئاشکراو تۆ نادیار

ئاشکرایی من شەوقی جوانی تۆیە

نادیاری تۆ کزیی چاوەکانی منە

7

من هاوار و تۆ بێدەنگی

بێدەنگی تۆ ڕاکردنە لە بوونم

هاواری من توانەوەیە لە بوونت

کەی دەگەینەوە یەکتری ئاخر کەی

8

ئەو دەمەی تۆ خۆت و باوەشێ بای تووڕە

بەرەو لای من هەڵدەکەی

من ماڵم بردۆتەوە ئاسمان

مەگەر لەوێوە جار جارێ

وەك پەیکێ دوور دوور هاتبێ

ڕێگەی نەهاتی بڕیبێ

ڕۆحم داکشێتە خوارێ

ئەوینم وەك گەڵای پاییز بەسەر ڕۆحتا

بەسەر تەڵ تەڵ پرچی کاڵتا داباریێ

9

ئەی جوانتر لە پەلکی هەنار

ئەی باوەشێ گیای چیا

ئەی پووشی زەرکفتی ماندوو

ئاوا بوو

ئاهورا

1

ئەوەندە بەتوندی لە دڵی خاك مەدە ئەی دۆست

سارای ساردو پەتای غەریبی دەتکوژێ

ئاهورا گوتی غەریبیت دەکەم ئەی خاك

دەترسم دڵت کون کون بووبێ

2

نەکەسم بۆ دروست دەکرێ و

نەدەستم بە سەر کەسێ دەشکێ

ئاهورا گوتی ئەوەی پەندم

لەناو ڕۆحی خۆی هەڵگرێ جاویدانە

ئەوەیش دەیداتە دەست با

هەر ساتێ لە پەنا بەردێکا دەمرێ

3

ئەسپەکان بەیەکەوە بەسەر گردەکانەوە

خۆیان داوەتە بەرخۆر

بە چاوە ڕەش و جوانەکانییان

هەمیشە سەیری خۆر دەکەن

ئاهورا گوتی ئەسپەکان

یادگاری خوان لەسەر زەوی

بۆیە هەمیشە من و ئەسپەکان

سەیری خۆر دەکەین

4

ئێمە لە دوا ڕۆژەکانی ئایندەوە هاتووین

بوونێکی بێ ڕابردووین

ئاهورا دەیگوت:

مرۆڤ بێ ڕابردووترین بوونەوەرە ,
کە لە ئایندەوە
بەرەو ڕۆژە سادەکانی مێژوو دەگەڕێتەوە
5
کە بەدیار گوڵە پەمۆکانەوە وەستام و
سەیری گۆڕستانەکانم دەکرد
من چیم ؟ گوڵە پەمۆ هاتە زمان و گوتی ..
ئێوە مرۆڤن
مرۆڤیش هەمیشە داس تیژ دەکاتەوە
6
ئاهورا لە نێو ئاپۆرەی مرۆڤدا
کەمێ وەستاو سەیری خۆرەتاوی کرد
لە بەرخۆ دەیگوت مرۆڤ دەتوانێ
هەمووشتێ پاك کاتەوەو
وەکو خۆر بریسکێتەوە
بەڵام ئاخ هەرگیز ناتوانێ
ناودڵی پاك کاتەوە
7
با من هەر پاشای سەر زەوی و
خوا پەرستێکی بودایی بم
با عاشق بم یا عابیدێکی ون لە ملی بیابان
یا نووریێ بم لە چاوی میدیا
لە کۆتاییدا من هەر مرۆڤم و
دەبێ پێم لە سەر زەوی بێ
ئاهورا دەیگوت
من بۆ فڕین نەخوڵقاوم

8

که بەناو دۆڵی هەزار ڕەنگی

ڕەوەزێ شاخ شۆڕ بوومەوە

هەرچییەکم بینی سەرسام و شڵەژاو ڕادەپەڕی

ئاهورا گوتی ئەی مرۆڤ تۆ چەند نەزانی

خۆمان نەبێ

هەموو دەزانن چنگی ئێمە خوێنی لێدەچۆڕێ

ئێمە پێویستیمان بە ئاوێنەیەك هەیە

دەروونی خۆمان ببینین

دڵمان پڕە لە ڤین , چاومان پڕە لە ماخۆلیا

کەچی ئەوەندە بێ هێزین زوو زوو دەگرین

9

که بە سەر ئەو کەڤرە کون کونەی

لە ڕۆحی مرۆڤ دەچوو

هەزاران هەزار ساڵە

کەوتبێتە بەر تیری گومان

من بەرەو ماڵە گەورەکەی تۆ دەچووم

ئاهورا گوتی:

شەکەتی پیشەی ڕۆحە

10

پاییزێکی درەنگ بوو درەنگ

تاك تاك گەڵا بە سەر لق و پۆپی درەخت

فرمێسکی خۆیان دەسڕیەوە

لە ناو پەرستگاییێکی شاخاوی و

گومەزێکی زیوساماڵی

دەستکردی باو ڕەشەبا بوو
مرۆڤێك چڵە گیایێکی وشکی داگیرساند
ئاهورا گوتی:
مرۆڤ هەمیشە ئاگر دادەگیرسێنێ
بەڵام تا ئەبەد خامۆشی ناکاتەوە
ئەی مرۆڤ ئەگەر لە پەرستگای
پیاو بە خۆت دابگیرسێنە
با تاریکی هەزار ساڵەی دڵت کۆتایی بێت
11
دێ و دەڕوا هەرگیز ناگەڕێتەوە
زەمەن گەڕانەوەی بۆنییە
ئاهورا دەیگوت:
بگەڕێتەوەش بۆلەوەیە
تەرمی ساڵ و مانگەکان هەڵگرێتەوە
زەمەن هەرگیز ئاوڕ ناداتەوە
ئەگەر ئاوڕیش داتەوە
بۆ ئەوەیە مرۆڤ بزانێ
زەمەن ماڵاوایش ناکات
زەمەن و مرۆڤ دووخەنیمی یەکترین
ڕۆژێ یەکێ ئەویتر هەر دەکوژێ
12
منالان هەموویان کۆبوونەوەو
لە سەر خۆڵ وێنەی باوکیان دەکێشا
بەڵام هەر زوو ڕەشیان دەکردەوە
ئاهورا دەیگوت منالان بەر لەوەی گەورە بین
وێنەی ڕاستەقینەی خۆیان دەسڕنەوە

13

سپێدە زوو لە دارستانەکەدا

قومێ لە ئاوی کاژی خواردەوە

دانەیێ گێلاسی سووری ڕنی و ئاوای کرد

وەبیری هاتەوە ئاهورا

گێلاس ڕەنگی خوێنی هەیە

لەو ڕۆژەوە دونیا پڕ بووە لە پەڵەی خوێن

ئاهورا دارستانی جێهێشت

بۆ ئەبەد نەگەڕایەوە

14

کاتیش بە سەر چوو ئەی مرۆڤ

هەموو ساڵ و مانگەکانیش بەشی تۆیان نەکرد

چەند ڕابکەی ناتوانی بگەی

تۆ زۆر بچوکی بەڵام

ئەم کەونە جێگەی تۆی تیا نابێتەوە

ئاهورا دەیگوت:

تەنها بە چەند مشتێ خۆڵ نەبێ

چاوی مرۆڤ هەرگیز پڕ نابێتەوە

15

ئاهورا دەیگوت: لەو ڕۆژەوەی من و تۆ

لە یەکتری لە بۆسەداین

کتێبی حیکمەت داخراو

حەکیمەکان چوونەوە ئاسمان

مرۆڤ ئێستاکێ بێ حیکمەت بە سەر زەویدا دەسوڕێتەوە

کتێبی عەزاب دەنووسێتەوە

من ئاهورام یا سالوکێکی دارستان ؟

هەندێ جار ئاهورا خەمبار دەبێ
مشتێ گەڵای ووشك دەخاتە سەر لەپی خۆی
مردنی بەبیر دێتەوە
گۆرانییەكانی جارانی خۆی دەڵێتەوە
ئاهورا هەمیشە لە خەمباریدا
بە مەرگ دڵی پڕ دەبێ لە گۆرانی
بە گەڵای تەڕ دڵنەوایی خۆی دەداتەوە
17
ئاهورا لە نێو تەمتومانی مرۆڤدا
نە بە باكووری دەزانی و نە بە باشوور
نە پەی بە خۆرهەڵات دەبرد نە خۆراوا
ئەو هەمیشە دەیگوت:
ئەوەی چارەنووسی مەبەست بێ
دەبێ لە تەمتوومان بژی
18
كە دابەزیمە ناو تەمتومان
ئەستێرەكان بە ئاستەم دیار بوون
ڕووبارەكان وشك بووبوون
درەختەكان شكان و
ڕێگاكان كوێر بووبوونەوە
چی بكەم
بگەڕێمەوە جاری جارانم یا بوەستم ؟
گەڕانەوە مردنە وەستانیش مردنێكی دی
خۆم هەڵبژاردو شووشەی تەمتوومانم شكاند
لەو بەرەوە خۆر تازە گزنگی دەدا

19

لەبەر بارانێکی توندو زریانێکی سپی سپی دا

ئاهورا وەستاو هاواری کرد

ئەی باران لەمێژە خاك لە چاوەڕوانیتا

ئامێزی خۆی کردۆتەوە

بەلەز هەڵمەکە ناو ڕۆحی نەوەکا لە خۆشیا بمرێ

ئەی زریان لێگەڕێ با قامیشەڵان

شمشاڵی خۆی بچڕێ

ئاخ مرۆڤ هەرگیز گۆرانی خۆی پێ تەواو ناکرێ

باران بە پەلەیەو ناهێڵێ

بۆنی خاك بەردەوام بێ

20

ئەوانەی دەوری ئاهورا دەدەن هەرگیز نازانن بپرسن

بۆچی زمانیان لاڵ دەبێ و دڵیان دادەخورپێ

لە پای چییە نوور لە چاوانیان هەڵدەچێ

بەڵام کە ئاهورا ون دەبێ

دەزانن بۆ دەستیان شل دەبێ

ئاگری دڵیان خامۆش

بۆچی خوێنیان ئاوا  بە سستی دەسووڕێ

ئەوان نازانن ئاهورا

وەهم و ئەندێشەی نوورێکەو بەس

21

بەناو کێڵگەکاندا کە تازە لە سەرەتای بەهار

گوڵەگەنم قسەیان لە گەڵ ئاسمان دەکرد

ئاهورا وەستاو گوتی

ئەوانە چەند بە پەلە سەردەردێنن

نازانن  پەلەی مەرگی خۆیان دەکەن
لەژێر داسی دەستی مرۆڤ
چەند گوناهن
گوڵە گەنمە جوانەکان توخوا پەلە مەکەن
دەمەوێ بۆ ئەبەد لە ناو چاوم بن
22
لێرەوەیە دەست پێدەکەی
لە هەمان ئێرەوەشە کۆتاییت دێ
تۆ دەبێ لەسەر ئاو بنووسی بۆ ئەوەی نەمر بیت
ئاهورا دەیگوت:
ئێمە نووسراوی سەر ئاوین ئاو
ئاویش وەستانی بۆ نییە
هەرحەرفێکمان دەباتەوە نیشتیمانێ
نهێنیەکانیشمان دەدا بە خۆر
23
ماڵی ئاهورا لە قوڕەو سەربانیشی لە گڵی سوور
دیوارەکانی لە خشتی بخوور
کەخۆر لە کای ناو دیواری دەدا وەکو زێڕ دەبریسکێتەوە
ئاهورا هەمیشە دەیگوت:
دڵی هەمووومان لە قووڕە
ئەڤین لە ناو شووشە ناژی
لە ناو قوڕی دڵمان نەبێ
24
لەو گەڕانە دژوارەدا تۆ وەك چڵێکی شکاوی
بەدوای پارچەکانی خۆت دەگەڕێی
ئەی مرۆڤ تۆ چەند ماندووی

زەمەنێکی زۆرە تۆ ونی لەکوێی؟
ئاهورا گوتی کە مرۆڤ شکا
ئیدی هەرگیز یەکتر ناگرێتەوە
25
لە تاریکە شەوێکی زستاندا ئاهورا کەوتەوە یادی
مەرگی دارخۆخێکی سەوزو دایە پرمەی گریان
لەژێر ئەو دار خۆخە بوو خەوم بە تۆوە بینی
لەژێر ئەو دار خۆخە بوو چەپکێ نوورم چنی
لەژێر ئەو دار خۆخە بوو قومێ ئاوی عیشقم خواردەوە
دەستی مرۆڤ بوو چووە خوێنی پاکیی
26
لەدەم ئاگردانێکی کز
پۆلیە گڕێکی ئاشق دەسووتا
دووکەڵێکی سپی سپی لێ هەڵدەسا
کزەی جەرگی بوو لە تاوی ئەوین
لە هەر شوێنێ دووکەڵی سپیتان بینی
شەوقی ئەوینی منە هەڵدەچێ یا هی عاشقان
27
ئەو ساتەی کەلە گەڵیا بووم
دەمبینی دڵۆپ دڵۆپ دەبێ بە ئاو
هەڵدەڕژایە ناو ئاگری دەروونمەوە
چاوەکانم پڕ نوور دەبوون
کە ون دەبوو چرای بیرم دەکوژایەوە
28
بەسەر جۆگەلەیێکی زولاڵ دا وەستام
سەیری تۆم کرد

تۆ لە هەمووشوێنێ بووی
کە مەڵ ئاوی دەخواردەوە
دڵۆپ دڵۆپ نووری خودا
لە باڵەکانیان هەڵدەسا
کەدرەخت دەمی لە ئاو دەنا
گەز گەز باڵای دەگرت
بەردێ خزی ڕووناهی جۆگەلەی کوشت
ئاهورا گوتی
دەچمەوە دارستان خوا لە شوێنی شێلوو ناژی
29
خەریکە خۆر ئاوادەبێ ئاهورا
گەوهەرێ لەرۆحت بشکێنە بیدە بەخاك
بادەمێ لەبریسکەی خۆت ببەخشە بە ڕۆحمان
جریوەیێك لە زمانت  بدە بە دڵ
ئێمە لە ناو تەونێکی ئەبەدی
چاوەڕوانی هودهودێکی نورانین لە تۆ
تۆش وەکو سێبەرێ لە ئارمووش
یا وەك بایێ لەئەڵماس
بە ناو خەیاڵمانا ڕادەبووری و
بۆ ئەبەد ناگەرێیتەوە
ئاهورا زووکە وەرە ژیان پێویستی بەتۆیە
وەرە بەر چاوی ئینسان بکەوە

30

ئاگر لە ناو دڵ دامەگیرسێنە
دڵ جێی ئەوینە
لەبەر بادا ڕازی خۆت هەڵمەخە
شارەوشار دەڕوا
بەدیار کتێبەکانەوە مەوەستە
بیانکەوە با گەوهەرە دیلەکان ڕەهابن
کەشیعری جوانت خوێندەوە
ئەوسا دەزانی عەشق چی لەدڵی شاعیر کردووە
ئاهورا گوتی ئاهورا

## بەرهەمەکانم

- لە 1955 لەشاری هەولێر لەدایك بووە
- لە ساڵی 1978 ەوە دەستی بە کاری نووسین و بڵاو کردنەوە کردووە
- ئامادەیی بەشی ئەدەبی لە هەولێر تەواو کردوە
- کۆلێژی یاسای لە1980 لە بەغداد تەواو کردوە
- سکرتێری رۆژنامەی ستایل بووە کە رۆژنامەیەکی ئەدەبی و فیکری بووە
- سکرتێری گۆڤاری کاروان بووە -خولی راپەرین

دیوانی شیعری چاپکراو

---------------

1- خاك و هەڵۆ ، شیعر ، بەغدا 1980 دەزگای رۆشنبیری وبڵاو کردنەوەی کوردی ، 50 لاپەڕە

2- تەمە سپییەکانی رۆح ، شیعر ، هەولێر1988 ئەمانەتی گشتی رۆشنبیری ولاوان 68 لاپەڕە

3- وورده گەڵا - 1989 سلێمانی

4-پیانۆی روژهەڵات ، 2000 ، شیعر، هەولێر چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری هەولێر 186 لاپەڕە

5 - درەختی حیکمەت , 2002، هەولێر چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری هەولێر 109لاپەڕە

6 - دۆستێ هەمیشە چاوەڕوانمانە 2004 شیعر، هەولێر ، بڵاوکراوەی بزاڤی رۆشنبیرانی نوێخواز 98 لاپەڕە

7- پیانۆی رۆژهەڵات - 2004 کۆی بەرهەمەکان شەش دیوانی شیعر دەزگای ئاراس هەولێر - 415 لاپەڕ

8 - بورجی بەڵەك 2006 بڵاوکراوەی گۆڤاری ئاینده- سەردەم 113

لاپەڕە

9- سیفری ئاگر ، شیعر ، کەرکوك 2007 یەکیەتی نوسەرانی کورد لقی کەرکوك

10- کتێبی پیرۆزی عاشقان ، شیعر، هەولێر 2007 دەزگای ئاراس هەولێر 264 لاپەڕە

11 - تۆ لە هەموو شوێنێکی تۆ 2010 دەزگای پاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی 215 لاپەڕە

12 - کتێبی ئاو 2009 دەزگای موزیك و کەلەپوری کوردی هەولێر 144 لاپەڕە

13 - کتێبی نەی 2009 دوزگای مۆزیك و کەلەپوری کوردی هەولێر 199 لاپەڕە

14 - 15 - درەختی درەوشاوە 2011 سەنتەری لیکۆڵینەوەی فیکری نما هەولێر 126 لاپەڕە

15 - درەختی خامۆشی 2011 سەنتەری لێکۆڵینەوەی فیکری نما 142 لاپەڕە

16- سکڵی ناو خۆڵەمێش 2012 لە بڵاوکراوەکانی سەنتەری رۆشنبیی ڕێژیار- هەولێر 96 لاپەڕە

17- دیوانی کەریم دەشتی 3 بەرگ - کۆشیعر - لە بڵاوکراوەکانی مەڵبەندی گشتی یەکیەتی نووسەرانی کورد- هەولێر - بەرگی 379 لاپەڕە- بەرگی دووەم 440 لاپەڕە - یەرگی سێیەم 245 لاپەڕە .

18- بەرز بەرز تا قووڵایی - شیعر - 2014 دەزگای موکریان، 142 لاپەڕە.

19 - دیوانی ئەفیونی من - دەزگای موکریان 2019

نوڤلێت

1 - کەمتیار , نوفلیت , سلێمانی 1999 بنکەی گەلاوێژ سلێمانی 71 لاپەڕە

2- قیامەت, نۆڤلێت , هەولێر 2002 گۆڤاری یەکیەتی نووسەران لقی هەولێر- بەشێکە لە رۆمانی بولیفاری نەی

3- ئەسپەکانی ناو با, نۆڤلێت 2008 دەزگای ئاراس 112 لاپەڕە - بەشێکە لە رومانی بولیفاری نەی

4 - بولیفاری نەی - رۆمان - بەرێوەبەرێتی چالاکی وێژەیی - 2014 -

وەرگێڕان :

1-رۆمانی رەگەکان - ئەلکسی هیلی , لە فارسییەوە 2005 دەزگای موکریان هەولێر 887 لاپەڕە

2-رۆمانی دوا وەسوەسەی کریست , کازانتزاکی , لە فارسییەوە 2006 دەزگای موکریان هەولێر 611 لاپەڕە

3- رۆمانی سەفەرێ بۆ رۆژهەلات 2002 , هیرمان هیسە , سەنتەری نما ، لە عەرەبییەوە 76 لاپەڕە

4-کۆمەڵە چیرۆکی ,کتێب 1999, لە فارسییەوە , کۆمەڵێ نووسەر دەزگای سەردەم سلێمانی91 لاپەڕە

5-لورەی گورگ , رۆمان , جاك لەندەن, لە فارسییەو2006 دەزگای وەرگێڕان هەولێر 155 لاپەڕە

6- رامبو - وەرگێڕان لە عەرەبییەوە - وەرزێ لە دۆزەخ - 2007 دەزگای سەردەم سلێمانی 70 لاپەڕە

7 - داستانی فیردەوسی ونبوو - جون میلتون - ناوەندی ئاوێر 2020

ئەزموونی ئەدەبی:

1 - بەرەو منداڵی بە جلی پایزەوە , بناغەو ئەزمونی شیعر

2007دەزگای ئاراس هەولێر 183 لاپەڕە

2 - گەڵا رژاوەکانی ئەزموون - کتێبی گیرفان - وەزارەتی رۆشنبیری2006 هەولێر

3 - دیدو دیدگا - دەزگای موکریان ، بیروبۆچوونی ئەدەبی و رۆشنبیری 221لاپەڕە

4 - ئەدەب و فەلسەفە, لیکۆڵینەوە, نووسین و وەرگێران 2005 چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیریی - هەولێر - بڵاو کراوەی کتێبخانەی سۆران 527 لاپەڕە.

5 -ئەدەب و فەلسەفە - چاپی دووەم - دەزگای نما - هەولیر - 415 لاپەڕە

6 - دید و دیدگا - دەزگای موکریان - کۆمەڵە وتارو دیمانەکانم - هەولێر 222 لاپەڕە

ئەوانەی کراونەتە عەرەبی و ئینگلیزی:

---------------

1- کتاب الماء وەرگێڕانی بۆ عەرەبی محمد حوسێن دەزگای چاپ و بەخشی کوردی بەغداد 2010

2 - هادئە کالکناری وەرگێڕانی بۆ عەرەبی کۆمەڵێ نووسەر

3 -The book of water وەرگێڕانی بۆ ئینگلیزی محمد حوسێن رەسول

4 - دیوانی سکڵی ناو خۆڵەمێش بە سویدی - وەرگێڕانی رزگار شیخانی- لە سوید چاپ بووە 2012

5 - دیوانی تۆ هەمیشە تۆ بە سویدی - وەرگێڕانی رزگار شیخانی- لە سوید چاپ بووە 2013

6- عالیا عالیا الی الاعماق - دیوانی بەرز بەرز تا قووڵایی- وەرگێڕانی محمد حسین رهسوڵ

7- جذوە الرماد وەرگێڕانی بۆ عەرەبی نیهاد النجار

8-أخگر- سکڵڵی ناو خۆڵەمێش وەرگێڕانی بۆ فارسی حسین شریفی

# پێرست

